لەبڵاوکراوەکانی دەزگاری راگەیاندنی (ستاندەر)

# • ئافرەت لە نێوان توندڕەوی ئایینی و سەرەڕۆیی فێمنستی

• نووسینی : **محەمەد هەریرک**
• پێداچونەوەی: **ئارک عەبدوڵڵا**
• نەخشەسازی : **مستەفا ئیحسان عەبدوڵڵا**
• ساڵی چاپی ئەلیکترۆنی: **٢٠١٥ - چاپ یەکەم - هەولێر**

زنجیرەی کتێب (١٨)




دەزگای راگەیاندنی ستاندەر

٢٠١٥

ماڵپەڕ: www.skurd.net
ئیمەیڵ: info@skurd.net

# پێشەکی

ئافرەت لە کۆمەڵگە ڕۆژهەڵاتییەکاندا، وەکو ڕەگەزێکی نامۆ سەیر دەکرێت، لەژێر جەورو ستەمێکی ماوە درێژ دایە، بەردەوامشبووە، مافەکانی ئافرەت لەو جوغزە داخرەوە ڕواڵەتییە دەربازی نەبووە، خۆیلەخۆیدا تێڕوانینی هەڵەی کۆمەڵگا لە ناودێرکردنی پرسی ئافرەت، بە "کێشەی ئافرەت" زوڵمێکە دەرهەق بە ڕەگەزی مێ دەکرێت، چونکە لە هەقیقەتدا ئافرەت کێشە نییە، تاکو مافەکانی بەکێشە لێکبدرێتەوە، بەڵکو ئەوە هەڵەی چینەکانی تری کۆمەڵگایە، کە بەو چاوە سەیری ئافرەت دەکەن. زۆر جارانیش لە بەریەککەوتنی توندڕۆیی ئایینی و سەرەرۆیی فێمنستەکان مافەکانی ئافرەت وون دەبێت. ئەوە چیرۆکی سەرەکی ئەو کتێبەی بەردەستتە.

چیرۆکی توندڕەوەکان لەگەڵ ئافرەتدا زۆر سەیرە، جاروبار پێکەنین هێنەرە، جاروباریش خەم و پێکەنین بەیەکەوە کۆدەکاتەوە. دژایەتی ئەو توندڕەوانە بەناوی ئاین بۆ ڕەگەزی مێ شورەییە، گەورەترین خیانەتە بە ئاین دەیکەن.

نەیاری بە ئافرەت ڕەگی هێندە قوڵە لە ناو توراس و سەرچاوەکانی ئیسلامدا وەك (حەدیس و مەسایلی فیقە و تەفسیر) دەگاتە ڕادەی سوکایەتی. زۆرمان خوارد لەو نوسینانەی کە سەرتاسەری گوڵباران کردنی هەڵوێستەکانی ئیسلامە بەرامبەر ئافرەت، کەچی لە واقیعدا وێنەکە زۆر دوورە لەو هیوایە سەوزو پەمەییانەی هەندێک لە نووسەران لەسەر کاغەز دەینەخشێنن. کەسانێك هەن ئافرەت لە مافەکانیان بێ بەش دەکەن، بە بەکارهێنانی فەرمودەگەلێك، کە هەندێکیان هەڵبەستراویشن بۆ پێشێلکردنی مافەکانی ئافرەت و دابەزینی ڕیزی.

ڕاستە لە کوردستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی ئافرەت جەورو ستەمێکی زۆری لێدەکرێت، کەس ناتوانێت نکوڵی لێبکات، کەچی

فێمنستەکان لە ژێر کاریگەری فێمینزمی خۆرئاوایی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو جەورو ستەمانەی لەسەر ئافرەت سەپێندراون، بە هەمان بیرو ئامڕازی ئەوانیان لە توندڕۆیی بەکارهێنان، لەبەر نەشارەزاییان لە دواندنی کۆمەڵگای کوردی سەرکەوتوو نەبوون. دوای کرانەوەی کۆمەڵگەی کوردی بەڕووی دنیا، بەتایبەتی دوای ساڵی ٢٠٠٣ دا فێمێنستەکانی کورد هەڵپەی بازدانێکی خێریان دەکرد، کە هەڤدژبوو بە ئاین و کەلتور و بەها جوانەکانی کۆمەڵگای کوردەواری، نەیانتوانی هەقیقەتی مافەکانی ئافرەت دەستەبەربکەن، هەر لە بازنەیەکی داخراو دەخولانەوە، سەنتەری داواکارییەکانیان خستبووە سەر هەندێك مافی رووکەشی خاڵیکراو لە گرنگ و گەورەیی ئافرەت.

ئەو دۆزە گرنگەی کۆمەڵگا پێویستی بە ئافرەتانێک هەیە، کە پەنجە بخەنە سەر زامە هەقیقیەکان، نەک لە یەکەم وشەدا، بڵێن دەبێت ئافرەت ئازاد بێت لە بەکارهێنانی جەستەی، چۆنی بەکاردەهێنێت هەقی خۆیەتی، وەك هەریری گوتەنی، بۆ چما لە کلتوری ئێمەو دەوروبەرمان، پیاویش خاوەنی ڕەهای لاشەی خۆیەتی تا ئافرەت خاوەنی بێت.

خوێنەری ئازیز ئەو کتێبەی بەردەستت، کۆششی ماوەی زیاتر لە (١٣) ساڵ دەبێـت، چونکە کۆی توێژینەوەو وتارەکانی مامۆستایە، لە سەر پرسی ئافرەتان نووسیویەتی، کە لەنێوان ساڵانی (٢٠٠٢ - ٢٠١٥) لە زۆربەی گۆڤارو رۆژنامەو ماڵپەرەکان بڵاوکراوەتەوە. لەسەر پێشنیاری چەندین هاوسۆزو هاوخەمی ئەو پرسە، بە باش زانرا لە دووتوێی کتێبێك کۆبکرێتەوە، دووبارە بخرێتەوە بەر دیدی خوێنەرانی کورد، لێرەدا پێویستە ئەوە لای خوێنەر روونبێت، کە رەچاوی ریزبەندی درێژی ماوە زەمانیەکەی دروستبوونی ئەو کتێبە بکات، ئاساییە، بەتێپەڕبوونی قۆناغە مێژووییەکان گۆڕانی فکری لای مرۆڤ دروست ببێت. هەربۆیە کێتبی (توندڕەوی ئایینی و سەرەڕۆیی فێمنستی لەسەر ئافرەت) بیروڕاکان لە نێوان ساڵانی (٢٠٠٢ - ٢٠١٥) دەگرێتە خۆ، بێگومان دەبێت ڕەچاوی مێژووی وتارەکان بکرێت لە کاتی خوێندنەوەیدا.

جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە حەقیقەتە بکەم، مامۆستا "محەمەد هەریری" زۆر پێش ئەو مێژووەش لەو بوارە هەڵوەستەی کردووە، دەیان نووسین و هەوڵی هەبوە بۆ بەرچاو روونکردنەوەی دەوروبەرەکەی، لابردنی ئەو ستەمانەی لە ئافرەت دەکرێت، بەتایبەتی لە سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی رابردوو، وەکو خەمخۆرێك چ لە نوسین چ وەك چالاکوانێك، هەنگاوی کردەیی لە بواری مافەکانی ئافرەت ناوە، بەراشکاوانە دەتوانیم بڵێم ئەگەر یەکەم کەس نەبووبێت لە ناو گۆڕەپانی ئیسلامیدا لە باشووری کوردستان، کە باسی مافی ئافرەتی وروژاندوە ئەوە لە یەکەمەکانە، لەبەر کارکردنی لەسەر ئەو ڕێچکەیە، نووسەر لە نەوەتەکان زۆرێك لە توندڕەوەکان دژایەتییان دەکرد، لە ساڵی ١٩٩٣ لە ڕۆژنامەی (ڕابوون) بابەتێکی بە ناوی "ئاگاداری ئەو فەرمودە هەڵبەستراوانە بن" بڵاودەکاتەوە، کە باسی پێنج حەدیسی دژ بە ژنی کرد بوو، وەریشیگێڕابوو، کە وەك حدیسی موضوع بوون، هەروەها یەکەم کەس بووە کە زاراوەی هەڵبەستراوی بۆ حەدیسی موضوع بەکارهێناوە، حەدیسی موضوع یان هەڵبەستراو: بەو حەدیسانە دەگووترێت کە بە دەمی پێغەمبەر گوتراون، زانایانی ئەهلی حەدیسیش باوەڕیان بەڕاستی ئەو قسانەو دانە پاڵ پێغەمبەر نییە. ئەو حەدیسانەی کە کۆی کردبونەوە، ڕاستە ئەلبانی و زانایانی تری ئەهلی حەدیسیش دەڵێن هەڵبەستراوە، هەروەها مامۆستا محەمەد هەریری دەڵێت:" بینیم ئەو حەدیسانە، زۆر سەیر بە ناخی کۆمەڵگای کوردی و کۆمەڵگا ئیسلامیەکانی تر شۆڕ بۆتەوە، لە زۆر لە داب و نەریت، قسەی نەستەق و پەندی پێشینان دا خۆی گوزارش دەکات. نەك ئەوە سەرنجم دا هەندێك لە هەڵوێستەکانی ئەو دیندارانە، هەتا سەلەفیەکانیش دەربارەی ئافرەت، لە ژێر کاریگەری ئەو حەدیسە هەڵبەستراوانە دروست بوون". هەربۆیە سەلەفیەکانی ئەو وەختە بەو لێکۆڵینەوە توڕەو دڕودۆنگ ببوون.

هەروەها لە ناوەڕاستی نەوەتەکاندا کتێبەکانی محمد الغزالی دەربارەی ئافرەت وەك وانەو دەرس بە زۆر برایان و خوشکانیش دەگوتەوە. بەتایبەتی کتێبەکانی (المرأة بين تقاليد الراكدة والوافدة ) و (السنة التبوية بين اهل الفقه و اهل الحديث)، کەچی سەلەفیەکانی ئەوسا کتێبەکانی "محمد

**الغزالی"یان لە کتێبخانەکان دەشاردەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەو کتێبانەی غەزالی، مامۆستا لەسەر ئەرکی خۆی هەڵدەستێت بە کۆپیکردن و بڵاوکردنەوەیان. هەروەها لە ساڵی ١٩٩٥ نامیلکەیەك لەسەر "نوال السعداوی" دەنوسێت.**

**کتێبی "ئافرەت لە نێوان توندڕەوی ئایینی و سەرەڕۆیی فێمنستی" لە دوو بەشی سەرەکی پێکدێت، بەشی یەکەم لەژێر ناونیشانی ئافرەت و سەرەڕۆیی فێمینستەکان، سێ تەوەر لە خۆدەگرێت، لە بەشی دووەم، تیشکخراوەتە سەر مافی ئافرەت و توندڕەوی و گوتاری ئایینی، ئەو بەشەش لە سێ تەوەری پێکهاتووە.**

**ئـاری عەبـدوڵڵا**

٢٠١٥/٥/٥

# ئافرەت و سەرەڕۆیی فێمینستەکان

## بەشی یەکەم

### تەوەری یەکەم: ئافرەت و زیادڕەوی فێمینستەکان

فێمینیزمی ڕادیکاڵ
فێمینیزمی لێسبیانیز
فێمینیزمی شیکردنەوەی دەروونی
فێمینیزمی مارکسیسیزمی
هیچ کۆتاییەک نیە بۆ زیادڕەوی فێمینستەکان
فێمن FEMEN و خۆ ڕوتکردنەوە وەك نارەزایی دەربڕین
جیهادی تۆپلێس
لە یادی ٨ی مارس دا بەڕاستی ئێوەش ناخۆشتان کردوە
پیرۆزبایی ٨ مارس و هیواکانم بۆ ئافرەتان
شەپۆلی دووەمی فێمینزم
مافەکانی ئافرەت دوور لە تیۆرەکانی فێمنیزمی رادیکالی
ئەنتی فێمنیزم و پرۆ فێمینیزم
ئەکادیمیەت و فێمینزم
نیشتیمان پەروەری لە تەرازووی فێمینزمی کۆلۆنیالیزمیدا
فێمینیست و ترسێکی بەجێ

### تەوەری دووەم: نەوال سەعداوی و فێمینستەکانی کورد

#### ١- نەوال سەعداوی و فێمینستەکانی کورد

کێشەی نەوال سەعداوی و قەدەری بایۆلۆژی خۆی
نەوال سەعداوی و هەڵوێستی لە ڕژێمی صدام و کورد
سەردانی نەوال سەعداوی بۆ کوردستان و جاك درێدا بۆ میسر

#### ٢- ئافرەتی کورد و کێشەکانی شووکردن

ئافرەتی کورد و کێشەکانی شووکردن بە ناکورد
یەکەم لێزبیانی کورد لە پێشوازینامەیەکی منداڵکارانە
مژدێن و ئەزموونی کوردی

## تەوەری سێیەم: کلتوری ئافرەت کوشتن

## تەوەری یەکەم: ئافرەت و زیادڕەوی فێمینستەکان

## بزوتنەوەی فێمنستی

- هیچ کۆتاییەک نیە بۆ زیادڕەوی فێمینستەکان
- فێمینیست و ترسێکی بەجێ
- فێمینیزمی ڕادیکاڵ
- فێمینیزمی لێسبیانیز
- فێمینیزمی شیکردنەوەی دەروونی
- فێمینیزمی مارکسیسیزمی
- فێمن FEMEN و خۆ ڕوتکردنەوە وەك نارەزایی دەربڕین
- جیهادی تۆپلێس
- لە یادی ٨ی مارس دا بەڕاستی ئێوەش ناخۆشتان کردوە
- پیرۆزبایی ٨ مارس و هیواکانم بۆ ئافرەتان
- شەپۆلی دووەمی فێمینزم
- مافەکانی ئافرەت دوور لە تیۆرەکانی فێمنیزمی رادیکالی
- ئەنتی فێمنیزم و پرۆ فێمینیزم
- ئەکادیمیەت و فێمینزم
- نیشتیمان پەروەری لە تەرازووی فێمینزمی کۆلۆنیالیزمیدا

# بزوتنەوەی فێمنستی

## هیچ کۆتاییەک نیە بۆ زیادڕەوی فێمینستەکان

بزوتنەوەی فێمنستی لە ڕۆژئاوا کە دەستی پێکرد، کاردانەوە بوو بۆ چەوساندنەوەو کەبتــکردن و نکوڵی کردن لە مافەکانی و کەسایەتی لە کۆمەڵگایەکانی ڕۆژئاوا، لەو مافانەش مافی موڵـکایەتی و مافی سیاسی لە هەڵبژاردن و خۆ کاندید کردن و یەکسانی لە کرێی کار و چەندین مافی تر.

یەکەم هاواری مافەکانی ئافرەت لە بەریتانیا، یان وردتر لە ئینگتەرا دەرچوو ئەویش بە دەرچوونی کتێبی **A Vindication of the Rights of Woman** (ڕەوایی مافەکانی ئافرەت) لەلایەن ماری ولستنکرافت **Mary Wollstonecraft** لە ساڵی ١٧٩٢ لەو کتێبە دەکرێت سەرنج بدەیت وەک نووسەری بەناوبانگی بواری توێژینەوەکانی فێمینیزم جۆن جونسون لویز **Jone Johnson Lewis** دەڵێت:"ماری ولستنکرافت جیاوازی نەدەکرد لە نێوان مەجالی ماڵەوەو دەرەوەو لای ئەو ماڵەوەو ناوەوە جیا نەبوون، بەڵکو پێکەوە لکاوبوون. لای ئەو ماڵەوە گرنگ بوو چونکە بنچینەی ژیانی کۆمەڵایەتی بنیات دەکات، لای ئەو پیاوانیش ئەرک و کاریان هەیە لە ماڵەوە وەک چۆن ژنانیش ئەرک و کاریان دەبێت هەبێت لە دەرەوە واتە لە ژیانی گشتیدا".

گرنگترینی ئەو مافانەی کە لەو کتێبە کە بە ئینجیلی کلاسیکی بزوتنەوەی فێمینیزم دادەنرێت، داواکاردنی خوێندەواری بوو بۆ ئافرەتان، چونکە ئەوان نەوەی داهاتوو پەروەردە دەکەن، پێویستە پەروەردەیەکی نەزانانەیان نەکەن، چونکە خوێندەواری و ڕۆشنبیری ئافرەت کەسایەتی و پەیوەندی زەواج و هاوژیانی بە هێزتر دەکات.

ماری ولستنکرافت هەتا لە ڕەخنەکانیشی زۆر ماقوڵ بوو وەک ڕەخنە گرتنی لە (ژان جاک روسو) کە یەکێکە لەو بەراییانەی بەرگریان لە مافەکانی تاکە کەسی مرۆڤ کردوە، بەڵام پێی وابوو ئافرەت لە ڕووی عەقڵیەوە زەبوونن، یان ناقسی عەقڵن وەک چۆن ئەو بوختانەیان بە دەمی پێغەمبەری

ئیسلامیش (د.خ) هەڵبەستوەو هەزار پینەو پەڕۆی بۆ دەکەن و بەڵکو تەقدیسی دەکەن گوایە حەدیسە، یەکێک لەو زانایانەی کە بە ژمارەی هەسارەکانن زاتی ئەوەیان نەکرد بڵێن ئەوە قسەی پێغەمبەر نییە، بەڵکو بەرهەمی عەقڵیەتی نێرسالارانە دوکەوتوانەی جاهیلیەتی عەرەبیە.

لە پاش ماری ولستنکرافت زۆربەی ئەو کتێب و نوسراوانەی دەردەچوون لە ژێر کاریگەری ئەودا بوون، نووسەرو بیرمەندێکی زۆریش هەتا لە پیاوان پشتگیریان لە داواکانی دەکرد لەوانە : جون ستیوارت میل و سۆشیالستی بە ناوبانگ هاردی و چەندینی تر، هێندە نەبرد ئافرەتان لە بەریتانیا مافی موڵـکداری و سیاسی خۆیان وەرگرت. لە پاش شەڕی جیهانی دووەم، لەبەر بەشداری بەرچاوی ئافرەت لە هەموو بوارەکان بۆ پڕکردنەوەی غیابی پیاوەکان، ئافرەتان توانیان کرێی یەکسان بۆ خۆیان زامن بکەن لە ڕووی یاساییەوە، هەرچەندە لە واقیعدا هێشتا جیاوازی لە نێوان کرێی پیاو ئافرەت تا ئەمڕۆش بەدی دەکرێت.

بەڵام ڕەوتی داواکان لە پاش جەنگی جیهانی دووەم زۆر خێراو زەبەلاح و نامۆ بوون. لە جیاتی ئەوەی پاش گەیشتنی ئافرەت بە هەموو مافەکانی بوەستن، زیاتر بایەخ بە خۆیان و دامەزراندنی مافەکانیان بدەن، کەچی بزوتنەوە فێمینیستەکان بەوەندە نەوەستان، دەستیان کردە گەڕان بە دوای کون و قوژبن و بیانو بۆ دۆزینەوەی هەر شتێک بۆ ئەوەی کێشەیەکی لێدروست بکەن. هەر شتێک پیاو بیکات دەبێ ئەوانیش بیکەن بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ مەنتقێک یان هیچ جیاوازیەکی بایۆلۆژی. ئەگەر پیاو عەسکەری دەکەن دەبێت ئەوانیش بیکەن، دەڵێن کاتی خۆی ئیسرائیل کچە شۆخ و شەنگەکانی دەنارده بەری پێشەوەی جەنگ، بەڵام سەرنجیان دا لەشکری عەرەب زۆر بە حەماسەتەوە دەجەنگان بۆ دەستگیر کردنی چەند کەنیزەیەکی ئیسرائیلی.

ئەگەر پیاو بۆکسێن و زۆرانێ دەکەن، بۆ ئەوانیش ئێسکی خۆیان سوک نەکەن و نەیکەن، ئەگەر پیاو تۆپی پێ دەکەن ئەوانیش کردیان. ئینجا بەرەو

دژایەتی هەنگاویان نا بە ڕابەرایەتی گێرمین گریر Germaine Greer کە کتێبێکی نووسی بەناوی (مێینەی خەسێنراو) The Female Eunuch.

لەو کتێبەدا کە لە ناونیشانەکەیەوە ناوەرۆکیت بۆ ساغ دەبێتەوە، گێرمین گریر دەڵێت:"ئافرەت نازانێت پیاو چەندە ڕقی لێیەتی و، چەندە فێردەکرێن بۆ ئەوەی ڕقیان لە خۆیان بێتەوە.." ئەو کتێبە جاڕدانی شەڕێکی بێ مانای بێ پاکانە بوو لە نێوان ئافرەتان و پیاوان تا ڕادەی ئەوەی نووسەرێکی ئافرەتی ئەو بوارەی وەک کریستیان واڵسChristine Wallace دەڵێت:" کاتێ کتێبی (مێینەی خەسێنراو) The Female Eunuch بۆ یەکەم جار چاپکرا، دەبوایە ئافرەتان لە ناو بەرگی قاوەیی بیپێچن چونکە پیاوەکانیان نەیاندەدەهێشت بیخوێننەوە. شەڕو هەرا لەسەر مێزی نانخواردن لە نێوان ئافرەت و پیاو بڵاوبوەوە، دانەیەکی زۆری ئەو کتێبە لە ژوورەکانەوە لەلایەن ئافرەتانەوە هەڵدڕانە سەروچاوی پیاوە بێ ئاگایەکان".

بیرۆکەی سەرەکی ئەو کتێبە ئەوە بوو کە خێزانی ناوەکیnuclear family (چەمکێکە سۆسیۆلۆژەکان مەبەستیان لەو خێزانەیە کە لە باوک و دایک و منداڵەکان پێک دێت، واتە خێزانی ئاسایی) ژینگەیەکی خراپە بۆ ئافرەتان و بۆ بەخێوکردنی منداڵان، واتە لەناو بردنی خێزانی ئاسایی یەکێک بوو لە ئامانجە سەرەکیەکانی، هەڵمەتێکی سەرتاسەر بوو بۆ سەر پیاو و نێرایەتی و داوای دەکرد ئافرەت پێویستە (ئیکتیفای زاتی) هەبێت دوور لە پیاو. هەر بۆیەش گێرمین هاوڕەگەزباز Lesbian بوو. لەگەڵ هاتنە ناوەوەی ئەو باڵە لێزبیانە سەرەڕۆیە بۆ ناو گۆڕەپانی خەباتی ئافرەتان هەموو خەباتەکەی ئافرەتانی ڤایرۆساوی کرد بە ڤایرۆسی لێزبیانەتی و دژایەتی کردنی پیاو چەمکی نێرایەتی.

ئەگەر ئەو جۆرە فێمینیزمە سەرەڕۆیە لە ژیاری ڕۆژئاواو لە ژینگەی تەکنۆلۆژی و فیکری و بەهایی ئەوان جێی ببێتەوە، کە من دەزانم تا ئێستا چەندە مەکروهە لای خەڵک، هەتا لای ئافرەتانیش، چۆن بوونی ئەو جۆرە فێمینیزمە لە کوردستان پاکانەی دەبێت؟ کوردستان و ڕۆژهەڵات بەگشتی جەورو ستەمێکی زۆری لێدەکرێت لە دژی ئافرەتان، بەڵام پێویستی بە ئافرەتانێک هەیە پەنجە بخەنە سەر زامە هەقیقیەکان نەک لە یەکەم وشەدا

بڵێن دەبێت ئافرەت ئازاد بێت و خاوەنی لاشەی خۆی بێت و چۆنی بەکاردەهێنێت هەقی خۆیەتی. بۆ چما لەو وڵاتانەی ئێمە پیاویش خاوەنی ڕەهای لاشەی خۆیەتی؟ پێویستمان بە ڕەوتی ماری ولستنکرافت Mary Wollstonecraft نەک گێرمین گریر Germaine Greer.

# فێمینیست و ترسێکی بەجێ[١]

دەمێکە لە خوێندنەوەم بۆ وتارەکەی (مەهاباد قەرەداغی) لەژێر ناونیشانی (فێمینیست پیاوخۆر نییە)[٢]. چاوەڕوانی ئەوە بووم یەکێک لەو ژمارە زۆرەی سڵ لەو زاراوەیەی ( فێمینیزم ) دەکەنەوە کە مەهاباد خان لە نوسینەکەی ئاماژەیان پێ دەکات وەلامێک یان بەلانی کەمەوە رونکردنەوەیەکی بۆ بنووسن.

بەڵام لەوانەیە هێشتا رۆشنبیری کورد، وەک پیاوی ئاسایی کۆمەڵگەکەمان، پێی جوان نەبێت وەڵامی ئافرەتێک بداتەوە، هەرچیش بڵێت، لەگەڵ ئەو پەڕی ریزم بۆ مەهاباد خان.

پوختەی ناوەرۆکی نووسینەکەی مەهاباد خان، ڕەخنەیە لە پیاو، تەنانەت ژنانێکیش کە لە زاراوەی فێمنیست و فێمینیزم سڵ دەکەنەوە، نێگەتیڤانە بۆی دەڕوانن، هەندێک لەوانە روناکبیرو نووسەریشن.

"هەتا ژنانی داکۆکیکاریش لە مافەکانی ئافرەت خۆیان لەو زاراوەیە دوور دەگرن، وپێیان وایە کە ئەوان داکۆکیکاری مافەکانی ژنن، بەڵام فێمنیست نین"

لێرەدا پرسیارێک سەری قوت دەکاتەوە : بڵێی ئەو هەموو پیاو و ژنە لە فێمنیست تێنەگەیشتبن جگە لە مەهاباد خان. بڵێی ئەو هەموو ترس و سڵەمینەوەیە مەشروع نەبێت. بەر لە کۆتایی نوسینەکەی دەڵێت:"بەڵێ هێژایان من فێمنیستم. فێمنیست ئەو کەسەیە کە داکۆکی لە مافی ژن دەکات و منیش داکۆکی لە مافی ژن دەکەم".

---

(١) ٢٠٠٣/١/٧ .

(٢) وتارەی (فێمینیست پیاوخۆر نییە) نوسینی (مەهاباد قەرەداغی) ، کوردستان نێت، ٢٠٠٢/١٢/٢ .

هەردەم مەهاباد خان، لە نوسینەکانی لەمەڕ فێمینیزم، بەو شێوەیە سادەیە پێناسەی زاراوەی فێمینیزم دەکات. لە نوسینێکی تریشی هەڵەیەکی کوشندەتر دەکات، کە ئەویش تێکەڵ و پێکەڵکردنی فێمنیست و فێمینیزمە بە women's liberation movement واتە : (بزاڤی ئازادیخوازی ئافرەتان) کاتێک زۆر بوێرانەو باوەڕ بەخۆیانە دەڵێت:

"فێمینیزم وەک دەستەواژە، مانا ئاساییەکەی ( مافەکانی ژن و یەکسانی نێوان ژن و پیاوە)" لەبری دەستەواژەی womenism بەکاردەبرێت، هەروەها لە جێگەی woman's movement بەکارهێنراوە "

## بابێینە سەر ئەسڵی داواکان

پێشەکی پێویستە بڵێین ترس و سڵەمینەوە لە فێمینیزم لەلایەن ئەو کەسانەی خۆت باسیان دەکەیت، بێگومان ترسێکی بەجێیە، تایبەتیش نییە بەنێوەندی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کوردی، بەڵکو ئەو دیاردەیە زۆر بەڕاشکاوی هەستی پێدەکرێت لە ئەوروپای رۆژئاواش، من خۆم سەرنجی ئەوەم داوە لە کاتی خوێندنم لە بەریتانیا چۆن کچان خۆیان لەو فێمنیستانە دەبوێرن وەک بڵێی توشی پەتایەک بووبن.

ئەوە سەرەڕای پەلار لێدان و دەربڕینی نارەزایی بۆ بیروبۆچونیان لەکاتی گفتوگۆدا. لەوانەیە بڵێن ئەو کچانە کەوتونەتە ژێر پروپاگەندەی ئیمپریالیزم.

بەڵام هەر ئەو کچانە بەرگری لە مافەکانی خۆیان دەکەن بەو پەڕی بوێریەوە، چونکە ئەوانیش سنوری نێوان فێمینیزم و (بزاڤی ئازادیخوازی ئافرەتان) دەزانن، ئەو سنورەی کە لەلای مەهاباد خان بۆتە وەهمی، سەرکۆنەی خەڵکیش دەکات لەبەر نەبەزاندنی ئەو تخوبانە.

خەڵکانێکی تریش، جگە لە مەهاباد خان، هەر وادەزانن ئەو دوو زاراوەیە هاوواتان، فێمینیزم وەک زاراوەیەکی نوێ شوێنی زاراوە کۆنەکەی گرتۆتەوە، کە هەمان مانا کۆنەکەی هەیە، بەڵام فێمینیزم هەمەلایەنتر و

ڕادیکاڵیترە، کەچی لە ڕاستیدا، ئەو دوو زاراوە بە تەواوی لە یەک جیان، لە رووی تیۆری و پراکتیکەوە، هەروەک لەو نووسینە باسیان دەکەین.

مرۆڤ لە جیهانبینی (بزاڤی ئازادیخوازی ئافرەتان) قەوارەیەکی ژیاری سەربەخۆو جیابوو لە جیهانی سروشت و ماددە، بوونی نەبووە تەنها لەناو کۆمەڵ نەبێت، بۆیە ناکرێت یەکسان بکرێت بە دیاردە سروشتی و ماددیەکان. بۆیە (بزاڤی ئازادیخوازی ئافرەتان) هەوڵی دەدا بۆ وەدیهێنانی دادپەروەریەکی حەقیقی و لۆژیکی لەناو کۆمەڵدا:

**-وەك یەكسانی لەبەردەم یاسادا.**

**-یەكسانی لەوەرگرتنی كرێ.**

**-یەكسانی لە مافە سیاسیەكان وەك : مافی خۆ كاندید كردن و دەنگدان و بەشداری كردن لە حوكم.**

**-داوا كردنی مافە كۆمەڵایەتیەكان وەك مافی خۆ تەڵاقدان و دایەنی كردنی منداڵ...هتد.**

کەوابوو چوارچێوەی مەرجەعیەتی سەرەکی (بزاڤی ئازادیخوازی ئافرەتان) تێڕوانینێکی مرۆڤایەتییە، کە سنورێک دادەنێت لە نێوان مرۆڤ و سروشت، بۆیە ئەو بزاڤە، باوەڕی بەزۆر لە چەمکە جێگیرە مرۆییەکانی، پەیوەست بەرۆڵی ئافرەت لە کۆمەڵدا هەیە، کە گرینگترینیان رۆڵێتی وەکو دایک و، گرنگی خێزان وەک دەزگایەکی سروشتی بۆ هێنانەدی ناوەرۆکی مرۆیی خۆیان، شورایەک بۆ پاراستنی ناسنامەی ژیاری و ڕەوشتی، بەرز نرخاندنی رۆڵی ئافرەت وەک بڕبڕەی پشتی ئەو دەزگایە.

بەو جۆرە (بزاڤی ئازادیخوازی ئافرەتان) پێی دانەگرت لەسەر داواکاری ناماقوڵ و ناواقیعیانەی کە قابیلی پیادەکردن نەبن، هەڵنەدێرا بۆ گۆرەپانی ئەزموونی بێ بڕانەوەو دوور لە هەموو سنوورێکی مرۆیی ومێژوویی و ڕەوشتی.

ئەوە بوو بەکورتی چوارچێوەی مەعریفی و ژیاری بزاڤی ئازادیخوازی ئافرەتان.

پاش بازدانی ژیاری رۆژئاوا لە خانەی هیومانیزم بەرەو میکانیزمی ماددی، پێداگرتن لەسەر بەها ماددیەکان لەسەر حیسابی بەها مرۆیی و مەعنەویەکان، بایەخدان بە کاری بەرهەمهێنانی دەرەکی (بەرهەمی ماددی)، لەسەر حیسابی بەرهەمهێنانی ناوەکی (بەرهەمهێنانی مرۆڤی دروست)، پشت لێکردن لە هەموو ئەو بەهایانەی کە مرۆڤایەتی لەوەتی هەیە کۆکن لەسەر ڕێزلێگرتن و پیادەکردن و پاراستنیان.

فێمنیزمیش گوزارشێکی سروشتی ئەو وەرچەرخانە بوو کە لە ژیاری خۆرئاوا ڕوویدا.

بۆیە فێمینیزم هەردەم پێ دادەگرێت لەسەر بیرۆکەی ئەو جیاوازیە قوڵانەی لە نێوان پیاو و ئافرەت هەن، لە تێڕوانینێکی کێشە ئامێزو دووانەوە سەرچاوە دەگرێت :(من و ئەویتر)، وەک بڵێی هیچ مەرجەعیەتێکی هاوبەش لە نێوانیان نەبێت، یان هیچ مرۆڤایەتێکی جەوهەری هاوبەش لە نێوانیان نەبێت، بۆیە رۆڵی دایک لەو تێڕوانینە دەپوکێتەوە، خێزانیش وەک دەزگایەک هیچ قودسیەتی نامێنێت، دەبێتە بارگرانییێکی خوێنتاڵ، کە هەرگیز کەس پێی تەحەمول نەکرێت.

فێمینیزم بزاڤی ئافرەتانی وەرچەرخاند لە خەباتکردن لە پێناو بیرۆکەی مافە مرۆیی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیەکانی ئافرەت بۆ بیرۆکەی ناسنامە، لە تێڕوانینێکی تایبەت بە مافەکانی ئافرەت لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بۆ تێڕوانینێکی مەعریفی ئەنترۆپۆلۆژی کۆمەڵایەتی هەمەلایەن تایبەت بەکێشەگەلێکی وەک رۆڵی ئافرەت لە مێژوو و دەلالەتی مێینەیی ئەو هێمایانەی کە ئادەمیزاد بەکاریاندەهێنێت.

فێمینیزم لە تێڕوانینێکی دەبەرێک چوونیەوە سەرچاوە دەگرێت، بۆیە مێژووی مرۆڤایەتی لەو تێڕوانینە دەبێتە دەبەرێک چوونێکی ئەزەلی نێوان ئافرەت و پیاو، وزاڵبوونی پیاو و هەوڵی بێ وچانی ئافرەت بۆ ڕزگار بوون لە ژێر چنگی.

بێگومان مەهاباد خان لە نووسینێکی تری لە ژێر ناوی (بناغەکانی فێمینیزم و ئەنتی فێمینیزم) باسی چەند قوتابخانەیەکی سەرەکی فێمینیزم دەکات، بەڵام باسی چەند قوتابخانەی تریش ناکات، چونکە دەزانێت، کاردانەوەی مرۆڤی دروست و ئاسایی تەنها بێزاندن و قێز لێبونەوە دەبێت، لە دژی ئەو بیرۆکە لادەرو گەندەڵانەی کە مەرجەعیەتی تاکڕەوانەی فێمینیزم دروستی کردوون. ئەوانەشی کە باسیان دەکات، زۆر سادە هێڵە سەرەکیەکانیان دەخاتە ڕوو، بێئەوەی لایەنە ترسناکەکانیان بخاتە ڕوو.

با پێداچوونەوەیەک بکەین بەو قوتابخانانەی باسی کردوون، بەکورتیش باسی چەند قوتابخانەیەکی تریش بکەین کە ڕۆلی بەرچاویان هەیە لە گۆڕەپانی فێمینیزم.

# فێمینیزمی ڕادیکاڵ

ئەو قوتابخانەیە ترسناکترین قوتابخانەی فێمینیزمە، بەڕای من بەشی هەرە گەورەی فێمینیستانی جیهان لە خیتابی فیکریان پەیڕەو لەو قوتابخانەیە دەکەن، یان کوتونەتە ژێر کاریگەری ئەو قوتابخانەیە، بەئاگایی بێت یان بێئاگایی. زۆر لە قوتابخانەکانی تریش کەوتونەتە ژێر کاریگەری تێڕوانینی ڕادیکاڵانەو کێشە ئامێزی قوتابخانەی فێمینیزمی ڕادیکاڵ. ئەو قوتابخانەیەش ئیلهامی سەرەکی لە تێڕوانینی کێشە ئامێزی مارکسیزم وەرگرتوە، بۆ نمونە ئەنگلز رۆڵی ئافرەت لەناو خێزاندا بە رۆڵی پرۆلیتار بەرامبەر چینە ستەمکارەکان دەشوبهێنێت.

ئەو قوتابخانەیە پێی وایە، چەوسانەوەی ئافرەت لە ژێرخانی هەمەلایەنەی هەموو ئەوەی مرۆڤایەتی بەرهەمی هێناوەو هەیەتی، لە فیکرو فەلسەفەو ئایین و ڕەوشت و بەهاکان و یاسا ...هتد، سەرچاوە دەگرێت.

بۆیە پێویستە ئەو هەموو موفرەداتانە هەڵوەشێنرێنەوەو سەرلەنوێ دابڕێژرێنەوە، چونکە هەمووی دەستکردی پیاوە، بەجۆرێک دروستکراوان لە خزمەتی پیاوان و باوکسالاری دابن، بەهیچ جۆرێک ڕەچاوی بەرژەوەندی ئافرەتانی نەکردوە.

بێگومان ئەوە بیرۆکەیەکی خەیاڵی و ناواقیعیانەیە، لە کێشەو تەنگژە زیاتر هیچی تری لێناکەوێتەوە، چونکە دەبینین چۆن ئەوەی یەک تۆزقاڵ شانازی بە فەرهەنگ و کولتوری خۆی بکات لە جیهان، چۆن بەرەنگاری جیهانگەرایی ئەمریکا دەبێتەوە، لەگەڵ ئەو هەموو هێزە سەربازی و تەکنۆلۆژی و ئابووریەی کە هەیەتیشی، ئەو جیهانگەراییەی کە هەوڵدەدات هەموو فەرهەنگ و کولتورەکانی جیهان لە بۆتەی فەرهەنگ و کولتوری ئەمریکایی بتوێنێتەوەو، شێوازی ژیانی ئەمریکایی، تاقە شێوازی ژیان بێت لەسەر زەوی.

لەوەش ترسناکتر هەندێک لەو ڕادیکاڵانە پێیان وایە، نێر و مێ، یان ژن و پیاو دوو چینی جیاواز پێک دەهێنن، بۆیە بۆ پاراستنی خۆیان و ژیانیان و بەرژەوەندیەکانیان دەبێت لە جیهانی پیاو خۆ دابڕێنن.

زۆر لە ڕابەرانی قوتابخانەی فێمینیزمی ڕادیکاڵ لە پێناو پابەند بوون بە فێمینیزمی، هانی ئافرەت دەدەن بۆ لێسبیانیتی ، ڕابەرێکی ڕادیکاڵی فێمینیزم (بەنچ Bunch) پێی وایە تەنها ئافرەتی لێسبیان دەتوانێت فێمینیستێکی ڕاستەقینە بێت، چاکترین تێگەیشتنیش بۆ (لێسبیانیزمLesbianism) ئەوەیە کە ڕەتکردنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەیە بۆ هەموو دەزگایەکی نێر و پیاوانە .

هەروەها ڕابەرێکی تری فێمینیزمی ڕادیکاڵ ئەدرینی ریچ Adrienne Rich پێی وایە کە heterosexuality (واتە پەیوەندی سێکسی پیاو و ژن) بناغەی سەرەکی کۆمەڵایەتی هێشتنەوەی زاڵبوونی پیاوانە بەسەر ئافرەتان، بۆیە لێسبیانیزم lesbianism بە بنچینەی بەرگریکردن لە دژی باوکسالاری دادەنێت، ئافرەتی لێسبیانیش پێناسە دەکات وەک ئافرەتێکی بەهێز کە توانیویەتی دەستبەرداری پیاو بێت لە لایەنی سێکسی و سۆزیەوە .

لە ژێر کەوای ئەو قوتابخانەیە، لایەنی زۆر توندڕۆ تر بەدیار کەوتن، کە بانگەشەی دابڕانی سەرتاسەری نێوان پیاو و ئافرەت دەکەن، هەندێکیان داوای قەڵاچۆکردنی پیاوان دەکەن، هەندێکیان کەمێک دلۆڤانترن، داوا دەکەن، هەموو ڕەگەزی پیاو لە بەندیخانەی تایبەت بکرێن و، سپێرمیان لێوەربگرن بۆ پیتاندنی هێلکۆکەی ئافرەت، بەشێوەیەکی نوژداری دەستکرد، بۆ ئەوەی هیچ بەیەک گەیشتنێکی لاشەیی لە نێوان پیاو و ژن دروست نەبێت. کاتێکیش مناڵەکان لە دایک بوون تەنها کچەکان بهێڵنەوەو کوڕەکان بکوژن و هەندێکیشیان بهێڵنەوە وەک عەمبارێکی سپێرم، ڕێك بەپێچەوانەی هەندێک لە نەفامەکانی جاهیلیەتی عەرەبی پێش ئیسلام.

بڵێی مەسەلەی کۆپیکردنەی مرۆڤ، چ بیرۆکەیەکی تری نەگریس لای ئەو کۆمەڵە فێمینیزمیانە دروست بکات. هەڵبەتە لە سایەی ئەو پشێوە

فیکری و بێ مەرجەعیەتە و، پەیوەست نەبوونە بە هیچ بنەماو سنورێک، زۆر شتی سەیرو سەمەرەتر لە فێمینیزمی ڕادیکاڵ چاوەڕوان دەکرێت.

## فێمینیزمی لێسبیانیزم
## Lesbianism

هەروەک بەرچاومان کەوت ئەو قوتابخانەیە لە ژێر کەوای قوتابخانەی ڕادیکاڵ لە دایک بووە. ئەوەش بزاڤێکە ئافرەتانی پەیوەست پێی بڕیاریانداوە ژیانی سێکسی و کۆمەڵایەتی خۆیان بژێن دوور لە دەسەڵاتی پیاو و ئەو زیندانەی کە ناویان ناوە خێزان.

لێسبیانەکان پێیان وایە کە هەڵبژاردنیان بۆ شێوازە ژیانی لێسبیانیزم لەسەر بنچینەی ئارەزوێکی شازو نامۆ بنیات نەنراوە، بەڵکو لەسەر بنچینەی هەڵوێستێکی کۆمەڵایەتی سیاسی بنیات نراوە کە جیهانی نێرینە بەتەواوی ڕەت دەکاتەوە.

ئەو قوتابخانە یە چەندین لق و پۆپی تری لێکەوتەوە، وەک دایکانی لێسبیانیزم lesbianism ، لێسبیانیزمی لیبڕاڵ..

## فێمینیزمی شیکردنەوەی دەروونی
## Psychoanalytic feminism

ئەو قوتابخانەیە چەمکی نەستی فرۆید بەکاردەهێنێت بۆ تێگەیشتن و دیاریکردنی چەوسانەوەی ئافرەت. لە کاتێکدا لایەنی تری تێوری شیکردنەوەی دەروونی فرۆید رەتدەکاتەوە، وەک بۆ نمونە گرێی ئێرەی چوک penis envy کە ئافرەت تاوانبار دەکات بە کەموکڕی بایۆلۆژی. رابەرانی ئەو قوتابخانەیە پێیان وایە کە باوکسالاری تەنها لە کۆمەڵدا نییە، بەڵکو لەناو خودی نەستی (لاوعی) هەر تاکێکی کۆمەلگاکانی جیهاندا هەیە. بۆیە پێناسەمان تەنها بەهۆی هەست و هۆشیاریمان دروست نابێت، بەڵکو بەهۆی کۆنەستی

(اللاوعی الجمعی) کۆمەڵیش دێتە دروست بوون. بۆیە لەکاتی پیادەکردنی هەر پرۆسەیەکی گۆڕان دەبێت ڕەچاوی نەست بکرێت.

## فێمینیزمی مارکسیزمی

هەروەک لە پێشوو ئاماژەمان پێکرد ئەو قوتابخانەیە فیکرییە ئیلهام بەخشی سەرەکی قوتابخانە فێمینیزمیەکان بوو.

مارکسیزم پەیوەندی نێوان پیاو و ئافرەت لە خێزاندا لە چاویلکەی کێشەی چینایەتیەوە دەبینێت، هاوکێشەی پیاو ژنیش وەک هاوکێشەی دەرەبەگ و جوتیار، بۆرژوا و پرۆلیتار، کرێکار و سەرمایەدار دەبینێت. ئەنگلز دەڵێت : "یەکەم کێشەی چینایەتی لە مێژوودا لە نێوان پیاو و ئافرەت دا بووە لە سایەی زەواجی یەکانەیی monogamy لە خێزاندا پیاو بۆرژواو ئافرەتیش پرۆلیتاریایە". هەرەها لە جێیەکی تر دەڵێت : " کەوابوو زەواجی یەکانەیی شێوەی هەرەبەرزی زەواج نییە، بە پێچەوانەوە بریتییە لە چەوساندنەوەی ڕەگەزێک بۆ ڕەگەزێکی تر، جاڕدانی کێشەیەکی وایە کە هەرگیز مێژوو بە خۆیەوەی نە بینیوە". مەبەستیشی لە زەواجی یەکانەیی ئەو زەواجەیە کە لە نێوان یەک پیاو و یەک ژن، ڕودەدات، بەبێ بوونی هیچ پەیوەندیەکی سێکسی بە کەسانی دەرەوەی ئەو زەواجە و، بەمەبەستی هێنانی منالانێک گومان لە باوکایەتی و دایکایەتیان نەبێت.

خێزان لە روانگەی مارکسیزم قەوارەیەکی جێگیر نییەو یەکەیەکی ئابووریشە ئەگەر سیفەتی بەرهەم هێنانی لێ دامالرێت، دەبێتە هۆی لە ناوچوونی هەروەک مارکس و ئەنگلز لە مانفێستی کۆمەنستی ئاماژەی پێدەکەن. بە پێی ئەنگلزیش خێزان گۆڕەپانی کێشەیەکی ئەزەلییە لە نێوان پیاو و ئافرەت.

کەوابوو خێزان قەوارەیەکی ساختەت و کاتییە، چەقی زۆرانبازێ و کێشەیە، نەک ساباتی حەوانەوەی و ئۆقرە گرتنی ئادەمیزاد.

باڵێکی تر لەو قوتابخانەیە کەوتەوە بەناوی فێمینیزمی مارکسیزمی نوێ، یان نیوفێمێنیزمی مارکسیزم، کە زۆر سەرەڕۆترن لە فێمێنیزمی مارکسیزمی، بەڵکو گاڵتەیان بە وتەکانی مارکس و ئەنگلز و کلارا زیتکین و فلۆرا تریستا دێت.

فێمینستی ئەڵمانی بەناوبانگ ئورزۆلا شۆی بۆ نموونە گاڵتەی بەو قسەیەی مارکس دێت کە دەڵێت :"دابەشکردنی کار لە نێوان پیاو و ئافرەت، لە خودی خۆیدا دروست دەبێت، لەسەر بنچینەیەکی سروشتی و، بەپێی جیاوازی ئامادەییە سروشتییەکانی، وەک هێزی لاشەیی و پێویستیەکانی و ڕیکەوت...هتد. لە نێوان پیاو و ئافرەتدا"، ئورزولا شۆی دەڵێت: بەڵام ئەو ئامادەییە سروشتیانە لە کوێوە دێن؟ لە کەیەوە ڕێکەوت بۆتە بابەتی لێکدانەوە؟ هەروەک لە لێکۆڵینەوە نوێیەکان بەدیارکەوتوە، کە هێزی لاشەییش ئەنجامە، نەک هۆ بێت بۆ دابەشکردنی کار لە نێوان ڕەگەزەکان، تیۆریستە مارکسیستەکان وەڵامیان نییە بۆ ئەو پرسیارانە، تا ڕادەی ئەوەی گاڵتەمان بە بیروراکانیان دێت".

دوایی پاش ڕەخنەیەکی زۆر لە تیۆرە فێمینیزمیەکانی مارکسیزم، ئۆرزۆلا شۆی دەگاتە لوتکەی بێ هیوایی و، تێورە فێمینیزمیەکانی مارکسیزم بە مۆرکی پەتریارکی یان باوکسالاری ناودێری دەکات، دەڵێ:"ئەو جۆرە سۆشیالستییەی کە بەمۆرکی باوکسالاری مرکراوە، ناتوانێت هیچ جۆرە ئازادییەک بۆ ئافرەت دەستەبەر بکات، یان ڕزگاریان کات لە ژێر چنگی چەوساندنەوەی پیاو ".

ئەگەر ئەو بیروڕایانەی ئەو قوتابخانە فێمینیزمیانە پیادە بکرێت، بڵێی چ کارەساتێک بەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و ژن و پیاو و منداڵ دابێت؟ هێشتا مەهاباد خان لای وایە کو نابێت ئەو خەڵکە لەو قوتابخانە فێمینیزمیانەو فێمینیستان سڵ کەنەوە؟ پرسیارێکە بۆ خودی خۆی جێی دەهێڵم.

## فێمن FEMEN و خۆ ڕوتکردنەوە وەك نارەزایی دەربڕین(٣)

خۆ ڕوتکردنەوە وەک نارەزایی دەربڕین بۆتە دیاردەیەک لەو سەردەمە، وەك تاکتیکێك بۆ ناڕەزایی دەربڕین بەکاردێت، یەکەم ناڕەزایی دەربڕین بەڕووتی لەلایەن گروپێکی ئاینی هاتە کایەوە، لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی روسیا کە بەناوی گروپی **Doukhobors** دوخبورەوە سەری هەڵدا. دوخبور بە مانای جەنگاوەرە ڕوحانیەکان **Spirit-Wrestlers** دێت کە دەڵێن مێژووی دامەزراندنی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ١٨یان هەڤدە یان شازدە..

یەکەم رەهبەری ئەو گروپە ناوی سیلڤان کۆلیسنیکۆڤ **Silvan Kolesnikov** بوو کە لە گوندێکی ئۆکرانیای ئێستا لە دایك بووە کە لە نێوان سالانی ١٧٧٥-١٧٥٥ رەهبەری ئەو گروپە بووە، بیروباوەری ئەو گروپە ئەوەیە کە خوا لە هەموو کەسێکدا بوونی هەیە، بۆیە هیچ پیویست بە قەشەو پیاوانی دینی و نەزم و تقوسی ئاینی ناکات، هیچ ئیعترافێکیان بە کڵیساو حکومەتی سێکیولارو ئینجیل و ئولوهیەتی حەزرەتی مەسیح نەدەکرد. لەبەر نەگونجانیان لەگەڵ بیروباوەڕی خەڵك، وەرەتکردنەوەی زەوقی گشتی بۆ خۆڕوتکردنەوەیان لە کاتی نارەزایەکاندا، بریارندا لە نێوان سالانی ١٨٩٨-١٨٩٩کۆچ بکەن بۆ دەرەوەی روسیا، دواجار بەشێوەیەکی سەرەکی لە کەنەداو ویلایەتەیەکگروەکانی ئەمریکا گیرسانەوە. جۆرەکانی تری خۆروتکردنەوە زۆرن لە فەرهەنگی ئەوروپادا: کەسانێك لە دژی خراپ مامەڵەکردنی ئاژەڵ لە ئەوروپادا خۆیان ڕووت دەکەنەوە ...کەسانێکی تر لەدژی شەڕو جەنگ و لە پێناو ئاشتی لە خۆپیشاندانەکان خۆیان ڕووتدەکەنەوە...هەندێك هەر بۆ خۆشی خۆیان ڕووت دەکەنەوە وەك ڕۆژی لێخوڕینی پاسکیلسوارانی ڕووت **World Naked Bike Ride** ... یان بۆ داواکردنی مافی ڕووتبوون لە شوێنی گشتیدا **"the right to be naked in public".** ئەو گروپە بە ناوی **The Freedom to be Yourself** ئازادی

---

(٣) هەفتەنامەی ئاوێنە ، ٢٠١٣/٦/١٨ .

بوونە خودی خۆت دامەزرا لە لایەن Vincent Bethell لە ساڵی ١٩٩٨ لە ئەمریکا.

هەندێکیان داوای مافی ڕووتکردنەوەی بەشی سەرەوە دەکەن بەناوی بزوتنەوەی بەشی ئازادی بەشە سەرەوە topfreedom movement ئەو بزوتنەوەیە لە بنچینەدا لە کەنەدا دروست بوو، دوایی تەشەنەی کرد بۆ ئەمریکاو سویدو دانمارك و چەندین وڵاتانی تری ئەوروپا تێزی سەرەکی ئەو تۆپفرییانە ئەوەیە دەڵێن دەبێت وەك پیاو کاتێ بەشی سەرەوەمان ڕووت کردەوە ئاسایی بێت و لە دژی یاساو نەرێتە کۆمەڵایەتیەکان نەهێتە حیساب کردن.

وەك لەسەرەوە باسمان کرد ئۆکرانیا مەڵبەندی یەکەم گروپی نارەزایی دەربڕین بە ڕووتیەوە بوو بەناوی گروپی دوخبورەوە یان جەنگاوەرە ڕۆحانیەکان، هەرچەندە گروپێکی ئاینیش بوون، کەچی فێمنستە ڕادیکاڵەکانی ئۆکرانیا بە سروش وەرگرتن لە دوخبورەوە یان جەنگاوەرە ڕۆحانیەکانەوە کاریگەرترین گروپی فێمنستی ڕادیکاڵی نارەزایی دەربڕین بە ڕووتیان دامەزراند، کە لە هەموویان چالاکترو کاریگەرتر بوون ئەویش بزوتنەوەی فێمنە FEMEN کە گروپێکی فێمنستی ڕادیکاڵین لە شاری کیڤی ئۆکرانیا دامەزرا لەلایەن ئانا هوستۆل Anna Hutsol لە ساڵی ٢٠٠٨. کاتیك دەڵێین کاریگەرتر لەبەر ئەوەیە ئەو گروپە سەرەڕۆیە فێمنستیە لە ڕێگای ئەو ئامرازەی خۆڕوتکردنەوەیە بەرگری لە زۆر کێشەی هەق دەکات کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بە دەستیانەوە دەناڵێنێت، وەك خۆپیشاندانی ڕووت لە دژی سێکسی توریزم، ئاژانسەکانی جیهانی زەواج کە وڵاتی ئۆکرانیا بەشێوەیەکی تایبەتی بە دەستیەوە دەناڵێنێت، هەروەها قاچاغی ژنانی ئۆکرانی کە وەک کۆیلەی سێکسی بەناوی کارکردن دەبردرێن دوایی بازرگانی سێکسیان پێ دەکەن. ساڵانە خەڵکێکی زۆر تەنها بۆ سێکس کردن و رابواردن دەچنە ئۆکرانیا ووڵاتانی تر، هەروەها ئینتەرنێت پڕیەتی لەو سایتانەی بەناوی زەواج لە کچە ئۆکرانیەکان کە وەک بازاڕی کۆیلایەتی کۆنی جیهانی کۆن نمایشکراون. بەو دواییە ئەو بزوتنەوەی فێمنە پەل و پۆی هاوێشتوە بۆ

زۆربەی وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو و وڵاتانی خۆرئاوایی و ئەمریکا لە زۆر بۆنە سیاسیەکان دوو سێ ژنی ڕووت و قووت دەبینیت لە ناکاو لە ناو خەڵکدا خۆیان ڕووت دەکەنەوە لە دژی دۆزە کێشە لەسەرەکان... هەندێك جار ئیشەکە ئەوەندە ڕەزیل دەکەن لەبەر کەمی توالێتی گشتی دەیان کچی ئۆکرانی خۆیان بەتەوای لەبەردەم ئاودەستێکی گشتی ڕووت کردەوە لە ئۆکتۆبەری ٢٠١٠ .

بەو دواییە سەرنجم دا، چەند سایتیکی فێمنستانی کوردیش جۆرێك لە ڕێکڵام کردن دەکەن بۆ ئەو فێمنانە، وێنەی نیمچە ڕووت بڵاودەکەنەوە کە لەسەر جەستەیان نوسراوە، "جەستەم شەڕەفی کەس نییە" وەك هەمیشە بەبێ بیرکردنەوە لە شیاوی ئەو ئامڕازە بۆ کچانی کوردو کۆمەڵگای کوردی.

دامەزرێنەری فێمن ئانا هوستۆل Anna Hutsol فێمنەکان پێیان وایە نارەزایی دەربڕین بە ڕووتی تەنها ڕێگایە بۆ ئەوەی گوێت لێبگرن ئەگەر خۆپیشاندانێکی ئاساییمان کرد بە چەند لافیتەوە، کەس گوێ بە داواکاریەکانمان ناگرێت. لە هەمووی کۆمیدیتر لە کاتی پاڵەوانێتی ئەوروپای ٢٠١٢ کە لە ئۆکرانیاو پۆلەندا ڕێکخرا، فیمن بە رووتی لە ئۆکرانیا خۆپیشاندانیان کرد لە پێناو نایاسایی کردنی سۆزانیەت و سێکسی سیاحی، کەچی لە پۆڵەندا گروپێك لە ژنانی لەشفرۆش هەر ئەوانیش بەڕووتی خۆپیشاندانیان کرد لە دژی داواکاریەکانی فێمنەکانی ئۆکرانیاو لافیتەکانیان لەسەریان نوسرابوو: (فێمنەکان دەست مەخەنە ناو بزنزو کاری ئێمە- (Femen Get the fuck out of our business

ڕەخنەیەکی زۆر ڕوبەڕووی فێمن بوەوە هەر لەناو خودی ئۆکرانیا کە تاوانبار کران بە بایەخدان زیاتر بە خۆ دەرخستن لە بەرگری کردن لە دۆزەکانیان، رەخنەکان لە ئاستی جەماوەری و ئەکادیمی بوون. لە کاردانەوەکانی خەڵك لە دژی ئەو جۆرە نارەزایی دەربڕینە بە ڕووتی، زۆر لە فێمنەکان لەلایەن خەڵکی تر هەڕەشەیان لێدەکرێت، خۆشیان لە زۆر چاوپێکەوتندا دەڵێن لەلایەن کەس و کاریان سزا دراون بە برینی هەموو پەیوەندیەک لەگەڵیان .

بەپێی پسپۆڕێکی بواری جێندەر تیتیانا بوریجاک؛ زۆربەی هەرە زۆری ئافرەتانی ئۆکرانیا حەز بە چارەی فێمن ناکەن. سۆسۆلۆژیستی بەناوبانگ ئۆلیە دێمکیڤ وتی فێمن هیچ پشتگیری ناکرێت لەلایەن ڕای گشتییەوە، ناتوانن هیچ گۆڕانکاریەک لە کۆمەڵگاو هۆشیاری ئۆکرانی ئەنجام بدەن. هەر جوانا روهۆزینسکا Joanna Rohozinska لێکۆڵەر لە فەندی نیشتیمانی بۆ دیموکراسی، لە فێبریوەری ٢٠١٣ دا گوتی "بەڵگەیەکی زۆر کەم هەیە کە هیچ لە نارەزایی دەربڕینی فێمنەکان کەمترین کاریگەری هەبوبێت" لە لایەکی تر ستایش کران لەلایەن فێمستە ڕادیکاڵەکان پێیان وایە کە توانیویەتی بەشێوەیەکی پۆزەتیڤانەو ڕادیکاڵانە ببێتە دیاردەیەك بۆ وروژاندنی کێشە گەلێکی زۆری کۆمەڵایەتی ئەگەر بە کەرەستە و ئامرازی کێشە لەسەریش بوو بێت.

# جیهادی تۆپلێس

لە نێو ئەو بابەتانەی کە فێمنەکان کاری لە دژدا دەکەن ئایینەکانە، بە بەردەوامی دژی کلێساو بیروباوەڕەکانی دەوەستنەوە، لەبەردەم کلیساکان خۆیان ڕووت نیشان دەدەن، بەو دواییە نارەزاییەکانیان لە ڕێگای چەند فێمنستێکی وڵاتانی جیهانی ئیسلامی، پەڕیەوە بۆ دژایەتی کردنی شەریعەتی ئیسلام و بەتایبەتی ئەوەی ناوی دەنێن بە (دژی شێواندنی ئەندامی مێینە) کە مەبەستیان خەتەنە کردنە، لە بەرامبەر چەندین باڵوێزخانەی وڵاتانی ئیسلامی وەک ئێران و میسرو مزگەوتی پاریس بەڕووتی خۆنیشاندانیان کرد، کە تێیدا چەندین ژنی موسڵمانی فێمن یان لەگەڵ بوو وەك ئێرانیەکان کە ئەوانیش خۆیان بەڕووتی نیشان دا.

لە نێو ئەو ڕەخنانەش کە لە فێمن گیراوە ئەوەیە کە بەو خوپێوەگرتنەی بە خۆ ڕووتکردنەوەیان دەبێتە هۆی جەختکردنەوەو بەهێزکردنی فێمنیزمی کۆڵۆنیاڵی ڕەگەزپەرست. بەڕای من لە وڵاتانی ئیسلامیدا دەبێتە هۆی زیاتر پتەوکردنی توندڕەوی ئاینیش، بەربەست زیادکردن لەبەردەم ئازادیە سروشتی و یاساکانی ئافرەتانیش.

لە ٢٠١٣/٤/٢٠ کاتێك جەماعەتی ئەنساری شەریعەتی سەلەفی تونسی توندڕەو خەریکی خۆپیشاندانێکی گەورە بوون لە قەیرەوان، بەڵام لە ترسی حکومەت دوایان خست پاش ئەوەی خەڵکی شارەکەش لە دژیان وەستان، لە ناکاو کچێکی فێمنی تونسی بەناوی ئەمینە، نزیك ١٨ ساڵ لەشارەکە دەرکەوت و باسی خۆڕوتکردنەوەی کرد لەسەر شەقام، دوایی لە ئینتەرنێت قسەکانی خۆی جێبەجێ کرد بە دەست لە پشدانی چەند فێمنێکی ئۆکرانی، بەبێ ڕەچاوکردنی هەلومەرجی تونس. دوای ئەوە سەلەفیەکان لە کاردانەوەی ئەو کارە سەرەڕۆیە کۆنترۆڵی شەقامیان کرد، ڕاست و چۆپ دژی مافی ئافرەتان قسەیان دەکردو دەیانگووت ئافرەت مافی خۆڕووتکردنەوە و زینای بە ئازادیان دەوێت، حکومەت ئەمینەی گرت، لە دواییدا، هەڵمەتێکی گەورە لە ئینتەرنێت بەرپاکرا بە ناوی: جیهادی ڕووتکردنەوەی بەشی سەرەوە [تۆپلێس] بەردەوامە، هەزاران ژنی خۆرئاوایی خۆیان لە پێناو

ئەمینە ڕووت کردەوەو لەسەر جەستەیان داوای ئازادکردنی ئەمینەیان دەکرد. هەتا لە کاتی و جودی سەرۆکی تونس، منسیف مەرزوقی لە پەیمانگای فەرهەنگی عەرەبی لە تونس، بۆ قسەکردن لەسەر کتێبەکەی بە ناوی: داهێنانی دیموکراسیەت، سێ لەو فێمنانەی فەڕەنسایی بە لاشەی ڕوتیان قسەیان بە مەرزوقی بڕی و هاواریان دەکرد جیهادی تۆپلێس بەردەوامە، بەهاری ژنان بەڕێوەیە، ئەمینە کوا لە کوێیە؟.

فێمنەکان بەدەر لە ئامرازی ناڕەزاییەکانیان وەك ئینساف دەتوانین بڵێین تەبەنای زۆر لە کێشەی کۆمەڵایەتی دەکەن، کە کەم کەس هەیە کە کەمێك بایەخ بە ڕەوشت و مۆڕاڵ بدات هاوڕا نەبێت لە گەڵیان، کێ هەیە دژی بازرگانی سێکسی نەبێت، کێ هەیە دژی سیکسی توریزم نەبێت، یان دژی کۆیلایەنی سێکسی نەبێت.

لە یەکێك لە نمایشە پۆرنۆکانی جیهانی لە کاتێکدا لەسەر ستەیگی هۆڵەکە نمایشی سێکسی بە زیندوویی دەکرا، کۆمەڵێك لەو کچە فێمنانە هەموو بۆنەکەیان تێکوپێکدا کاتێك هاتە سەر شانۆکەو ئیدانەی ئەو کارە ناشیاوانەیان کرد، بەڵام داخەکەم بە خۆ ڕووتـکردنەوە لەسەر شانۆی ڕووتی ئیدانەی ڕووتی و پۆرنۆیان کرد. ناکرێت تۆ دژی کاروکردەوەیەك بیت کە زۆربەی پشت بە نمایشدانی لەشی ئافرەت دەبەستن بۆ وروژاندنی پیاوان و برەودان بە بازرگانی سێکسی، لە هەمان کاتدا خۆت ڕووتکەیتەوە لەدژی ئەو دیاردانەی کە زۆربەیان پشت بە ڕووتکردنەوەی ئافرەت دەبەستن.

زۆر ماقوڵ دەبوو ئەگەر بە جلێکی داپۆشەرەوە ناڵێم حیجاب، ئەو کارانەیان کردبا، ئەوە بیرۆکەیەکی زۆر ساویلکانەی خۆرئاواییە تۆ هەوڵدەیت بە جەستەی ڕوتەوەو سەرنجی خەڵك بۆ لای کێشەکانت ڕاکێشیت، لاساییکردنەوەیەکی ناشیاوانەو دەبەنگانەی ڕێکلامی خۆرئاواییە بۆ هەموو کەل و پەلێك، کە لە ڕێگای جەستەیەکی ڕووت و کردەیەکی سێکسیەوە ڕێکلام بۆ کەل و پەلەکانی دەکات. ئەگەر فێمنەکان دژی ئەو مێنتاڵیتەی بازرگانی کردنن بە جەستەی ژنەوە، کە من سەد دەرسەد لەگەڵیانم، دەبێت لاسایی میتودی و شێوازی ڕێکلامی خۆرئاواییان

نەکردبایەوە، بە جەستەی ڕووت، چونکە سەرەڕای ئەوەی شێوازێکی قبوڵکراو نییە لە وڵاتانی هەتا خۆرئاواش، بێزێنراویشە لە وڵاتانی جیهانی ئیسلامی و مەسیحیشی دەرەوەی کیشوەری ئەوروپا، ئینجا ڕادەی توندرەویش زیاتر دەکات و بەربەستیش زیاتر دەکات لەبەردەم گەیشتنی ئافرەت بە مافە هەقیقیەکانیان نەك مافی خۆڕووتکردنەوە لەبەر کێشەی جاروبار هێندە بێ ئەرزش وەك نەبوونی ژمارەی سەروزیادی توالێتی گشتی.

# پیرۆزبایی ٨ مارس و هیواکانم بۆ ئافرەتان(٤)

بەر لە هەر شتێك پیرۆزبایی ٨ مارس لە هەموو ئافرەتانی کورد بەتایبەتی شێرە کچ و ژنانی شەڕڤانان و پێشمەرگە، هەموو ئافرەتانی تری کۆمەلگەکەمان دەکەم، کە سەلماندیان ڕۆڵیان بە قەد ڕۆڵی برا و باوک و مێردەکانیان گرنگە لە پیناو بەرگری کردن لە کوردو کوردستان. ئەو یادە کە بە فەرمی کراوەتە یادی ئافرەتانی جیهان هەمووی وا هەست دەکەم تایبەتمەندێتی ئێوە ون دەکات، دەبوایە ڕۆژی ئازادکردنی کۆبانی بکرایە یادو ڕۆژی ئافرەتانی کورد، هیوادارم کچ و ژنانی کورد پەیڕەو لە وتارێکی عەقڵانی و میانرەو بکەن بۆ گەیشتن بە هەموو مافەکانیان دوور لە زیادەرۆیی هەندێ بازنە فێمینیزمە سەرەڕۆیەکان..

هیوادارم چۆن خەمیان وەگیرهینانی مافەکانیانە، بە هەمان شێوە خەمیان پاراستنی خێزانەکانی کورد بێت لە پەرتەوازەیی و خیانەت و بەدڕەوشتی و بێ نرخ کردنی ژیانی ژن و مێردایەتی و تێکدانی لانەی منداڵە بەستەزمانەکانمان، کە کاتێ جیابوونەوە ڕوودەدات لە نێوان دایک و باوکیان، ئەوان وەك پەڕەی کاغەز لە نێوانیان دەدڕێن...

هیوادارم ئافرەتانمان بزانن ئێمەی کورد نەتەوەیەکی ستەملێکراوین لەو ناوچەیە شکاندنی شکۆی پیاوەکانی میللەتەکەیان سەردەکێشێت بۆ شکاندنی شکۆی کۆی میللەتەکە، ناکرێت لەبەر روداوێکی فەردی زوڕنای دژە پیاوی لێبدەن لەناو میدیا جیهانی و لۆکاڵیەکان. نابێت هەموو پیاوان تاوانبار کەن و بخەنە خانەی دوژمنانەوە لەبەر ڕوداوگەلێکی وەها. هیوادارم ئافرەتانی دیندارو ئیسلامیەکان بەتایبەت ڕازی نەبن بە مامەلە و وتارو ڕەفتاری هەندێك لە نێوەندە دینیە سەلەفیەکان، کە بە دەست ئەوان بێت ژنان زیندەبەچاڵ دەکەن یان زیندە بەماڵ، هیوادارم ژنانی دەرەوەی نیوەندە سێکیولارەکان لووت بەرزی نەکەن لەسەر ئافرەتانی بازنەی

---

(٤) خەندان ، ٢٠١٥/٠٣/٠٩ .

دینداری، لە جیاتی ئەوە هەوڵی ڕزگارکردنی ژنانی بازنە دینیە داخراوەکان بدەن، نەك لاقرتێ و گاڵتە پێکردنیان. هیوادارم لە زمانی ئاخاوتن و دواندنی کۆمەڵگای کوردی تێبگەن بەرلەوەی بە قسەی زبرو بێ سنوور هەموو ڕیسەکانیان بکەنەوە خوری، هیوادارم کۆمەڵگای کوردی باشتر بناسن.

لە کۆمەڵگای سوێدی و ئەڵمانی و ئینگلیزی و کۆمەڵگاکانی تری خۆرئاوا. هیوادارم ئافرەتان هەوڵ لەگەڵ پیاوانی میانڕەو و دژە پیاو سالاریەکان پێکەوە بدەن بۆ دروستکردنی خێزانی کوردی نموونەیی لەو ناوچەیەدا لەسەر بنچینەی یەکسانی و ڕیزی ئاڵۆگۆر لە نیوان پیاوان و ژنان و منداڵانیشیان. هیوادارم ژنانی کورد ئاگاداری مێژوو بن، کە چۆن هەموو گەڕیدەو ڕۆژهەڵاتناس و مێژوونووسان باسی کەسایەتی بەهێزی ژنی کوردیان کردوە، تاڕادەی ئەوەی ئازاد بوونیان بەراورد کردوە بە ئازادی ژنانی کۆمەڵگای بەریتانی سەدەی نۆزدەم، دەڵێن لە هەموو ژنانی ناوچەکە لە عەرەب و فارس و تورك کەسایەتیان بەهێزتر بووە.

دەبێت بزانن کە ئەو بەهێزی کەسایەتیە تەنها چاکەکەی بۆ ئەوان ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ لاوچاکی و جەنتڵمانی پیاوی کوردیش دەگەڕێتەوە، کە وەك مرۆڤێکی یەکسان مامەڵەی دەرهەق خێزانی کردوە، ئەوپەڕی ئازادی و متمانەی پێ بەخشیوە تا ڕادەی پێشوازی کردنی لە میوانەکانی پیاویش بە تەنها و مانەوەیان لە ماڵەوە بەبێ بوونی پیاو، هیوادارم هەمووومان ئافرەتان و پیاوانمان هەوڵی جەختکردنەوە بدەین لەسەر ئەو سلوک و ڕەفتارە شارستانیە ڕەسەنە کوردیانە، نەك لاسایی ئافرەتەکانی خۆرئاوا بکەنەوە بە ڕەهایی، کە زۆربەیان هەست دەکەیت نەخۆشن زیاتر لەوەی ڕیفۆرخوازبن. دووبارە پیرۆزبایی لە هەموو ژنان و کچانی کورد دەکەم بەتایبەتی لە هاوسەرم و خوشکەکان و نەوەکانیان، بەبۆنەی یادی ئافرەتانی جیهانی ٨ مارس.

# لە یادی ٨ی  مارس دا[٥]

## بەڕاستی ئێوەش ناخۆشتان کردوە

لەو یادەدا دەمتوانی وەک نیمچە ڕۆشنبیرەکان بەس پیرۆزبایەکی گەرمتانم لێکردباو هەزار نەفرەتم لە کۆمەڵگایە ژن کوژەکەمان کردبا، کە شەو رۆژ وا وەسفی دەکەن، دەمتوانی لە ئێوەی فێمینست سەرەڕۆیانەتر هەزار نەفرەتم لە باوکسالاری وناموس وشەڕەف پەرستی کردبا، بەڵام هەرچەندە لەگەڵ هەمو مافێکی شەرعی ویاسایی ئێوەم، بەڵام ئەو ئایدیۆلۆژیایەی ئێوە گرتوتانە بەر لە هەر کەسێك خۆتان تەدمیر دەکات ئینجا کۆمەڵگا وخێزان ومنداڵەکانمان، ئێوە بەس ئەفسانەکانی فێمنزمان بۆ دەگوێزنەوە پشتتان لە هەزاران ڕەخنەی جیدی دەکەن کە خودی فێمنستەکان لە فێمنزمیان گرتوە، ئەوان هاواریانە لەدەست ئەنجامە کاولکارەکانی بیرۆکە شەڕانگێژەکانی فێمینزم، ئێوە سورن ئێمەش بەو ڕێگایە کاولکاریە دابەرن.

کوردستان و رۆژهەڵات بەگشتی جەورو ستەمێکی زۆری لێدەکرێت لە دژی ئافرەتان، کەس ناتوانێت نکولی لێبکات، لەم بوارەدا دەیان نووسین و هەوڵم هەبووە بۆ بەرچاو روونکردنەوەی دەوروبەرم بەو ستەمانەی کە لە ئافرەت دەکرێت، بەڵام ئەو دۆزە گرنگە پێویستی بە ئافرەتانێک هەیە پەنجە بخەنە سەر زامە هەقیقیەکان، نەک لە یەکەم وشەدا بڵێن دەبێت ئافرەت ئازاد بێت و، خاوەنی لاشەی خۆی بێیت و چۆنی بەکاردەهێنێت هەقی خۆیەتی، بۆ چما لە کلتوری ئێمەو دەوروبەرمان و لەو وڵاتانەی ئێمە، پیاویش خاوەنی ڕەهای لاشەی خۆیەتی تا ئافرەت خاوەنی بێت.

کاریگەری فێمینزمی خۆرئاوایی بەسەر بزوتنەوە فێمێنزمیەکانی خۆرهەڵات و لە نێوانیانیشدا فێمنیزمی کوردی زۆر بە زەقی دەردەکەوێت، هەرچەندە هەندێ بزوتنەوە فێمێنزمیەکانی خۆرهەڵات هەوڵدەدەن

---

(٥) هاوڵاتی ٢٠١٣/٣/٩

بیروڕاكانی فێمینزمی لە قاڵبیكی لایقترو رتوش بۆ كراودا پێشكەش بكەن، تا ببێتە مایەی قبوڵ كردن لە نێوەندی كلتوری ناوخۆدا، هەندێكی تریشیان لە بزوتنەوە فێمێنزمیەكان و ئافرەتە فێمنستەكان زۆر بە روقایمی و تارادەی وەقاحەت لە خاوەنی خودی فیكرەكانیش تێیدپەڕێنن، لە نێو ئەوانەش كورد وەك میللەتێكی ژێرچەپۆك ئیبتلا بووە بە دەست ژمارەیەكی زۆری ئافرەتی فێمنیستی تاراوگەو ژماریەكی ناوەوەش تا ڕادەیەک، كە زۆر ناشیانەو بێ عەقڵانە كەوتونەتە قامچی كردنی خۆیان و میللەتەكەیان بەشێوازێك بارە نالەبارەكە نالەبارتر دەكەن لە جیاتی چاكیكەنەوە، لەبەر نەشارەزاییان بە مێژوو و كلتورو عەقڵیەت و ڕۆحی نەتەوەكەیان، ئەوەی دێتە سەر زمانیان نایگێڕنەوە وادەزانن بەو جۆرە وتارە سەقەتە زۆری پێ ناچێت شۆڕشێكی ماتریاركی سەرتاسەری بەرپا دەكەن و سەرلەنوێ كۆمەڵگایەكی خورافی ماتریاركی لە كوردستان دروست دەبێت، كە تێیدا ژن و پیاو یەكسان نابن، بەڵكو ژنەكان باڵا دەست دەبن لە جینۆكراسیەتی دایک سالاریدا.

(بزاڤی ئازادیخوازی ئافرەتان) كە لە ڕۆژئاوا دەستی پێكرد، كاردانەوە بوو بۆ چەوساندنەوەو كەبت كردن و نكوڵی كردن لە مافەكانی و كەسایەتی لە كۆمەڵگایەكانی ڕۆژئاوا، لەو مافانەش مافی موڵكایەتی و مافی سیاسی لە هەڵبژاردن و خۆ كاندید كردن و یەكسانی لە كرێی كارو چەندین مافی تر.

# شەپۆلی دووەمی فێمینزم

پاش بازدانی ژیاری رۆژئاوا لە خانەی هیومانیزم بەرەو میکانیزمی ماددی، پێداگرتن لەسەر بەها ماددییەکان لەسەر حیسابی بەها مرۆیی و مەعنەویەکان و، بایەخدان بە کاری بەرهەمهێنانی دەرەکی (بەرهەمی ماددی)، لەسەر حیسابی بەرهەمهێنانی ناوەکی (بەرهەمهێنانی مرۆڤی دروست)، وپشتلێکردن لە هەموو ئەو بەهایانەی کە مرۆڤایەتی لەوەتی هەیە کۆکن لەسەر ڕیزلێگرتن و پیادەکردن و پاراستنیان.

فێمینیزمیش وەک گوزارشتێکی سروشتی ئەو وەرچەرخانە لە ژیاری خۆرئاوادا سەریهەڵداو لەسۆنگەی ئەو جیهانبینیە بێ ڕۆحەوە فێمینیزم لە جیاتی هەوڵی بەدەستهێنانی مافی تری ئافرەت بدات، لە جیاتی ئەوە هەردەم پێی دادەگرێت لەسەر بیرۆکەی ئەو جیاوازییە قوڵانەی لە نێوان پیاو و ئافرەت هەن، کە لە تێڕوانینێکی کێشە ئامێزو کێشمەکێشی (من و ئەویتر) سەرچاوەیان دەگرت، وەک بڵێی هیچ مەرجەعیەتێکی هاوبەش لە نێوانیاندا نەبێت، یان هیچ مرۆڤایەتێکی جەوهەری هاوبەش لە نێوانیان نەبێت، بۆیە رۆڵی دایک لەو تێڕوانینە دەپوکێتەوە، خێزانیش وەک دەزگایەک هیچ قودسیەتی نامێنێت، دەبێتە بارگرانییێکی خوێنتاڵ، کە هەرگیز کەس پێی تەحەمول نەکرێت.

فێمینیزم بزاڤی ئافرەتانی وەرچەرخاند لە خەباتکردن لە پێناو بیرۆکەی مافە مرۆییی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسیەکانی ئافرەت بۆ بیرۆکەی ناسنامە، تێڕوانینێکی مەعریفی ئەنترۆپۆلۆژی کۆمەڵایەتی تایبەت بە کێشەگەلێکی وەک رۆڵی ئافرەت لە مێژوو ماتریارکییەت و بابەتەکانی ژەندەرو دەلالەتی مێینەیی ئەو هێمایانەی کە ئادەمیزاد بەکاریاندەهێنێت.

یەکەم هەنگاوی فێمێنزمی ململانێ و کێشمەکێش بەرابەرایەتی گێرمین گریر Germaine Greer کە لە ١٩٧٠ کتێبێکی نووسی بەناوی (مێینەی

خەسێنراو) The Female Eunuch کە دەتوانین بڵێین بیناغە دامەزرێنەری شەپۆڵی دووەمی فێمنیزم بوو.

لەو کتێبەدا کە لە ناونیشانەکەیەوە ناوەرۆکیت بۆ ساغ دەبێتەوە، گێرمین گریر دەڵێت:"ئافرەت نازانێت پیاو چەندە ڕقی لێیەتی، چەندە فێردەکرێن بۆ ئەوەی ڕقیان لە خۆیان بێتەوە.." ئەو کتێبە جاڕدانی شەڕێکی بێ مانای بێ پاکانە بوو لە نێوان ئافرەتان و پیاوان بیرۆکەی سەرەکی ئەو کتێبە ئەوە بوو کە خێزانی ناوەکی nuclear family (چەمکێکە سۆسیۆلۆژەکان مەبەستیان لەو خێزانەیە کە لە باوک و دایک و مناڵەکان پێکدێت، واتە خێزانی ئاسایی) ژینگەیەکی خراپە بۆ ئافرەتان و بۆ بەخێوکردنی منداڵان، واتە لەناو بردنی خێزانی ئاسایی یەکێک بوو لە ئامانجە سەرەکیەکانی، هەڵمەتێکی سەرتاسەر بوو بۆ سەر پیاو و نێرایەتی، داوای دەکرد ئافرەت پێویستە (ئیکتیفای زاتی) هەبێت دوور لە پیاو. هەر بۆیەش گێرمین هاوڕەگەزباز Lesbian بوو. لەگەڵ هاتنە ناوەوەی ئەو باڵە لێزبیانە سەرەڕۆیە بۆ ناو گۆڕەپانی خەباتی ئافرەتان هەموو خەباتەکەی ئافرەتانی ڤایرۆساوی کرد بە ڤایرۆسی لێزبیانەتی و دژایەتی کردنی پیاو چەمکی نێرایەتی. ئەگەر ئەو جۆرە فێمینیزمە سەرەڕۆیە لە ژیاری ڕۆژئاواو لە ژینگەی تەکنۆلۆژی و فیکری و بەهایی ئەوان جێی ببێتەوە، کە من دەزانم چەندە مەکروهە لای خەڵک و، زۆربەی ئافرەتانیش، چۆن بوونی ئەو جۆرە فێمینیزمە لە کوردستان پاکانەی دەبێت؟.

فێمینیزمی مارکسیسیزمی ئەو قوتابخانەیە فیکرییە بوو کە ئیلهام بەخشی سەرەکی قوتابخانە فێمینیزمیەکان بوو.

مارکسیزم پەیوەندی نێوان پیاو و ئافرەت لە خێزاندا لە چاویلکەی کێشەی چینایەتیەوە دەبینێت، هاوکێشەی پیاو ژنیش وەک هاوکێشەی دەرەبەگ و جوتیار، بۆرژوا و پرۆلیتار، کرێکارو سەرمایەدار دەبینێت. ئەنگلز دەڵێت:"یەکەم کێشەی چینایەتی لە مێژوودا لە نێوان پیاو و ئافرەتدا بووە لە سایەی زەواجی یەکانەیی monogamy لە خێزاندا پیاو بۆرژوا، ئافرەتیش پرۆلیتاریایە" هەروەها دەڵێت:"کەوابوو زەواجی یەکانەیی شێوەی

هەرەبەرزی زەواج نییە، بە پێچەوانەوە بریتییە لە چەوساندنەوەی ڕەگەزێک بۆ ڕەگەزێکی تر، جاڕدانی کێشەیەکی وایە کە هەرگیز مێژوو بە خۆیەوەی نەبینیوە". فێمینیزمی ڕادیکاڵ لەژێر کاریگەری بیرورا رادیکاڵەکانی مارکسیزم سەریهەڵدا، ئەو قوتابخانەیە ترسناکترین قوتابخانەی فێمینیزمە، بەڕای من بەشی هەرە گەورەی فێمینیستانی کوردستان و جیهان لە خیتابی فیکریان پەیڕەو لەو قوتابخانەیە دەکەن، یان کەوتونەتە ژێر کاریگەری ئەو قوتابخانەیە، جا بەئاگایی بێت یان بێئاگایی. ئەو قوتابخانەیە پێی وایە، چەوسانەوەی ئافرەت لە ژێرخانی هەمەلایەنەی هەموو ئەوەی مرۆڤایەتی بەرهەمی هێناوەو هەیەتی، لە فیکرو فەلسەفە و ئایین و ڕەوشت و بەهاکان و یاسا ...هتد، سەرچاوە دەگرێت.

بۆیە پێویستە ئەو هەموو ژێرخان و موفرەداتانە هەڵوەشێنرێنەوە و سەرلەنوێ دابڕێژرێنەوە، چونکە هەمووی لە دەستکردی پیاوە، بەجۆرێک دروستکراوان لە خزمەتی پیاوان و باوکسالاری دابن، بەهیچ جۆرێک ڕەچاوی بەرژەوەندی ئافرەتانی نەکردوە.

زۆر لە ڕابەرانی قوتابخانەی فێمینیزمی ڕادیکاڵ لە پێناو پابەند بوون بە فێمینیزمی، هانی ئافرەت دەدەن بۆ لێسبیانیتی ، ڕابەرێکی ڕادیکاڵی فێمینیزم (بەنچ **Bunch**) پێی وایە تەنها ئافرەتی لێسبیان دەتوانێت فێمینیستێکی ڕاستەقینە بێت، وچاکترین تێگەیشتنیش بۆ لێسبیانیزم **lesbianism** ، ئەوەیە کە ڕەتکردنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەیە بۆ هەموو دەزگایەکی نێر و پیاوانە.

هەروەها ڕابەرێکی تری فێمینیزمی ڕادیکال ئەدرینی ریچ **Adrienne Rich** پێی وایە کە **heterosexuality** (واتە پەیوەندی سێکسی پیاو و ژن) بناغەی سەرەکی کۆمەڵایەتی هێشتنەوەی زاڵبوونی پیاوانە بەسەر ئافرەتان، بۆیە لێسبیانیزم **lesbianism** بە بنچینەی بەرگریکردن لە دژی باوکسالاری دادەنێت، ئافرەتی لێسبیانیش پێناسە دەکات وەک ئافرەتێکی بەهێز کە توانیویەتی دەستبەرداری پیاو بێت لە لایەنی سێکسی و سۆزیەوە.

لە ئاکامی ئەو سەرەڕۆییە ژەندەریش پەیدا بوو کە بەپێی ئینساکلۆپیدیای بەریتانی: پێناسنامەی ژەندەری بریتیە لە هەستکردنی مرۆڤ بە خۆی وەک نێر یان مێ، کە لە زۆربەی حالەتەکاندا پێناسنامەی ژەندەری و تایبەتمەندییە جەستەییەکان تەبان، بەڵام لە هەندێک حاڵەتدا هەستی مرۆڤ کۆک و تەبا نییە لەگەڵ تایبەتمەندیە جەستەییەکان..

واتە تایبەتمەندیە جەستەییەکان جێگیرن بەڵام پێناسنامەی ژەندەری وتایبەتمەندییە جۆریەکان قابیلی گۆڕانن چونکە ڕەسەن نین، بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی دروست دەبن. یانی بۆی هەیە پیاو بیت حەزت لە هاوسەری کردنی پیاو بێت، یان هەر حەز بکەیت ببیتە ژن، یان بە پێچەوانەوە، هەر بۆیەش فێمنستێکی بەناوبانگی وەك ئەدریان ریچ لە وتارە بە ناوبانگەکەی Compulsory Heterosexuality and Lesbian Existence[٦] [مەیل بۆ ڕەگەزەکەی تر بە زۆرەملێیی و بوونی لێزبیانیزمی] ١٩٨٠ دژی Heterosexuality پەیوەندی و مەیلی سروشتی رەگەزی دروستی نێوان ژن و پیاو دەوەستێت و دەڵێت ئەو مەیلداریەی ژن بۆ پیاو سەپێندراوە بەسەر ئافرەت لەلایەن ڕژیمی باوکسالاریەوە، کە بەسروشتی و حەتمی دەیزانێت، لەڕێگای رۆمانە ڕۆمانسییەکان دەیچەسپێنێت، دەیەوێت مەیلداری بۆ لێزبیانیزمی و هاوڕەگەزی وەک لادانێك و ئینحرافێك نیشان بدات، دژی هەرجۆرە پەیوەندیەکی هاوڕەگەزی نێوان ئافرەتانە.

ئەمڕۆ فێمەنستە نەخوێندەوارەکانی کورد کە هەندێکیان هێشتا جیاوازی نێوان پیتی (ح و ع) ناکات بەو بیروڕایە سەرەڕۆیانە بەو خیتابە پڕ لە سوکایەتیە بۆ کۆی کلتوری کۆمەڵگاکەیان، بەو گیانە پڕ لە کێشەو ململانێ نێوان ژن و پیاو دەیانەوێت کێشەکانی ئافرەتی کورد چارەسەر بکەن، کە گوێیان بۆ دەگریت دەزانیت چەندە هەرزەکارانەو دەبەنگانە بەربونەتە گیانی ئەو ئافرەتە بەستەزمانانەی کورد کە گیریان خواردوە لە نێوان ستەمی

---

(٦)http://www.transasdocorpo.org.br/uploads/ed٠٠a٧٧٢٩٠ee٢٠٥d٣d٠f١٦a٩٧cf٥٤٦٢٨.pdf
Compulsory Heterosexuality and Lesbian Existence.

کۆمەڵگاو فشاری بەشێك لە نێوەندە ئاینیە توندڕەوەکان. لە نێوان ئەو خیتابە پلاستیکییە بێ روحەی کە نەك چارەسەری کێشەکانیان ناکات، بەڵکو کێشەکانیان قوڵتر دەکەنەوە لە ڕێگای ئەو خیتابە تەحریزییەو هاندەرەی بۆ ئافرەتەکان بۆ ڕوبەڕووبونەوە و تەحەداکردنی هەموو جۆرە بەهایەک، لەئەنجامیشدا کۆتایی هێنان بەکێشەکە بەبەکوشتدانی کچەکەیان بە ڕاکردنی بۆ پەناگەکانی ئافرەتان کە بەداخەوە بۆتە شوێنێکی مەشبوهـ و گومانلێکراو لێیەوە زۆربەی ئافرەتەکان بەرەو چارەنوسێکی خراپ دەبردرێن.

فێمنستێکی کورد بەناوی رێکپۆش عەزیز بۆ نمونە لەیەک چاوپێکەوتندا، داوا دەکات کورد هەمووی بن بە یەزیدی، گوایە دینێکی خۆماڵیەو ڕێگا بەپەیوەندی سێکسی کچ و کورانیان دەدەن پێش زەواج، باسی دوعای جوانەمەرگیش ناکات ئەو کچە یەزیدیەی لەسەر پەیوەندی لەگەڵ کوڕێکی موسڵمان بە درندانەترین شێوە کوژرا.

یان لە لاساییە فێمەنستە سەرەڕۆیەکانی وەک ئەدریان ریچ دەڵێت پەیوەندی سروشتی و دروستی نێوان ژن و پیاو سەپێندراو ئیجباریە و روانگەیەکی دیکاتۆریانەیە لە مەسەلەی سێکسدا.

"دوای ئەوەش مەسەلەی سێکس پەیوەندیەکی مرۆییەو مەرج نیە لە نێوان ژن و پیاوێکدا بێ heterosexualitet . ئەمرۆ پەیوەندیە سێکسیەکانی نێوان ژن و ژن Lesbisk پیاو و پیاو homosexuell هێندەی مەسەلەی هێترۆ سێکسوالیتت گرنگە، رەنگە بۆ هەندێ کەس مەسەلەی سێکس تەنها annoni لە رێی عادەی سریەوە بە ئۆرگاسم بگات، رەنگە ئەمە راستیەکی رەهای کۆمەڵگەی ئێمە بێت، کە مەسەلەی سێکس تەنها بە ژنێک و پیاوێکەوە دەبەستن. کە ئەمە هێترۆنۆرماتی heteronorm پێ دەڵێن مانای هەموو مرۆڤەکانی کۆمەڵگە بە زۆر و ئیجباری پەیوەندیە سێکسیەکانیان دەبێ لە نێوان ژن و پیاوێکدا بێت، کە لە راستیدا ئەمە روانگەیەکی دیکاتۆریانەیە لە مەسەلەی سێکسدا".

یان هەموو سنوری لۆژیک و ریزی بەرامبەر تێدەپەڕینێت کاتێ دەڵێت:"گەر ئێمە بزوتنەوەی راستەقینەی فێمێنیزممان هەبووایە دەبوو بەلۆری لەعابەی ئۆتۆماتیکی سێکسیان لەبەردەم پەرلەمانی کوردستان هەڵبرشتایە، چونکە یەکێک لە پاساوەکانی ئەوان بۆ مەسەلەی فرە ژنی ئەوەیە کە ژمارەی ژن زیاترە لەپیاو لە کوردستان گەر پێوانەی ژن بەپێی لێکدانەوەی پیاو بێت ئەوا زۆر لەعابەی سێکسی ئۆتۆماتیکی هەیە کە زۆر لەو پیاوانە باشترن بۆ ژن کە باوەریان بە فرە ژنی هەیە، رەنگە ژن لەرێی ئەو لەعابەیەوە باشتر بە پلەی ئۆرگاسم بگات، تا ئەو پیاوەی ژن دەکاتە کۆیلەی خۆی و لەشی بەکاردەهێنێ بۆ مەسەلەی سێکس".

لە سایتی وارڤین کلیپێك دانراوە بە ئینگلیزی کۆمەڵێك کچی ئەمریکی لەوسەر هاتووەوە هانی کچان دەدەن بۆ بەکارهێنانی جەستەیان بە پێی ئارەزووی خۆیان، زۆر بەزمانێکی تەحریزی و هاندانەوە دەڵێن:" ئەمە جەستەی خۆمە، چۆن مەوێ وەها بەکاریدەهێنم. خۆم کۆنترۆڵی منداڵبوونم دەکەم، ئەمە جەستەی خۆمە,,, هەر کەسێك کە خۆم مەوێ خۆشەویستی لەگەڵ دەکەم. لەگەڵ ئەو کەسە دەخەوم کە خۆم دەمەوێت... لەگەڵ کەسێك هاوسەرگیری دەکەم کە خۆم هەڵیدەبژێرم جا پیاو بێت یان ژن، ئەمە جەستەی خۆمە من بریار دەدەم هەر شتێک بچێتە ناو ئەندامی زاوێزێم و کەی؟!... لەسەر جەستەی خۆم تاتوو دەکەم، میکیاژ دەکەم، خۆم دەڕازێنمەوە. ئەمە جەستەی خۆمە. ئەمە جەستەی خۆمە. خۆم بڕیار لەسەر جەستەی خۆم دەدەم. بڕیاردان لەسەر جەستەی خۆم هیچ پەیوەندی بەتۆوە نییە. ئەمە جەستەی خۆمە، هی تۆ نییە[٧].

لە کۆمەڵگا پیاویش تا ئەو رادەیە ئازاد نییە لە بەکارهێنانی جەستەی بەبێ هیچ سنورێك و یاسایەك. لەو یادەدا پێویستە ئافرەتانی کوردستان بەو خیتابە سەرەڕۆیەی خۆیان دابچنەوە و کۆمەڵگا تەلەفزیۆنی تێکچوو نییە تا بە مست و شەق لێدان چاک ببێتەوە، لە جیاتی شەو رۆژ هێرش بکەنە سەر

---

(٧) http://warvin.org/Videod.aspx?=hewal&jmara=٣٠

چەمکی ناموس پەرستی و شەرەف، چاکترە هەوڵی تێگەیشتن لە قوڵایی ئەو چەمکانە بدەن، خەڵک بەو قسە پڕ لە سوکایەتیانە دەستبەرداری شەرەف نابن، بە بڕوای من چۆن کۆمۆنیزم نەیتوانی قەڵاچۆی ئیمان بکات لە دڵی ئیماندارن لە جیاتی خۆی ڕوخا، ئەوها فێمنیزمیش ناتوانێت قەڵاچۆی چەمکی شەرەف بکات کە بە قەد چەمکی باوەڕ بە خوا قوڵە لە ناخی هەموو جیهانی ئیسلامی بە کوردستانیشەوە، ئەو هەوڵانەش بە کۆتایی خۆی کۆتایی پێ دێت.

# لەگەڵ هەموو مافەکانی ئافرەتم دوور لە تیۆرەکانی فێمنیزمی رادیکالی[٨]

لەگەڵ هەموو مافەکانی ئافرەتم
دوور لە تیۆرەکانی فێمنیزمی رادیکالی

لە وەڵامی نوسینەکەم بە ناونیشانی لە لەیادی ٨ی مارس-دا.. بەڕاستی ئێوەش ناخۆشتان کردووە، کە لە ٢٠١٣/٣/٩ لە رۆژنامەی هاوڵاتی بڵاوکرایەوە، ئەو وتارە تەنها زەنگێکی ئاگادار کردنەوە بوو بۆ ئەو ئافرەتە فێمنستە ڕادیکاڵە توندڕەوانەی کە کۆمەڵگای کوردیان کردۆتە زبڵخانەی تیورە ئەفسانەیی وبێ سەروبەرەکانی فێمنستی ڕادیکاڵ، کە بەو پەڕی توندڕەوییەوە بەبیانووی بەرگریکردن لە ئافرەتی کورد بەربونەتە وێزەی گیانی کۆمەڵگا بە گشتی و ئافرەتی کورد بەتایبەتی. تەنها وتەیەك کە لە سەرەتادا دەمەوێت بڵێم ئەوەیە من هیچ ڕۆژێکیش لەبەرەی دژی مافەکانی ئافرەت نەبووم و نابم، ئەوانەشی دەمناسن دەزانن من بەر لە زیاتر لە ٢٠ ساڵ سەرقاڵی بابەتی مافەکانی ئافرەت بووم، سەدان و هەزاران ڕەخنەم گرتوە لە توندڕەوی ئایینی و کۆمەڵایەتی لە دژی ئافرەت و لەدژی کۆمەڵ بەگشتی. وەک چۆن نووسینەکەی من ڕووەو فێمنستە ڕادیکاڵەکان بوو، وادیارە زنجیرەك وەڵامی فێمنستە ڕادیکاڵەکانی بەدواوە هات، هەندێکیان راستەوخۆ وەڵامی من بوون وەک وەڵامەکەی بەڕێز رۆزا حسێن: کاتێک ماف لەگەڵ مەزاجی باودا نایەتەوە لە هاوڵاتی ٢٠١٣/٣/١٥، هەندێکی تریش ناڕاستەوخۆ..

بەلای من وەڵامەکەی بەڕێز رۆزا حسێن مەبەستە، چونکە راستەوخۆ وەڵامی منی داوەتەوە و وتارەکەشی نمونەی وتاری سەرەڕۆی فێمنیستێکی ڕادیکاڵی کوردە. ناونیشانی وەڵامەکەیشی هەر بۆخۆی نوکتەیە، چونکە ئەوە ماف نییە لەگەڵ مەزاجی باودا نایەتەوە، بەڵام [کاتێك جۆری مافە داواکراوەکان لەگەڵ واقیع و بوونی کۆمەڵگاداو سیستمی بەهایی و کۆنتێکستی ژیاری میللەتەکەمان نایەتەوە، کێشەکە لێرەدایە. کێشەکەش

(٨) هاوڵاتی ٢٠١٣/٤/٦

کێشەیەکی و جودیە، نەک مەزاجی] ئەوەش مانای ئەوەیە ئەو خیتابە فێمنستیە ڕادیکاڵە هێشتا نە لە بوون ونە لە واقیع ونە لە کۆنتێکستی ژیاری و بەڵکو نە لە مەزاجی باوشدا نەگەیشتوە.

## ئەنتی فێمنیزم و پرۆ فێمینیزم

وەک ئاکارێکی باوی نێوەندە فێمنستیەکان ئەوەی قسەکانی لەگەڵ تێزە سەپێنراوەکانی فێمنستە ڕادیکاڵەکان نەیەتەوە سەد نازناوی ئەنتی-فێمینزمی و کۆنسێرڤەتیڤ و شتی تری دەدەنە پاڵ وەک بەڕێز رۆزا حسێن، لەو وتارە ئەو ناو و ناتۆرانەی داوەتە پاڵم ودەڵێت:"ئەو وتارەی بەڕێز هەریری ژمارەیەکی زۆر لەو توخمانەی تیایە کە لەخیتابی دژەفیمینیزمی کۆنسەرڤاتیڤەکان لەهەموو دونیادا هەیە"، بەڵکو تاوانبارم دەکات بە هاندانی کوشتنی ژن، من کە ڕەخنە لە تێزە کاولکارەکانی فێمنستە ڕادیکاڵەکان دەگرم بۆ بەرگرتنە لەو خوێنە بە ناهەق ڕژاوەی ئافرەتان، یان هەر نەبێت هەوڵێکە لە پێناو کەمکردنەوەی ئەو تاوانانە، لەو بڕوایەشدام فێمستانی کورد هۆی سەرەکی کوشتنی ئافرەت نەبن و هۆکار زۆرن بەڵام وتاری هاندەری رادیکاڵەکان سوتەمەنی دەخاتە سەر ئاگرەکە، کێشەکە قوڵترو ئاڵۆزتر دەکاتەوە، دەکرێت بەڕێگای یاسایی و خەباتی مەدەنی و میانڕەوانەترو هێمنتر زۆربەی هەرە زۆری مافەکانی ئافرەت بەدەست بهێنرێن، بۆیە پێویستم بە بڕوانامەی فیمینستێکی ڕادیکاڵی سەرەڕۆی خۆرئاوایی نییە بۆ ئەوەی پۆڵێنم کات بە پرۆ فێمنیزم [دۆست و پاڵپشتی بۆ ئافرەتان]، یان ئەنتی فێمنیزم.

مەسەلەی تاوانبارکردنی خەڵکانی تر، بەڵکو فێمنستی گەورەو بەناوبانگیتر لەناو خودی فێمنزمەکان، بە ئەنتی فێمینزم واقیعێکەو زۆر بەچڕی پەیڕەو دەکرێت لە نێوەندی فێمنزمە ڕادیکالەکان و سێپەریستەکانە

[جوداخوازەکان][٩]. دەیان بیرمەندو نووسەری گەورەی ئافرەت و پیاو و هەتا فێمنستەکانی وەک کامیلی پاگلیا Camille Paglia ، کریستینا هۆف سۆمەرسChristina Hoff Sommers ، وجین بیتیک ئێلشتاین Jean Bethke Elshtain ، وئیلیزاپت فۆکسElizabeth Fox به مۆری ئەنتی فێمینزم مۆرکراون، زانایەکی گەورەو فێمنست دیاری بواری توێژینەوە فیمینزمیەکانی وەک دافنی پاتای Daphne Patai پێی وایە زاراوەی ئەنتی فێمینزم"anti-feminist" لەلایەن فێمنستە سەرەڕۆیەکان بەکار دێت بۆ بێدەنگ کردنی گفتوگۆی ئەکادیمی لەسەر تێزەکانی فێمنزم.[١٠]

## ئەوانی تر تەحریفین، هەر خۆمان نەبێت

وەك کۆمۆنیزمی پەنجاو شەست و حەفتاکان، وەک سەلەفیەکانی ئەو سەردەمە، فێمنستە ڕادیکاڵەکان هەمان میکانیزمی عەقڵیەتی تونڕەو پەیڕەو دەکەن، تەنها خۆیان لەسەر ڕاستەڕێ و فیرقەی ناجیەن. فێمنستە ڕادیکاڵەکان وەک هەر ئایدیۆلۆژیەکی توندڕەو و شمولی هیچ لە فێمنیزم و ژنانی تریان قبوڵ نییە لە فێمنستە لیبڕاڵەکان و فێمنستە ئاینیەکان، بەڵکو کار بەوە دەگات لەناو خودی ڕادیکاڵەکان یەکتری تاوانبار دەکەن بە لادەری و تەحریفیەت. بۆیە رۆزا حسێن لە وەڵام بە تەورەیەکی هەفتەنامەیدا لە پاش ڕەخنەگرتن لە ژنانی فێمنستی ترو رێکخراوەکانی ئافرەتانی ناو حزبە عەلمانیەکان، کە دێتە سەر خوشکانی یەکگرتوو و ئافرەتانی تری ئیسلامی زۆر بە تەوس و تانەو بێڕیزییەوە بە حەپۆل وەسفیان دەکات و دەڵێت:

"لە پرسیارەکەدا ناوی "خوشکان" هاتووە. بەمەش دیارە مەبەست لە ڕێکخراوە ژنانییە ئیسلامییەکان، یان بە دیاریکراویی مەبەست لە

---

[٩] - فێمنستە سێپەرەستەکان [جوداخوازەکان، ئەوانەی داوای گۆشەگیری سەرتاسەری ژنان دەکەن لەگەڵ پیاوان، هیچ پەیوەندیەک لە نێوانیان نەمێنێت نە زەواج و نە سێکس و نە هاوڕێیەتی لە کار وەک جەماعەتی تەکفیر و هیجرەی ئیسلامیە توندرەوەکان].

[١٠] - Daphne Patai and Noretta Koertge argue that in this way the term "anti-feminist" is used to silence academic debate about feminism.

(یەکگرتووی خوشکانی ئیسلامیی کوردستان)ـە. گەر وایە، ئەوا سەرباری ئەو ڕایە سەلبییەی سەرەوەم سەبارەت ڕێکخراوە ژنانییەکانی سەر بە حیزبە عەلمانییەکان، پێم وایە غەدرێکە لەو ڕێکخراوانە ئاوا ناویان لەگەڵ ناوی ڕێکخراوە ژنانییە ئیسلامییەکاندا بێنین و بپرسین ئەمانە هەموو چی بکەن باشە بۆ مەسەلەی ژنان، چونکە بە حەقیقەت ڕێکخراوە ژنانییەکانی حیزبە ئیسلامییەکان لەسەنگەری دژدان و باشە و ماشەیان بۆ مەسەلەی ژنان پێ نییە. ئاخر ئەوان هەر حیکمەتی دروستبوونیان بۆ خراپەکردن بەرامبەر بە دۆزی ژنانە نەک کردنی کاری"باش" بۆی. خۆ ڕاستە ئەندامەکانی ئەوانیش خۆیان ژنن، بەڵام حاڵەتی ئەمان وەک حاڵەتی ژنانی ناو ڕێکخراوە ژنانییەکانی حیزبە عەلمانییەکانیش نییە کە بۆ حیزبایەتیی کردن ڕێکخراویان دامەزراندووە نەک بۆ دۆزی ژن، بەڵکو ئەمان کۆمەڵێک ژنن حەپۆل حەپۆل هاتوون خەبات بۆ ئەوە ئەکەن کە ژنان و پیاوان دەبێت بەو شێوەیە یەکسان بن کە لە ئیسلامدا هاتووە! بە مانایەکی تر، سیاسەت و گوتاری یەکسانییخوازانەی ئەو "خوشک"ـە عەزیزانە قسەیەکی عەنتیکەی لەم بابەتەیە: "پیاوان یەکسانترن لە ژنان".

ئەوە جارێ جەهلێکی مورەکەبە بە ئیسلام و بەکێشەی ئافرەتانی موسڵمان، تێڕوانینێکی کۆڵۆنیاڵ ئاسای ژنانی فێمینزمی سپی خۆرئاوایە دەرهەق بە ئافرەتانی موسڵمان و کێشەکانیان، بەڵام پلەیەک لە سەروترە لەو وتارە خۆرئاوایەی کە لاسایی دەکاتەوە، دڵ ڕەقانە ترەو بێ زەوقترە لە بەکارهێنانی زمانێکی زبری پڕ تانەو تەشەر لە گاڵتە کردن بەو خوشکانەو کێشەکانیان. بەڕاستی وتاری فێمینزمی خۆرئاوایی زۆر نەرمترو بابەتیترو ئاسۆ کراوەترە لە کاتی ئاڕاستەکردن قسە بۆ ئافرەتانی موسڵمان. ئەوەی ڕۆزا و دەستەخوشکانی نازانن ئەوەیە کە ئافرەتی موسڵمان بە گشتی و ئیسلامی بە تایبەتی ئەرکی سەرشانیان زۆر لەوان قورسترەو کێشەی هەقیقی و واقیعیان زۆر لەوان زیاترە، چونکە ئافرەتانی موسڵمان ڕووبەڕووی دەیان دەق و کلتوری بە پیرۆزکراو و هەزاران بواری فیقهی ئیسلامی و داب و نەریتی نادروست دەبنەوە، بۆ بەدەستهێنانەوەی ماف و کەرامەتی پێشێلکراویان لەناو خودی چوارچێوەی ئیسلام و کلتورەکەی وک ۆمەڵگەکەی. کاریگەری

ئافرەتانی موسڵمان بۆ گۆڕینی باری نالەباری ئافرەتان زۆر بە هێزترە، لە فێمنزمێکی ڕادیکاڵی کە لە بنەڕەتدا هیچ حسابێك بۆ بەها گرنگ و ئایینیەکانی خەڵک ناکەن، بۆیە زۆربەی خەڵکیش هیچ حسابێك بۆ بۆچونە سەرەرۆیەکانی ئەوان ناکەن. چونکە لە بنەڕەتدا فێمنیزم جۆرێکە لەگەڕانەوە بۆ پەیگەنیزم [وەسەنیەت] وەک فێمنستیکی بەناوبانگی وەک نائۆمی گۆڵدنبێرگ Naomi R. Goldenberg لە کتێبی: گۆڕینی خوداکان، فێمینزم و کۆتایی ئایینە ترادیشنەڵەکان Changing of the Gods: Feminism and the End of Traditional Religions زۆر ڕاشکاوانە گوزارشی لێدەکات و دەڵێت: "بەڕای من خوا لە ئایندەدا دەگۆڕێت، ئێمەی ئافرەت کۆتایی بە خودا دەهێنین. لە ڕێگای بەدەست هێنانی پایە لە حکومەتەکان و پزیشکی و یاسا و کاروبار و هونەر لەکۆتاییدا لە ئاییندا، ئێمە لە کۆتایی دەبینە کۆتایی ئەو، ئێمە جیهان دەگۆڕین بە جۆرێك و بەڕادەیەك هیچیتر گونجاو نەبێت بۆ ئەو. We will be the end of Him. We will change the world so much that He won't fit in anymore'"

ئەو ڕاناوە [Him] هەم مەبەست خودایەو هەمیش مەبەستی پیاوە چونکە بەپێی بۆچونی فێمنستەکان:

" ئەگەر خودا نێر بێت، کەوابوو نێر خودایە"١١ "If God is male, then the male is God" ئەوەش هەمووی بە بیانووی ئەوەی خواکانی بەرایی هەمووی مێ بوون وەک چۆن ئەلیزابس گۆڵد دەیڤس لە کتێبی [ڕەگەزی یەکەمدا] The First Sex باسی دەکات، نەوال سەعداویش و زۆر لە فێمنستەکانی کورد دووبارەی دەکەنەوە.

هەر دەرهەق بە فێمنیزمی ئیسلامی مۆنیکا بۆباکۆ، فێمنستی پۆڵۆنی ناودار دەڵێت لە خۆرئاوا چەندین دەنگی فێمنزمی ناودار بەرزبۆتەوە وەک

---

١١- Mary Daly, *Beyond God the Father*, p. ٩

سابا مەحمود[١٢] Saba Mahmood و رۆزی برایدۆتی Rosi Braidotti و جۆدیس بەتلەر Judith Butler لە پێناو ڕێزگرتن و سەرلەنوێ بیرکردنەوە لە هەڵوێستەکانی بزوتنەوە فێمنزمیەکان لە ئایین. داوا دەکات کە رێز لە خەباتی فێمنستە ئیسلامیەکان بگیرێت و لەروانگەی ئیسلاموۆفۆبیا و کۆلۆنیالیانە نەڕواننە ئەو ئافرەتە موسلمانانە. کەچی بەریز رۆزا حسێن بە حەپۆل وەسفیان دەکات.

من بە بەردەوامی لەدژی توندرەوی هەڵوێستم وەرگرتوە، جا ئەو توندرەویە ئایینی بێت یان ئایدیۆلۆژی، یان سیاسی، یان فێمینزمی یان هەر توندڕەویەکی تر. کێشەی فێمنستی ڕادیکاڵی ئەوەیە، هێندە بەکینەو توندڕەوانەوە قسەدەکات نەك لە ناو کۆمەڵگای پاتریارکی، بەڵکو لەناو خودی فێمنستەکانی تریش دۆستێکی نییە. ئەو لۆژیکی تەخوین کردنەو تاوانبارکردنی هەموو کەون و کائینات بە ئەنتی-فێمینزمیش هەر لەگەڵ ئەدەبیاتی زۆرانبازێ و کێشمەکێشی چینەکانی تیوری مارکسیزم هاتۆتە ناو فێمنستی ڕادیکاڵ. خەڵکی دژایەتیشی بکەن ئەوە دژی ئەو فیمینزمە ڕادیکاڵە توندرەوەن کەهیچ سنورێك نیە بۆ وەستانیان لە تێکدان، تێکدانی خێزان، پەیوەندی نێر و مێ بەگشتی، تێکدانی ئاینەکان و بەهاکان بەبیانووی ئەوەی دەزگای پەترپارکین. دەربارەی تێکدانی پەیوەندی ئافرەت و پیاو دەیان کتێب لەلایەن خودی فێمنستەکان نووسراوە، لە کتێبێکی نایابدا بە ناوی Spreading Misandry and Legalizing Misandry ، بڵاوکردنەوە و شەرعاندنی ڕق لە دژی پیاو، پۆل ناتان و کاترین یۆنگ پێیان وایە فێمنستە ڕادیکاڵەکان بەشێوەیەکی ئاکتیڤانە هەڵدەستن بە بڵاوکردنەوەی misandry

---

١٢ - Politics of Piety: The Islamic Revival and the Feminist Subject (٢٠٠٥) ، The Islamic Revival and the Feminist Subject

سابا مەحمود تەنها ناوی دووەمی ئیسلامە، چونکە فێمنستەکانمان باوەر بەو ناوە ئیسلامانە زۆرنەکەن، دەنا نوسەریکی خۆرئاوایی بەناوبانگە وەک لەیلا ئەحمەد، لە بواری توێژینەوەی ئەنترۆپۆلۆژی وفێمینیزم، خەڵاتی ئەکسل سپرینگەر بەرلینی وەرگرت لە ئەکادیمیای ئەمریکی لە بەرلین، هەروەها خەڵاتی ڤیکتۆریا شوك لە لایەن American Political Science Association.

**ڕق لە دژی پیاو لەناو ئافرەتاندا، کە لە کاردانەوە misogyny ڕق لە دژی ئافرەت دێتە ئاراوە.**

**لەوەش خراپتر فێمنستێکی میانڕەوی وەک کرستینا هۆف سۆمەرس لە کتێبێکی زۆر گرنگدا بەناوی: کێ فێمنزمی زەوت کردوە؟ چۆن ئافرەت خیانەتی لە ئافرەت کرد Who Stole Feminism: How Women Have Betrayed Women. دەڵێت: میسئەندری یان ڕق لە دژی پیاو ڕاستەوخۆ" فێمنستە دامەزراوەکان" بەرەو میسئۆگنی یان ڕق لە دژی [زۆربەی] ئافرەت دەبات کە حەزیان لە پیاوە." چونکە ئەو فێمنستە رادیکاڵانە وەک کەسانێکی لاواز دەڕوانئە ئەو ژنانەی خوازیاری پەیوەندیەکی دروستن لەگەڵ پیاودا، بۆیە پێمان وایە چارەنوسی هەر فێمنستێکی ڕادیکاڵ بەرەو لێزبیانیەتی سێکسییە یان لێزبیانەتی سیاسی یە Political lesbianism [١٣].**

**کەوابوو فێمنستی ڕادیکاڵی توندرەو هەر بە دژایەتی کردنی پیاویش ناوەستێت، بەڵکو دژی ئەو ژنانەشن کە زۆربەی هەر زۆر پێك دەهێنن کە لەگەڵ هیترۆسیکچوالیتین، واتە پەیوەندی ئاسایی نێر و مێ. هەر بۆیەش Daphne Patai دافنی پاتای تاوانباری فێمنزمی رادیکالی دەکات بە هیترۆفۆبیا"heterophobia" [رق لە پەیوەندی سروشتی نێر و مێ] پێیوایە هەوڵدەدات پەیوەندی نێوان ژنان و پیاوان ژەهراوی بکەن [١٤].**

---

١٣- لێزبیانەتی سیاسی political lesbians: ئەوەش جۆرێکە لە لێزبیانەتی کە ئەو ئافرەتانە ناچنە پەیوەندی سێکسی هەقیقیەوە لەگەڵ ئافرەتانی تر، تەنها بەبێ ئەنجامدانی سێکس دەژین، ببەەلام پشتگیری لێزبیانەتی دەکەن وپەسندی دەکەن لەسەر پەیوەندی دروستی ژن وپیاو یان هیترۆسێکچواڵیتی، وچەند ستایلی ژیان وەردەگرن وەک قژی کورت، وجینز لەبەرکردن وکراسی چوارکۆشە لەبەرکردن وبوتی کار لەبەرکردن، وەک ئاماژە بۆ رەتکردنەوەی مێیاتی. Bindel, Julie (٢٧ ، March ٢٠٠٤). "Location, location, orientation". *The Guardian*. Wikipedia بە دەستکاریەوە.

١٤ - *Heterophobia: Sexual Harassment and the Future of Feminism*١٩٩٨.

# ئەکادیمیەت و فێمنزم

سەیرە لە کاتێکدا فێمنیزم لەلایەن نووسەرو بیرمەندو فێمنستی گەورەو ناودار تۆمەتبار دەکرێن بە نائەکادیمیەت و شێواندنی هەقیقەتی زانستی وەک فێمنست و زانایەکی گەورەی ئەو بوارە Daphne Patai دافنی پاتای پێی وایە زاراوەی ئەنتی فێمینزم "anti-feminist" لەلایەن فێمنستە سەرەرۆیەکان بەکاردێن بۆ بێدەنگــکردنی گفتوگۆی ئەکادیمیە لەسەر تێزەکانی فێمنزم. هەروەها لە کتێبی (١٩٩٤) Professing Feminism دەڵێت ئەو وا هەست دەکات کە توێژینەوەکانی فیمینزم ناگونجێن لەگەڵ بنەماکانی زانستی و توێژینەوەی بابەتی و ئەکادیمی، چونکە لەسەرووی هەموو شتێکەوە چەپاندنی زانستە لە پێناو ئامانجی سیاسیدا.

کەچی ئەوەی زۆر سەیرم پێدێت ئەوەیە رۆزا حسێن لە وتارەکەیدا زۆر تەئکید دەکاتەوە لەسەر نا ئەکادیمیەتی من لە وتارەکەدا، " وتارەکەیان هیچ قیمەتێکی ئەکادیمی نییە..."، "هەوڵدەدات لەسەر حیسابی رەچاونەکردنی ئەخلاقی ئەکادیمی" لە کاتێکدا خۆی لە وتارەکەیدا وەك ژنە جەنگاوەرە ئەفسانەییەکانی ئەمازۆن ڕاست و چۆپ بەدترین و دزێوترین وشەو دەربڕین بەکاردەهێنێت لە دژی من و وتارەکەمدا. جا کەمن ئەکادیمی نەبووم، هەرچەندە من لە زانکۆکانی بەریتانیا فێری ئەکادیمیەت بووم، بەڵام دەبوایە ڕۆزا حسێن کە باسی ئەکادیمیەت دەکات ئەو دەستەواژە [ئەکادیمیانەی] بەکار نەهێنابا:"دەستەواژەی زلی وەک...." ، " واوەیلاکردن بۆ خەتەرناکی فیمینیزم" ، " ئەم جۆرە «شیوە نەوتارانە»دا" ، " لە ئیدیعا زلەکانی.." ، " دەبێت بێشەرمانەترینیان بێت." چیماوە لە وشەی دزێو لەو وتارە [ئەکادیمیەی] رۆزا حسێن نەوترابێت؟ ڕۆزا حسێن هێندە توڕە بوون و هەڵچوونی پێوە دیارە لەو وەڵامەیدا، چونکە ئەوان عەیامێکە دەنووسن بێئەوەی نووسەرێکی پیاو یان ئافرەتێکی دیاری بوارەکە لێیان بێنە وەڵام، لە ترسی تۆمەتی باوکسالاری و پەتریارکیەتی، رۆشنبیرێکی زۆر ماستاو سالاریان بۆ دەکەن.

# نیشتیمان پەروەری لە تەرازووی فێمینزمی کۆلۆنیالیزمیدا

ڕۆزا حسێن دەڵێت:"فیمینیستەکان چاک دەزانن کە خەڵکانێکی بێئەندازە زۆر هەن، چی لە وڵاتە ڕۆژهەڵاتییەکان و چی لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکانیشدا" ناڕازین لە وتاریان، بەڵام لەبەر پاوانکردنی هەقیقەتی ئایدیۆلۆژی گرنگ نیە کە زۆربە لە دژییان بن، چونکە بیرێك سەرچاوە لە فەلسەفەیەکی شمولی وەك کۆمۆنیزم بگرێت، گوێ ناداتە زۆربەی خەڵک، بۆیە بەڕێز ڕۆزا حسێن دەیەوێت بەناوی جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ و دەسەڵاتە کۆلۆنیالیەکان هەڕەشەمان لێ بکات گوایە فەرمایشتەکانی ئەو لەشکرە زۆر و زەبەندەی فێمنستی کورد واجبی تەنفیزن بەخۆشی و بەترشی بێت، وەك هەمان خیتابی کۆلۆنیالی بەرامبەر گەلانی چەوساوە. دەشڵێت: " ئەم خەباتەیە کە پێیدەگوترێت "فیمینیزم". بۆیە ئەوەی کە فیمینیزم لەگەڵ زەوق و مەزاجی کەسانێکدا نایەتەوە، کەیفی خۆیانەو دەبێت ئەوەیان لێ تێبگەیەنرێت کە فیمینزم مەسەلەی مافی مرۆڤە نەک مەسەلەی زەوق و مەزاجی زۆربە".

ئەو خاتوونە بەساویلکەیەکی زۆرەوە ئەو پرسیارە دەکات:"بۆ نموونە بەڕێز هەریریو ئەوانەی ئەم جۆرە رێتۆریکە بەناوی رەخنەوە دەنووسن، بەئەرکی خۆیانی نازانن ئارگیومێنتێک بەدوای ئەوەدا بێنن کە ئایا ئەمە چۆن «قامچیکردنی میللەتی کورد»ەو، بەچی میکانیکیەتێک «تەدمیری کۆمەڵگا» دەکاتو، ئایا فیمینیستەکان خۆیان لەم رووەوە را و تەبریریان چیەو بۆچی پێیانوایە هیچ تەدمیر ناکاتو، ئایا رای نووسەر لەسەر ئەو را و تەبریرانەی فیمینیستەکان چیە".

لەوەڵامی بەشی یەکەمی ئەو پرسیارە بە نسبەت قامچیکردنی میللەتی کورد، بەسە بۆ ئەوەی بزانن لە ئەوروپا ئەگەر کوردێکی تورکیا یان ئێران یان عێراق یان سوریا شتیکی باش بکەن بەناوی وڵاتە داگیرکەرەکانی بڵاودەبێتەوە، بەڵام ئەگەر کوردێك ژنێکی کوشت هەتا کوردیش نەزانێت و یەک تۆزقاڵ هەستی نەتەوەیی کوردیشی نەبێت، فێمنستەکانی کورد

بنەچەکەی دەردەکەن، بە هەموو میدیای سویدو بەهەشتەکانی تری فێمنیزمی ڕادیکاڵ رادەگەیەنن کە ئەو ژن کوژە کورد بوو، کورد میللەتێکی ژن کوژە! ئەوە لەکاتێکدا هیچ فێمنستێکی هەتا ڕادیکاڵی نەتەوەکانی ترمان نەدیوە بەرادەی فێمنستە ڕادیکاڵەکانی کورد نەتەوەی خۆیان بەو شێوەیە بشێوێنن. لێدوانەکانیان لەو بارەیەوە زۆرن. ئەوە لە کاتێکدا کورد لە هەموو ئەو میللەتانە باری لاوازترە لە ڕووی سیاسی و مێژووییەوە، شێواندنی نەتەوەش لای خەڵکی ئەوروپا گەیاندنی مێسەجێکی نێگەتیڤە، بە عەقڵیەتی سێنترالیزمی خۆرئاوایی کە لە بنەڕەتدا بە سوک تەماشا گەلانی دەرەوەی خۆرئاوا دەکات، ئەو جۆرە مێسەجە زیاتر ئەو تێروانینە سوکە بۆ کورد قوڵتر دەکاتەوە.

فێمنستە ڕادیکاڵەکانی کورد هیچ ڕوحێکی ڕەخنەیی و هیچ هەستێکی نیشتیمان پەروەری و نەتەوەیی و ئاینیان لا بەدی ناکرێت، کاتێك بەرخورد لەگەڵ دەقەکانی فێمنزمی خۆرئاوادا دەکات، هەمان داواکانی ئەوان، هەمان وتاری دژە بەهاکانی کۆمەڵ و هەمان پەیگەنیزم و وەسەنیەت بەرهەم دەهێنێتەوە، فێمنستی کوردیش لەسەر بنچینەی وەسەنیەت رەفتار دەکات لەگەڵ ئافرەتی کورد وەک بلێی کائینێکی داماڵراوە لە هەموو بەهایەکی ئایینی و کۆمەڵایەتی، هەموو تابۆکانی بە ئاسانترین شێوە تێکدەشکێنێت، هەمان وتاری ڕادیکاڵی خۆرئاوایی کۆپی دەکاتەوە. فێمنستێکی زۆری وڵاتانی تر هەستیان بە ترسناکی ئەو وتارە کۆلۆنیالزمە بەرزەفڕەی فێمنستی سپی خۆرئاوا کردوە، زۆر وشیارانەو بوێرانە کەوتونەتە رەخنەکردنێکی هۆشیارانە بۆ تێڕوانینی کۆلۆنیالیانەی فێمینزمی خۆرئاوا، لەوانەش نیما ناغیبی (Nima Naghibi) کە زۆر بەتوندی رەخنە لە وێنا کردنی ئافرەتانی موسڵمان دەگرێت، لە ئەندێشەی فێمینزمی خۆرئاوایی وەک کەسانێکی چەپێنراو و دواکەوتوو، کە ژنانی سپی بە وتارێکی تەبشیری کۆلۆنیالیەوە، هەوڵی رزگار کردنیان دەدەن وەک [ئەنتوانیت بیرتۆن] دەڵێت لە ڕێگای گەیاندنی روناکی مەسیح بە ئافرەتانی ژێر چەپۆکی ئیسلام. ئەو وتارە تەبشیریە هێشتا کاریگەرە لەو هەڵمەتانەی ئافرەتانی خۆرئاوا پێی هەڵدەستن لە پێناو ئازادکردنی ئافرەتانی موسڵمان لە زیندانی حیجابی

ئیسلامیان، نیما ناغیبی پێی وایە کە وتاری فێمنزمی خۆرئاوایی بە تایبەتی لە شەپۆلی دووەمی فێمنزمدا هەڵدێراوە لە جەخت کردن لەسەر خوشکایەتی جیهانیەوە بۆ سازدانی پەیوەندیەکی پلەداری تێیدا ئافرەتی خۆرئاوایی باڵاترین پایە داگیردەکات وەک نمونەیەکی باڵا بۆ ئافرەتانی سەر بە ئایین و کلتورەکانی تر، بە تایبەتیش ئافرەتانی موسڵمان(١٥) .

شاندرا موهانتی، فێمنستی هیندی بەناوبانگ، لە وتارێکی زۆر گرنگ بەناوی:توێژینەوە فێمنیزمیەکان و وتاری کۆلۆنیالی Feminist Scholarship and Colonial Discourses پێیوایە کە وتاری فێمنزمی خۆرئاوایی جۆرێک لە کۆلۆنیالیزمیەت و دادۆشین پەیرەو دەکات لە دژی ژنانی جیهانی سێیەم و بەتایبەتی ژنانی جیهانی ئیسلام.

فالیری ئامۆس و براتیبا بارما لە ١٩٨٤ وتارێکی گرنگیان نوسیوە تێیدا جەختدەکەنەوە لەسەر ئەوەی کە ئەو توێژینەوانەی لەسەر ئافرەتانی جیهانی سێهەم کە لەلایەن ئافرەتی سپی خۆرئاوایی ئەنجامدەدرێت، لەبنەڕەتدا توێژینەوەی ئیمپریاڵی و کۆلۆنیالین.

هەروەها لەیلا ئەحمەد کە نووسەرێکی فێمنزمی ئەمریکیە، دەیان توێژینەوەی ئەکادیمی هەیە لە بواری فێمێنیزم و دەیان خەڵاتیشی وەرگرتوە، لەبنەرەتدا خەڵکی میسرە، وتارێکی بەهێزی لەو بارەیەوە نووسیوە، بە ناوی [ئیسنۆسێنترالیزمی خۆرئاوایی و بۆچونەکانی حەریم] ١٦ تێیدا ڕەخنەیەکی توندی لە توێژینەوەکانی فێمنیزمی خۆرئاوایی گرتوە دەربارەی ئافرەتی موسڵمان، تێیدا جەخت دەکاتەوە کە ئافرەتانی خۆرئاواو ئەمریکاییەکان بە تایبەتی، پایەی [ناسینی] ئافرەتانی موسڵمانان و

---

١٥ - لدراسات النسائية/دراسات الجندر، نيما ناغيبي ترجمة: هالة كمال (Nima Naghibi)
http://sjoseph.ucdavis.edu/ewic/assets/unfiled/V١arabicparted/women_gender_studies.pdf/view

١٦ - (Leila Ahmed, "Western Ethnocentrism and Perceptions of the Harem",١٩٨٢ )

هەقیقەتی چەوساندنەوەیانیان داگیرو پاوان کردوە. مەسەلەی ژیانی ملکەچی و بەندکراوی ئافرەتانی موسڵمانان لای ئەوان ڕاستیەکی قابیل بەگفتوگۆ نیە لە توێژینەوەکانی ئەوان، هەرچەندە هەوڵێکی زۆر کەم دراوە بۆ تێگەیشتنێکی گشتگیری فەرهەنگ و داب و نەریت و کلتوری جیهانی ئیسلامی. هەروەها لەیلا ئەحمەد پێیوایە کە ئەو زمانەی فێمنیزم بەکاریدەهێنا کە ببووە هۆی دژایەتیکردنی پیاوانی بەریتانیا، هەر هەمان زمان بوو کە بەکاردەهێنرا لە ڕاژەی پڕۆژەی کۆلۆنیالیزم لە دەرەوە. بۆ نمونە لۆرد کرۆمەر کە لە دامەزرێنەرو سەرۆکی پەیوەندی پیاوان لە دژی مافی ئافرەت لە دەنگدان و خۆ کاندیدکردن بوو لە ئینگلیستان، لە میسر لە هەموو کەس زیاتر لێدوانی دەدا دەربارەی پشتگیری کردنی ئازادبوونی ئافرەتانی میسر لە حیجاب پۆشین و بەدەستهینانی مافە سیاسیەکانی تر.

مارنیا لەزرەقی جەزائیریش بە هەمان شێوە لەو لوتبەرزی و تەعالیەی فێمنیزمی خۆرئاوا هاتۆتە وەڵام لە کتێبێك بە ناونیشانی: بەلاغەتی بێدەنگی: ئافرەتانی جەزائیر لەبەردەم لێپرسینەوەدان :The Eloquence of Silence: Algerian Women in Question ١٩٩٤) ڕەخنەیەکی توند ئاراستەی پۆلێن کردنی دەستە و پۆلی ژنان دەکات وەک [ئافرەتانی موسڵمانان] و [ئافرەتانی خۆرهەلاتی ناوەڕاست] دەڵێت ئەو ئاڕاستەی فێمینزمی خۆرئاوایی بۆ پۆلێن کردن و کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆری ئافرەتان لەجۆرەها نەتەوەو میللەت سەرەڕای جیاوازی ئایینی و فەرهەنگیان لەیەک سەبەتەدا خۆی لە خۆیدا ئاماژەیەکی موتەعالی و بەرزەفرانەیە پێویستە وتاری فێمینزمی خۆرئاوایی خۆی لێ بە دور بگرێت.

لەشکری فێمینزمی خۆرئاوایی کوردیش وەك بڵێی لەسەرەتای مێژودا دەژێت ئەو وتارە موتەعالی و بەرزەفرەو کۆلۆنیالی و تەبشیریەی فێمینزمی خۆرئاوایی وەك خۆی دەیهێنێت و دەیدات بە گوێمان، توندڕەویەکی زیاترو زمان زبریەکی زیاتریشی دەخاتە سەر بەبێ ڕەچاوکردنی نە میللەت و نە مێژوو و نە بەهاکانمان و نە ئاینمان و نە کلتورمان، وەك بڵێی کۆمەڵگای کوردی کاغەزێکی سپیە ئەوان بە کەیفی خۆیان چیرۆکەکەی دەنوسنەوە.

لە وەڵامی بەشی دووەمی پرسیارەکەی: " بەچی میکانیکیەتێک «تەدمیری کۆمەڵگا» دەکاتو، ئایا فیمینیستەکان خۆیان لەم رووەوە ڕاو تەبریریان چیەو بۆچی پێیانوایە هیچ تەدمیر ناکاتو، ئایا رای نووسەر لەسەر ئەو را و تەبریرانەی فیمینیستەکان چیە".

بیرمەندی گەورەی میسر، دکتۆر عەبدلوەهاب مسیری لە کتێبی: رحلتي الفكرية في البذور والجذور والثمر، شتێکی زۆر سەرنج ڕاکێشەر دەگێڕێتەوە، دەڵێت، خەریکی تەماشاکردنی فیلمێکی ئینگلیزی بووم، ژنەکە خەریکی خیانەتکردن بوو لەگەڵ برادەری مێردەکەی، هێشتا تەواو نەبوبوون کە مێردی ژنەکە پەیوەندی دەکات بە ژنەکە بە تەلەفۆن، ژنەکە زۆر بە ئاسایی وەڵامی دەداتەوەو پێی دەڵێت کەوا برادەرەکەی ئێستا لەگەڵیەتی لەسەر جێگا، داوای لێدەکات قسەی لەگەڵدا بکات، پاش کۆتایی پەیوەندیەکە، کابرای دۆستی ژنەکە بەپەلە پرۆزکێ خەریکی جل لەبەرکردنەوەیە بۆ ئەوەی بەخێرایی بڕوات، ژنەکە لێی دەپرسێت بۆ وا بە پەلەی هیچ کێشەیەك هەیە، کابرا دەڵێت کێشەکەم ئەوەیە کە هیچ کێشەیەک نیە لەلای تۆ the problem is that there is no problem کێشەکەم ئەو هەموو خوێن ساردیەی تۆیە، ئەو بێلایەنیە ڕەوشتیەو ترسناکەی تۆیە.

رۆزا حسێن و فێمنستە ڕادیکاڵەکانی تری کورد هیچ کێشەیەکیان نیە لە نەمان و لەناوبردنی هەموو بەهایەکی ئایینی و کۆمەڵایەتی، چونکە بەلای ئەو ڕادیکاڵانە ئەو بەهایانە هەمووی بەرهەمی باوکسالاری و پاتریارکیەتن، کێشە نیە خێزان نەمێنێت، شتێك نیە پەیوەستی ژنان بکات بە زەواج لەگەڵ پیاو وەك رێکپۆش عزیز دەڵێت، لەوانەیە حەزی لێبێت لەگەڵ ئافرەتێکی تر زەواج بکات...گرنگ نییە تەجاوزی هەموو بەهایەکی خەڵک بکرێت، چونکە لە بنەڕەتدا فێمنستی زادەی فەلسەفەیەکی ئیلحادیەو ئیلحادیش لە دەرەنجامی کۆتاییدا دان بە بوونی خێزان و دایکایەتی نانێت، ئەو منداڵانەی لە ئەنجامی پەیوەندیە سێکسیەکان لە دایك دەبن دەخرێنە بەر دەزگا تایبەتیەکانی دەوڵەت، لە سۆڤیەت هەوڵێکی زۆر درا لەو بارەیەوە بەڵام نوشوستیەکی گەورەی هێنا.

ئەو خیتابەی فێمنیزمی ڕادیکاڵ بەدژایەتی کردنی خێزانی کوردو لەناوبردنی بەها خێزانیەکان تەدمیری کۆمەڵگای کوردی دەکات، باوکانی کۆمۆنیزم کە باوکی ڕۆحی فێمنیزمی ڕادیکاڵین زۆریان گوتوە دەربارەی پێویستی لەناوبردنی خێزان و هەڵوەشاندنەوەی، بەخێوکردنی منداڵ لەلایەن دەوڵەتەوە، سیمون دی بوڤواریش کە زۆربەی نووسەران بە دامەزرێنەری یەکەمی فێمنیزمی ڕادیکاڵی دەزانن بە راشکاوی دەڵێت: ئافرەت هەر بەکۆیلەیی دەمێنێتەوە هەتا خورافەتی خێزان لەناو دەبردرێت.

خێزان بەوە تەدمیر دەبێت کە تۆ دەڵێی من ئازادم جەستەم هەرچۆنێك بەکاربهێنم و لە هەر کاتێك بمەوێ لەگەڵ هەر یەکێك بخەوم و سێکسی لەگەڵ بکەم جا لەگەڵ پیاو بێت یا ژن، واتە وەك تیۆری مانگا بەپێی وتەی فێمنستی ئێتێیستی بە ناوبانگ مارلین مۆرای کە تیۆری سێکس کردن لەگەڵ هەر کەسێك و هەر کاتێکی لەسەر شێوازی مانگای داهێنا.

ئەوە ئەو بیرۆکانەیە کە ئێوە لە کوردستان بانگەشەی بۆ دەکەن، کەچی هێشتا ڕۆزا حسێن بە ڕاکانی من دەڵێت:"بەڵام من پێموایە ئەم رایەی هەریری تائێستا لەناو هەموو ئەو رایانەی خەڵکی دواکەوتوو و کۆنسەرڤاتیڤی کۆمەڵگای کوردیدا، دەبێت بێشەرمانەترینیان بێت... وترابێت."

من ڕەخنەم لە ئازادی سێکسی بێ سنور گرتوە کە ئێوە بانگەشەی بۆ دەکەن لە ڕێگای نووسین و ڤیدیۆی ئافرەتانی خۆرئاوایی و ئەمریکی...

من ڕەخنەم لە بڵاوکردنەوەی هیترۆفۆبیا و مەیلی لێزبیانەتی گرتوە، کە کاتی خۆی لە نێو لیستی لادانی سلوکی و نەخۆشییەوە ئەژمێر دەکرا، کە ڕێکپۆش عەزیز و فێمنیستە ڕادیکاڵەکانی تری کورد بانگەشەی بۆ دەکەن و پێیانوایە هیترۆسێکچوالەتی دیکتاتۆریەتی سێکسیە، ئەوە تۆ و ریکپۆش مەسەلەی نیوان ژن و پیاو بەس لە سێکس دەدۆزنەوە چونکە پیتان وایە لە جیاتی ژنێک مێردێکی هەبێت با لەعابەیەکی سێکسی هەبێت، چونکە

پێویستی بە پیاو و کێشەکانی ناکات. لەوەش سەیرتر ڕیکپۆش دەڵێت:"لەعابەکە کاری خۆی باشتر دەکات لە پیاوەکە".

ئەو قسەیە لەهەر سیاقێک بگوترێت ئەحمەقانەیە، یەک تۆزقاڵ موراعاتی هەستی ژنی کورد بە پلەیەک، ئینجا کۆی کۆمەڵگا بە گشتی ناکات، کەچی تۆ هێشتا ستایشی دەکەیت و لێت بۆتە ژان دارکی کورد کە دەڵێیت:"من پێموایە بەڕێز رێکپۆش عەزیز لەپاڵ ئەوەوەی کە چالاکوانێکی رۆشنەو دەزانێت دەڵێت چی، لەهەموو ئێمەی چالاکوانانی مافەکانی ژنان لەکوردستان بەجورئەتترە لەدەربڕینی رای خۆیداو، بۆ ئەمەش شایەن بەدەستخۆشیو سوپاسێکی زۆری ئێمەو هەموو کەسێکە ...." ئەشهەدو خاوەن جورئەتێکی زۆرە، بەڵام جورئەتێك نزيك لە وەقاحەت.

لە خۆرئاواش هەر ئەو قسانە بوون و ئەو تیزانە بوون نیوەی زیاتری ئافرەتانی بێ خێزان کردوە وەک دایکی تەنها single mother دەژێت خۆیی و لەعابەکەی! ئەوە ئێوەن لە گەورەیی و پیرۆزی ئەو پەیوەندیە گرنگەی نێوان ژن و پیاو ناگەن و هەموو ئامانجێکتان خستنەوەی دووبەرەکی و شەڕی پاتریارکی و ماتریارکی. شتی تری بێ شەرمانەتر زۆر ماوە بەڵام ئەوەندە بەس بێت بۆ دیارخستنی کێ کردارو گوفتاری بێ شەرمی ئەنجام داوە، من یان فێمنستە ڕادیکاڵەکان.

| تەوەری دووەم: نەوال سەعداوی و فێمینستەکانی کورد |
| --- |
| ١- نەوال سەعداوی و فێمینستەکانی کورد |
| -کێشەی نەوال سەعداوی و قەدەری بایۆلۆژی خۆی<br>-نەوال سەعداوی و هەڵوێستی لە ڕژێمی صدام و کورد<br>-سەردانی نەوال سەعداوی بۆ کوردستان و جاك درێدا بۆ میسر |

# کێشەی نەوال سەعداوی و قەدەری بایۆلۆژی خۆی[(١٧)]

زۆر لە مێژە بەرلەوەی کوردستان بەجێ بهێڵم لە ١٩٩٥ نامیلکەیەکم لەسەر نەوال سەعداوی نووسی بە ناوی [نەوال سەعداوی و ئایدیۆلۆژیای ڕق] ئەو کاتە نە ئینتەرنێت و نە فەیسبوك و نەهیچیتر نەبوو، تەنها گۆڤار و ڕۆژنامە هەبوون، ئەویش بە هەزار حاڵ تا نوسینێکت بڵاو دەبوەوە. من ئەو کاتەش لەناو ئیسلامیەکان زۆر گفتوگۆم دەکرد لەسەر مافەکانی ئافرەت و بەزۆر لە بۆچوون و مامەڵەو چارەسەرەکانی ئیسلامیەکان بۆ کێشەی ئافرەت ڕازی نەبووم، بۆیە زۆر سەرسام بووم بە تێزەکانی شێخ محمد الغزالي، تائێستاش پێموایە کەس بەقەد ئەو زانایە ڕاستگۆو بەپەرۆش نەبووە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئافرەت، کەس لەناو بازنەی دینی ئیسلامی وا بوێرانە بەرگری سەرسەختی خۆی لە ئافرەتان نەکردوەو ڕەخنەی لە دەقەکان نەگرتووە، کە لە ڕیزو پایەی ئافرەت دادەبەزێنن، زۆربەی کتێبەکانی نەوال سەعداویم خوێندبوەوە، کەمێکی نەبێت کە لە کوردستان دەست نەدەکەوتن، پاش ئەوەی چەند ڕۆمان و کتێبیکی تری (نوال السعدواى)ـم دەست کەوت، بڕیارم دا دیسان بیانخوێنمەوەو لێکۆڵینەوەکیان لەسەر بکەم، ئەوەبوو هەوڵەکەم ئەو نامیلکەیەی [نەوال سەعداوی و ئایدیۆلۆژیای ڕق] لێکەوتەوە، کە بێگومان لە ئاستی خواستی خۆمدا نییە، بەڵام بۆ ئەو کاتە کارێکی باش بوو، خەڵکێک بە تایبەتی لەناو زانکۆکانی سەلاحەدین و زانکۆی تر سوودیان لێ بینی. من لەو لێکۆڵینەوەیەدا سوودم لە کتێبێی جورج الطرابيشى وەرگرت بە ناوی [انثى ضد الانوثة] لەو کتێبەدا لە ڕۆشنایی زانستی شیکاری دەروونی جۆرج تەرابیشی کارێك بە نەوال سەعداوی دەکات با بە دەواری شڕی نەکردبێت.

لە نووسینەکەمدا من ویستم بیسەلمێنم کە جیهانبینی نەوال سەعداوی لەسەر بنچینەی کێشمەکێش و ڕقدا دامەزراوە، لە ڕووی ململانێ و کێشمەکێشەوە نەوال سەعداوی تەبەنای تیۆری کێشمەکێشی مارکسی

---

(١٧) ئیسلام پەیك ، ٢٠١٤/٢٤/١١ .

دەکات لە پەیوەندیدا لە نێوان پیاو و ژن دا، کە مارکسیەت پێی وایە ئەو پەیوەندیە کۆنترین جۆری پەیوەندی نێوان چەوسێنەرو چەوساوەیە، ئافرەت لەو هاوکێشەیەدا ڕۆڵی چەوساوەو پڕۆلیتاریای بینیوە، پیاویش ڕۆڵی چەوسێنەرو بۆرژوا، بێگومان لە کێشمەکێشەش لە کۆتاییدا دەبێت لایەنێك سەرکەوێت، گەیشتن بە تەبایی تێدا نییە، یانی کێشمەکێشێکی هەتا هەتایی لەناو یەکەی خێزاندا.

جۆرێکیتر لە کێشمەکێشی نەوال سەعداوی لەو ناتەبایەی نێوان قەدەری بایۆلۆژی خۆی وەك ئافرەت و قەدەری نەفسی خۆی لە نوسینەکانی ڕەنگ دەداتەوە، دەیان دەقم هێنابوەوە لە نوسینەکانی کە ئەو ئافرەتە ڕازی نییە بە قەدەری بایۆلۆژی خۆی کە وەك ئافرەت خەڵقکراوە، نایەوێت قەدەری کۆمەڵایەتی بگۆرێت لە هەڵگرتنی ستەمەکە، بەڵکو دەیەوێت قەدەری تەشریحی و بایۆلۆژی خۆشی بگۆڕێت لە ئافرەتەوە بۆ پیاو، بۆیە بەرلەوەی ڕقی لە پیاو بێت، ڕقی ئاڕاستەی پێکهاتەی تەشریحی ئافرەت دەکات، لە یەکێك لە ڕۆمانەکانی کە وابزانم (مذكرات طبيبة)یە، کە باسی خۆی دەکات، لەبەردەم ئاوێنەیەك وەستاوە بە ڕووتی تەماشای جەستەی خۆی دەکات زۆر بە بێزراویەوەو دەڵێت، خۆزگە ئەو دوو مەمکەم بە چەقۆ ڕیشەکێش بکەم، لە سۆنگەی ئەو نارەزاییەی بە پێکهاتەی جەستەیی خۆی بە ڕاشکاوی دەڵێت کە چەندە ڕقی لە خوایە کە ئەوی وەك مێ دروستکردوە، وەك براکەم دروستی نەکردووم.

ئەمڕۆ فێمنستی کوردیش تەبەنای ئەو وتارە توندڕەوەی فێمنستی کێشمەکێش و سڕینەوەی خێزان و سەراوژوورکردنی هەموو بەها کۆمەڵایەتیەکان دەکات، هەر بۆیەش هێمایەکی گەورەی ئەو ئاڕاستە پڕ کێشمەکێشەی بانگ کردوە بۆ کوردستان تا زیاتر لێی بەهرەمەند بێت، ئێمە لە کوردستان پێویستیمان بە زۆرترین بڕی تەبایی و پێکەوە ژیان و ئاسایش هەیە، ماندوو بووین لەو هەموو کێشمەکێشەی حزبی و تایفی و سیاسی و نیشتیمانی و ئەقلیمی و داعشیە، پێویستمان بەوە نیە ماڵەکانمان بکەینە چەقی کێشمەکێشەکان، چونکە کورد لە چاو میللەتانیتردا، زۆر کراوەترو مایل

بە هەقن ئەگەر لەو هەقە تێگەیشتن. پێویستە فێمنستانی کورد زیاتر فۆکەسی کار و وتەکانیان بخەنە سەر چۆنیەتی وەرگرتنی مافەکانیان نەك چۆنیەتی خۆشکردنی ئاگری کێشمەکێشی نێوان پیاو و ئافرەتان.

ئەوەی نەوال سەعداوی و فیمنستە سەرەڕۆکانیتری خۆرئاوا و کوردستانیش دەیلێن، باوەڕناکەم لای هیچ ئافرەتێکی ئاسایی ساغ و پیاوێکی پیاو مایەی قبوڵکردن بێت، چونکە ئەگەر بەزۆر و بەفشاریش جێبەجی کرا، وەك لە سوید بۆ نمونە کراوە، ئەوە پیاوەکان ژنی وایان هەر ناوێت، وەك پیاوەکانی سوێد دەچن لە روسیا و پۆلۆنیا و ئەمریکای لاتینی ژن دەهێنن.

## نەوال سەعداوی و هەڵوێستی لە ڕژێمی صدام و کورد[(١٨)]

ئەوانەی نەوال سەعداوی یان داوەت کردوە بە تایبەتی ئەوەی خەرجیەکەی هەڵگرتووە، هێندە نە خوێندەوارانە کارەکەیان کردوە، هیچ حیسابێکیان بۆ هەڵوێستی ئەو ژنە نەکردوە بەرامبەر ڕژێمی صدام و ئەو کارەساتانەی بەسەر کورد هاتووە. ئەو ژنە لە سەدان چاوپێکەوتن و وتار و کتێب دیومە چۆن بە بیانووی دژایەتی ئیمپریالیزمی ئەمریکی، ئەوپەڕی بەرگری دەکات لە ڕژێمی عێڕاقی صدام، بە درێژایی تەمەنی ئەو ڕژێمە تەنها قسەیەکیشی بۆ ئەو هەموو ژن و کچانەی کوردو عەرەب نەکرد، کە ببوونە قوربانی دەستی ئەو ڕژێمە، لە ڕێگای کوشتنی مێردەکانیان و بەکوشت دانیان و هەروەها لە ڕێگای ئەنفال کردنیان، کەچی هەر ڕژێمی صدام گۆڕ بە گۆڕ بوو، یەکسەر زۆری نەبرد لە ڕۆژنامەی الحیاة لە ٢٠٠٣/٦/١٩ وتارێکی نووسی بە ناونیشانی "نساء العراق بين ارهابين امیرکي و ديني" کە تێیدا داوای هاوسۆزی دەکات لەگەڵ ئافرەتانی عێڕاق لەژێر داگیرکەری ئەمریکی و ئیسڕائیلی، دەڵێت کە هەست بە شەرمەزاری دەکات بەرامبەر لاوازی عەرەب بەرامبەر داگیرکەران..

سەیر لەوەدایە لە زۆر شوێنی تر ئەو بەرگریە گەرمە لە ڕووخانی ڕژیمی صدام دەکات، بە وشەیەکیش خراپ باسی ئەو ڕژێمە ناکات کە بەوپەڕی بەدەویەتی عەرەبی مامەڵەی لەگەڵ ئافرەتانی عێڕاق و کوردستان دەکرد. باشە ئەوانەی صدام مێرد و کوڕ و برایانی بە کوشت دەدان ئافرەت نەبوون؟ ئەی ئەو هەموو ژنە زیندەبەچاڵ کراوانەی ئەنفال ئافرەت نەبوون؟.

لە بیرمە لە پێشەکی کتێبێکی وابزانم [المرأة و معركة التقاليد]ـە هەرچەندە لە کتێبخانەکەم بۆی گەرام نەمدۆزیەوە، مێردی نوال السعداوي، دکتۆر شریف حتاتة، کە پزیشك و ڕۆمان نووس و نووسەرێکی مارکسییە، کە

---

(١٨) پێنوسەکان ، ٢٦ تشرینی دووەم ٢٠١٤ .

ئێستا لێك جیابوونەتەوە، نووسیوەتی بەرگریەکی زۆر سەرسەختانە لە ڕژێمی صدام دەکات.

یانی نەوال سەعداوی هیچی نەزانیوە لەسەر ئەو هەموو تاوانانەی ڕژێمی صدام، ئەو هەموو ستەمەی لە کورد کراوە تا ئەو دواییە نەبێت؟ دەبێت تەنها داوەت بکرێت تا ڕاستیەکان بزانێت، بۆچی ئاگاداری هەموو کون و قوژبنی دنیایە، بەڵام ئاگاداری ئەوە نیە لە سایەی ڕژێمێکی عەرەبی کە لە دەیەها وتاری بەرگری لێدەکات، ژان لە کۆیلایەتیەکی رووتدا دەژیان.

وەك گووتم ئەوانەی نەوال سەعداوی یان داوەت کردوە بە تایبەتی ئەوەی خەرجیەکەی هەڵگرتووە، هێندە نەخوێندەوارانە کارەکەیان کردوە، هیچ حیسابێکیان بۆ هەڵوێستی ئەو ژنە نەکردوە بەرامبەر کوردو ئافرەتانی کورد، بەڵام ئەوانەی ناویان تێوەگلا بێت لە بازرگانی کردن لەگەڵ داعش بە چەك پیدانیان، چ حیسابێکیان بۆ شعوری کورد کردوە تا ئێستا بیکەن.

## سەردانی نەوال سەعداوی بۆ کوردستان و جاك درێدا بۆ میسر[(١٩)]

سروشتی مرۆڤ وایە حەزی بە بایەخی تایبەت هەیە، لە بیرمە کە لە یۆنان بووم و تاربێژێکی میسری هەبوو ماوەیەك ببوو بەبرادەرم و نزیك بوو لە قوتابخانەی شێخ محمدی غەزالی، بیروڕاکانی جوان و میانڕەوانە بوو، ڕۆژێك بانگی کردم بۆ ئەنجامدانی نوێژی هەینی لە مزگەوتەکەی ئەودا، منیش چووم، کە وتاری جومعەی تەواو کرد، وەك چۆن لەکاتی منداڵی چاوەڕێی تەواو بوونی مەولودمان دەکرد تا شیرینی و چوکلێتەکانمان بەسەر دابەش بکەن، ئاوا چاوەڕێی ئەوەبووم لەکۆتایی وتارەکە، لە کاتی دوعاکردنی ناوی کوردستانیش تێبکات، چونکە ماوەیەکی باش بوو لەسەری کارم دەکرد بۆ ناساندنی کورد و دۆزی ڕەوای کورد، ستەمکانی لییدەکرێت، مێژووی کوردستان، خۆشی زۆر بەپەرۆش بوو بۆ زانینی زیاتر دەربارەی کورد، کە کاتی دوعاکان هات گوێم بۆی قوڵاختر کردو دەستی کرد بە دوعاکردن بۆ موسڵمانانی عەرەب و فەلەستین و عێراق و کشمیرو بۆسنەو ئەفغانستان و سۆماڵ و چەندین وڵاتی تری کێشەدار، لە پاش وتارەکە پێیم گووت: برا هیچی تێنەدەچوو ناوی کوردو کوردستانیشت هێنا با لە دوعایەکانت، خۆ تۆ چاك مەزڵومیەتی کورد دەزانیت، گووتی: دوعام بۆ خەڵکی عێراق هەموو موسڵمانانیش کرد، بێگومان کوردیش دەگرێتەوە. گووتم: حەزم لێیە بە تایبەت ناوی کورد و کوردستان بهێنیت وەك چۆن ناوی سۆماڵ و کشمیر دەهێنیت، گووتی :ئینشاڵلا، دواییش هەر نەیکرد لە ترسی ئەو حەساسیەتە نەخۆشیدارەی عەرەب هەیەتی بەرامبەر ناوی کورد، کە دەقی قسەکانی نەوال سەعداویم خوێندەوە، هەر دوعاکانی ئەو مەلایە میسریەم بیرکەوتەوە کە بەتایبەت لە سەدان وتار ناوی گەجەرو گوجەری دنیای دەهێناو کوردی بەبەر دوعا گشتیەکان دەخست، [اللهم انصر المسلمین في کل مکان] ئەگەر هەموو قسەکانی نەوال سەعداوی لەسەر یەکە بە یەکەی کارەساتەکانی کورد هەر ئەوەندە بێت، کە وێنەی دەستنوسەکەی خۆشی وا دەڵێت، ئەوە یانی هیچی لەو وتاربێژانەی عەرەب زیاتر نەکردوە، بەڵکو زۆر

---

(١٩) پێنوسەکان ، ٢٧ تشرینی دووەم ٢٠١٤ .

خراپتریشی کردوە، کە ئەو بەتایبەتی داوەتکراوەو ڕیزێکی ساویلکانەی بێ ئاگا لە مێژووی لێ نراوە، کەچی بە دوو قسەی گشتی و دروشمی چەپڕەوی بەسەرچوو لە دژی ئەمریکاو ئیسرائیل و ئەوروپا، دەیەوێت بلێت ریزی لەو هەموو قوربانیەو کارەساتانەی کورد ناوە، نەوال سەعداوی لە کاتی سەردانەکەیدا بۆ پارێزگای هەڵەبجەو مۆنۆمێنتی هەڵەبجە، لە دەفتەری یادگاریەکاندا نوسیویەتی:"ئەم شوێنە دەیسەلمێنێت کە جیهانی مرۆڤایەتی هێشتا وەکو دارستانێك وایە کە هێزی لەناوبەر فەرمانڕەوای دەکەن، ئیمپریالیزمی جیهانی ئەمریکایی و ئەوروپایی و ئیسرائیلی خەرجیەکانی دەکێشن لەگەڵ حکومەتە نێوخۆییەکاندا کە پشتگیریان دەکات لە وڵاتانماندا، بەڵام گەلان خەبات دەکەن دژی زۆرداری و ستەم و سەرکووتکردن، بە ئافرەتان و پیاوان و گەنجانەوە، لە کۆتایشدا گەلان سەردەکەون".

ئەمڕۆ کورد ئەگەر بە تەمای عەرەبە داعشیەکان و سێکیولارەکان و ئیسلامیەکان با، دەمێك بوو ئاڵای داعش لەسەر قەڵاتی هەولێر و پەرلەمانی کوردستان دەشەکایەوە، کەچی نەوال سەعداوی هاتووە جوێنمان بۆ دەدات بە ئەمریکا و ئەوروپا و ئیسرائیل.

نەوال سەعداوی ببینە چۆن باسی سەردانی فەیلەسوفێکی ناوداری فەرەنسی [جاك درێدا] دەکات بۆ میسر لە فێبرایەری ساڵی ٢٠٠٠:" جاك درێدا، بیرمەندی فەرانسایی هاتە میسر، باسی ئەوەی ناوی دەنێت بە [مرۆڤایەتی] کرد، لە پێناو رزگاربوون لە دەسەڵاتی دەوڵەتی نەتەوەیی، هەڵوەشاندنەوەی فیکری کۆنی بەهۆی زانستە مرۆییەکان لە زانکۆکاندا، بەپێی چەمکی مافەکانی مرۆڤ، هۆشیاری بە تاوان لە دژی مرۆڤایەتی. بەڵام تاوانە مرۆییەکانی دژی ئافرەتانی، نیوەی کۆمەڵی فەرامۆش کرد، هەروەها تاوانە مرۆییەکانی دژی گەلانی ئەفریقیاو گەلانی عەرەبی، لەسەرووی هەموویانەوە گەلی فەلەستینی بەتەواوی فەرامۆش کرد، بیرمەندی فەرانسایی تەنها باسی تاوانە مرۆییەکانی دژی جولەکەو سەرەڕۆیەکانی دادگاکانی پشکنین و هەڵاواردنی رەگەزی کرد لە مێژوو دا .

بیرمەندی فەرانسایی باسی ئەوەی نەکرد، کە لە ئێستاماندا ڕوو دەات لە تاوانە سەربازیەکان و ئابووریەکان کە ئافرەتان و منداڵان دەکوژێت لە: سودان و ڕواندا و سۆماڵ و لوبنان و فەلەستینی داگیرکراو و بۆسنە و کۆسۆفۆ و شیشان و کشمیر و عێراق و جێگای تر"[٢٠].

فەرقی چیە وتاری سەعداوی لەگەل مەلاکانی عەرەب، ئەگەر لۆژیکی مەلا میسریەکە بەکار بهێنین، ئینجا کوردی لە بیرکراو لە یادەوەری نەوال سەعداوی حزوری دەبێت، ئەو گلەیی لە جاك درێدا دەکات کە باسی (سودان ، ڕواندا ، سۆماڵ ، لوبنان ، فەلەستینی داگیرکراو بۆسنە ، کۆسۆفۆ ، شیشان ، کشمیر ، عێراق و...) جێگای تری نەکردوە، ئەی بۆ تۆ لە هەڵەبجەی، شاری شەهیداندا لە دەفتەری یادگاریدا، لە دەقێکی کورتی سێ چوار ڕستەییدا، دڵی شەهیدان و قوربانیان و خاوەن ئەنفال و کیمیا بارانەکانت بە باسی شەهیدانی هەڵەبجەو کارەساتی ئەنفال و کارەساتی شەنگال وشەی کوردو کوردستان خۆش نەکردوە. هەر نەبا لەبەر دڵی فێمنستە ساویلکەکانی خۆمان، یان لەبەر کەنیزەو سەبایەکانی شەنگاڵ واتکردبا، گلەییش لە جاك درێدا دەکات خانم؟ درێدا چونکە لە جەزائیر لە دایك بووە، هەردەم سۆزی هەبوو بۆ خاکەکەی و ئیدانەی سیاسەتی فەرەنسای کۆلۆنیالزمی کردوە دژی جەزائیر، هەتا دەربارەی جولەکایەتیشی دەڵێت:من جولەکەیەکی نا جولەکەم، سەرەڕای هەموو کێشەیەکی تیکچڕژاو بە جولەکایەتیم، بەڵام ئیسرائیل لە دیدی من گوزارش لە جولەکایەتی و خاکی دیاسپۆرا [تاراوگە] ناکات، ئەگەر حکومەتێکی دادپەروەری جیهانی هەبا، واتە نەتەوە یەکگرتووێکی سروشتی، هەرگیز ڕێگای بە ڕوودانی ئەو هەموو دزێویە نەدەدا لە فەلەستین". درێدا لە پێناو هەقدا واز لە جولەکاتی خۆی دەهێنێت، ئیدانەی ئیسرائیل دەکات، کەچی تۆی نەوال سەعداوی پاش زانینی هەموو کارەساتە مێژوویەکانمان بە دەستی عەرەب، سەرەڕای بەرگریت لەو ڕژێمە ستەمکارەی صدام لە سەدان بۆنەو نووسیندا،

(٢٠) نوال السعداوي ، المرأة و الدين و الاخلاق، ، هبة رؤوف عزت، دار الفكر، دمشق، ص٦٤ ، الطبعة الاولى ٢٠٠٠.

شەرمەزاری داتی نەگرت وەک جاك درێدای مرۆڤ بڵێیت: شەرم لە عەرەب بوونم دەکەم کە ئەنفال و شەنگاڵ و هەلەبجەی ئەنجام داوە. دێیتە هەڵەبجە بۆ جوێن دان بە ئەمریکاو ئیسرائیل و ئەوروپا؟ بێ ئەوەی ناوی یەك لە کارەساتەکانمان بهێنیت.

## ٢- ئافرەتی کورد و کێشەکانی شووکردن

- ئافرەتی کورد و کێشەکانی شووکردن بە نا کورد
- یەکەم لێزبیانی کورد لە پێشوازینامەیەکی منداڵکارانە
- مژدێن و ئەزموونی کوردی
- تێڕوانینێک لە هونەری هەڵکەوت زاهیر دا
- سێکسی دەم و ترسناکیەکانی

# ئافرەتی کورد[٢١]

## کێشەکانی شووکردن بە نا کورد

لەوەتی هەم و دەنوسم لە توندترەوترین قۆناغی فیکریمدا هەردەم بەرگریم لە کێشەی ئافرەتان کردوەو بەتایبەتی ئافرەتی کورد، ئەوەی لە نزیکەوە دەمناسن ئەو حەقیقەتە دەزانن، لەو ڕێگایەوە دەیەها نوسین و بەشداریم هەیەو هەر بەردەوامیشم لەو ڕێگایەدا، ئەو سەرەتایەم بۆیە باسکرد چونکە وەك چۆن من هەردەم بەرگریم لە کێشەکانی ئافرەت کردوە، چاوپۆشیشم لە زۆربەی خاڵە لاوازەکانی کەسایەتی ئافرەتی کورد کردوە، چونکە پێموایە خاڵە لاوازەکانی لە ئەنجامی ئەو بارە قورس و نادادوەرییە کە تێیدایە نەك شتی بنچینەیی بن لە کەسایەتیاندا، هۆی سەرەکی ئەو باسەم دەگەڕێتەوە بۆ لێدوانێکی سەرۆك شارەوانیەکی سەر بە حزبی ئەردۆگان کە تێیدا دەڵێت: هەر تورکێك ژنێکی کورد بێنێت وەك ژنی دووەم تا کێشەی کورد نەمێنێت، هەمووومان ببینە تورك و ئەو کاتە مومان بە بەینی وەناچیت، ئەو قسەیە سەیرەم لە وتارێکی the Economist خوێندەوە، کەسانێك پێیان وایە کە ئەو قسەیە قسەی کەسێکی نەژاد پەرستی کەم عەقڵەو تەنها وڕێنەیەکەو بەس، بەڵام من وەك نوسەرێك و تاڕادەیەك شارەزای بواری ئافرەتانی کورد، پێموایە ئەو سەرۆك شارەوانیە دەستی خستۆتە سەر برینێکی قوڵ و یەکێك لە هەرە خاڵە لاوازەکانی ئافرەتی کورد، خۆزگە دەمزانی کام ئەهریمەن ئەو پلانە دۆزەخیەی چرپاندۆتە گوێی، من زۆر دەمێکە ئەو خاڵە لاوازەی ئافرەتی کوردم دەستنیشان کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی هەردەم ئافرەتم بە بەرەی چەوساوە حسێب کردوە، کۆمەڵگا ئیسلامیەکانیش بە چەوسێنەر، حەزیشم لێیە هەردەم لە بەرەی چەوساوە بم بەرگریان لێبکەم بە هەموو توانایەکم. هەر لەو ڕوانگەوەش بەرگریم کردوە لە ئافرەتی موسڵمانانی کوێت و سعودیەو  پاکستان ودارفۆر و بۆسنیا چەندین وڵاتانی تر، بەڵام کاتێك ئەو لێدوانەم خوێندەوە تازە کاتی خۆی هات منیش لەسەری بدوێم. با لە

(٢١) کوردستان پۆست ، ٢٠١٠/١٢/٣١ .

ئافرەتانی غەیرە کورد دەست پێبکەین، زۆربەی ئەگەر نەڵێین هەموو ژنانی عەرەب و تورکمان و عەجەم و فارس کە شو دەکەن بە پیاوێکی دەرەوەی نەتەوەی خۆیان، بە حوکمی پایەی ئافرەت وەك قوتابخانەی یەکەمی زمانی و پەروەردەی منداڵ بێ یەك و دوو فێری زمانی خۆیانی دەکەن، لەپاش ماوەیەکی کەم سەردانیان بکە دەبینی منداڵەکە کە دایکی تورکەو باوکی عەرەبە یان کوردە یان هەر شتێکە، بە تورکیەکی ڕەوان قسە دەکات لە خراپترین حاڵەتدا ئەگەر ژنە تورکەکە لەناو نەتەوەی باوکەکە بژیت، زمانی دایك بە چاکی قسە دەکات و دەبێتە زمانی دایك mother tongue ، زمانی باوکیش بەسەقەتی فێری دەبێت وەك دەستی دوو بەکاری دەهێنێت، دەیان نمونەی ئافرەتی کورد دەزانم چۆن خۆیی منداڵەکانی بونەتە تورکمان یان عەرەب یان هەر شتێکی تر، بڕواننە خێزانە کوردەکانی بەغداو موسڵ و دیالاو گەلێك شوێنی تر.

ژنە کوردێکی موسڵاویم دیت منداڵەکانی یەك دوو وشەی کوردیان نەدەزانی زۆریشیان حەز لێبوو فێری بن بە کاریگەری برادەرانیان و ئینتەرنێت، کەچی دایکیان هەر گوێشی لێنەبوو، ژنی کوردم دیوە منداڵەکانی تەنیا فارسی قسەیان دەکرد چونکە مێردی بە فارسێك کردبوو، ژنێکی تری کوردی فەیلیم دیت خۆیی و کچەکەی شیعەیەکی توندڕەو، هەر هاتە ئەو ئۆفیسەی کە من کاری تێدا دەکەم یەکسەر دڵی تەنگ بوو بە دیتنی ئاڵای کوردستان، گوتی ئێوەی کورد چەند دەمارگرژن خۆ منیش کوردم بەڵام وا نیم، گوتم دیارە خانم چۆن کوردێکی خۆت و کچەکەت بە عەرەبی قسە دەکەن لەبەر خاتری مێردت زمانی خۆشت و نەتەوایەتی خۆشت لە دەست داوە، ئینجا دەستی کرد بە گاڵتە کردن بە دیموکراسیەتی کوردستان وەك عەرەبەکان دەیگوت ئێوە نا هێڵن عەرەب بە کەیفی خۆی بێنە کوردستان. منیش گوتم دیموکراسیەت لەگەڵ ئەو عەرەبە توندڕەوەو وەحشیانە دەیانەوێت باری کوردستان وەك بەغدا لێبکەن؟ هەر کە ئەوەم گوت کچەکەی وەك نەژاد پەرسترین عەرەب وەڵامی دامەوەو یەك زەڕە هەستی کوردایەتی نەبوو، لە سایەی بەرەکاتی پەروەردەی ئافرەتە کوردەکە کە لە دواییدا بە کوردیەکی چاك لەگەڵم قسەی کرد، بێگومان نمونەیەکی زۆرمان دیوە لەناو کوردەکانی

توركیا بەتایبەتی چۆن هەموو شتێكی كوردییان لە دەستداوەو ناكرێت هەمووی باسبكرێت.

بەڕاستی ئەو ڕێكخراوانەی هەوڵ و خەبات دەكەن لە پێناو مافەكانی ئافرەت پێویستە ئەو خاڵە لاوازانەش چارەسەر بكەن، چۆن دەبێت ئافرەتی كورد كە میللەتەكەی لە هەموو میللەتانی دەوروبەر چەوساوەتربن، لە كاتێكدا خەڵكانی چەوساوە زیاتر بەرگری و دەستگرتنیان بە پێناسی خۆیان توندتر دەبێت، كەچی ئافرەتی كورد بێگومان هەموویان نا، بەڵام لە زۆربەی حالەتدا ئەگەر ببنە هاوسەری غەیرە كوردێك هەموو پیناسەی نەتەوایەتی خۆیان لە دەست دەدەن. بێگومان من ئەو قسانە لە مەنزورێكی پیاوانەدا ناكەم بەڵام پیاوان رۆژانە ڕەخنە باران دەكرێن لەلایەن فێمینستەكان و ژنانی تریش دەبا كەمێك باسی خاڵە لاوازەكانی خۆشیان بكەن وەك ئەو خاڵەی من باسم كرد لێرەدا.

هەر بۆیەش دەڵێم ئەگەر ئەو پلانەی سەرۆك شارەوانیە جێبەجێ بكرێت لەلایەن حزبێكی خاوەن عەقڵیەتێكی سیستیماتیكی دۆزەخی ودووربینی وەك حزبەكەی ئەردۆگان بە گومانی نازانم لە ماوەیەی چەند نەوەیەك بتوانن بە یەكجاری كورد حەل بكەن، هەرچەندە جێبەجێ كردنی ئەو پیلانە هێندە ئاسان نیە، بەڵام وەك مالیك بن نبی دەڵێت: ئەوەی قابیلیەتی ئیستعماری تێدا نەبێت ئیستعمارناكرێت.

## یەکەم لێزبیانی کورد لە پێشوازینامەیەکی منداڵکارانە[٢٢]

ئەو پێشوازینامەیەم خوێندەوە کە بە زارزمانی مانفێستۆی کۆمەنستی نوسرابوو لەلایەن تاهیر ساڵح شەریف و کەیهان عەزیز، بۆ پێشوازی کردن لە لێسبیانیزمی و یەکەم ئافرەتی لێزبیانی کورد[٢٣].

نوسینەکە وەک بڵێی باسی چونە ناوەوەی کورد بکات بۆ ناو بۆشایی ئاسمان، یان باسی ناردنی یەکەم مانگی کوردی دەستکرد بکات بۆ ئاسمان، وانوسرابوو. کۆمەڵگەی دواکەوتوو لەبەر بێ دەسکەوتی، دەبێت ئاهەنگ بۆ بەدڕەوشتی و تورەهاتی بگێڕێت، بەدەستی گروپ و کەسانێک کە دەمێکە دووچاری ئیفلاسی ڕەوشتی و سیاسی بوون، بەڵام هەر لەپەلەقاژێدان، وەک بڵێی ئەهریمەن فو لە سکڵی کزبوەوەیان بکات.

بەڕاستی سەیرم بەو دوو هەرزە کۆمەنستەو کەسانی تریش لەوێنەی ئەوان دێت، کە بەو شێوە گەرموگوڕە پێشوازی دەکەن لەهەر شتێکی بەد ڕەوشتی و رووخێنەر بۆ خێزان و پویوەندی پیاو و ژن و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، ئەوەش هەر تەنها بۆ دژایەتی کردنی بەهاکانی کوردو ئیسلامەو هیچی تر، لەژێر پەردەی سەربەستی و قسەی تر کە هەمووی سەرچاوە لە رۆژئاوای سەرمایەداری دەگرن.

رەحمەت لەو رۆژانە کە کۆمەنستەکانی پێشو، لەبەر کردنی پانتۆلی جینس، خواردنەوەی وێسکی، کێشانی جگەرەی گرێڤن و رۆمانیان بە رەوشتی سەرمایەداری دەزانی، لینین لە کوێیە ئەو (چەپڕەوە منداڵکارانە) ببینێت، کە چۆن پشتگیری لە هەموو بەدڕەوشتی و لادانەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری دەکەن، بونەتە کلک و زوڕنای سەرمایەداران.

---

(٢٢) کوردستان نێت ، ٢٠٠٣/١/٢٩.

(٢٣) لە ژێر ناونیشانی (یەکەمین لیزبیەنی کوردو یەکەمین گوتاری ئێمە) لە ٢١-١-٢٠٠٣ لە کوردستانێت.

دەبوایە کاک تاهیر هەندێک یەکسانخوازتر بایەو داوای پشتگیری بۆ هۆمۆسێکچوالێتی هەردوو ڕوگەزەکەی بکردایە، تا بەتەواوی ئاهەنگەکە سەرکەوتوو بوایە.

ئەو جۆرە کۆمەنستە منداڵکارانەی خزمەتێکی چاک بە ئێمەمانان پێشکەش دەکەن، بەو لێدوانە بێ پەردانەیان چونکە ئەرکی ناساندنیان بەخەڵک ئاسانتر دەکەنەوە، بۆیەش لەهەر کۆمەڵگایەکی ئیسلامی وەک پەتای ئیدزو ئایبۆلا سەیر دەکرێن.

خۆزگە ئەو لێزبیانە یەکەمەی کورد کەسێکی نزیکی نووسەرانی پێشوازینامەکە دەبوو، بۆ نمونە خوشکیان یان کچیان با، تا ئەو کاتە ڕادەی پێشکەوتنخوازیانمان بزانیبا. لە هەمووش سەیرتر ئەوەیە کاک تاهیرو کەیهان پێیان وایە کە ئەو حاڵەتە شازە زۆرەو بەنهێنی پیادە دەکرێت، بەڵکو یانەی لێزبیانێتی نهێنیش هەیە.

ڕاستە دەڵێین هەر کەسەی لەچاویلکەی خۆی دەڕوانێتە شتەکان، ناتوانین بڵێین کە ئەو حاڵەتانە نین لەناو کۆموڵگای کورددا، بەڵام ناشتوانین ئەو زیادەڕۆییە ئەو دوو نووسەرە باوەڕ بکەین، بەو شێوەیە نازانستیانە تەعمیمی بکەین.

ڕۆژئاوا هەروەک لایەنی پۆزەتیڤی زۆرن، لایەنی نێگەتیڤیشی زۆرن، من بەزەییم بەو چەپڕەوە هەرزەو منداڵکارانە دێتەوە، چەندە ماندوو دەبن بۆ زۆرناو دەهۆڵ لێدان بۆ لادانە ڕەوشتی و کۆمەڵایەتیە لە ژمار نەهاتوەکانی ڕۆژئاوا.

دور نیە سبەی دەهۆڵ لێدەن بۆ گەییتی، دوایی بۆ زینای مەحرەم (لەنێوان یەک خێزان) کە ئێستا زۆر باوە لە ڕۆژئاوا، بە تایبەتی لە ئەمریکا. چونکە ئەو سەربەستییە فەوزەوییەی ئەوان جاڕی بۆ دەدەن سنوری بۆ نییە، ئەگەر بڕوات بە هیچ ئاینێک و بەهاییێکی ڕەوشتی نەبێت، چی قەدەغەی

پەیوەندی سێکسی نێوان خوشک و برا و دایک و کوڕ و باوک و کچەکەی دەکات.

لە رۆژنامەکانی رۆژئاوا رۆژانە باسی دەیەها چیرۆکی تەجاوزکردنی وەحشیگەرانەی باوکان و برایان بۆ سەر کچەکان و خوشکەکانیان دەکرێت، کە زۆربەی جار دەبێتە هۆی نەخۆشی دەروونی کەڤنار بۆ ئافرەتەکان، زیرە دەکەن لەو جیهانە دڕندەیەی کە ناتوانێت ئاسییشی بۆ دابین بکات لەناو خودی ماڵەوەش، کەوا چاوەڕوان دەکرێت ماڵ شوێنی حەوانەوەو ئاساییشی مرۆڤ بێت.

یەک قسەش بۆ ئەو فریودراوەی کەوا نازناوی یەکەم ئافرەتی لێزبیانی کوردی وەدەست هێناوە، ئەگەر ئەو شێوازەی ژیانەت هەڵبژاردووە ئەوە تۆ ئازادی، بەڵام ناوی ئافرەتی کورد مەزڕێنە بەوەی گوایە ئەو بەدڕەوشتییە زۆر باوە لەناو ئافرەتی کورد، ئەگەر ئافرەتی کورد گوێیان لەو قسە بەتاڵەت بێت، ئەو کاتە دەزانیت ڕایان چۆنە دەربارەی ئەو داهێنانەت، نەکەی بخەڵەتێی بەو قسە زەرق و بریقاویانە کە لەو پێشوازینامەیەدا هاتووە، ئەوانە خۆیان کەسانی مەنبوزو بەدناون لە کۆمەڵگای کوردی بەتایبەتی لە رووی ڕەوشتییەوە، ئەگەر واش نەبن بەو جۆرە پێشوازی لەو سەرگەردانییەی تۆ ناکەن.

# مژدێن و ئەزموونی کوردی(٢٤)

## چاکترین ئەزموونی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

دەڵێی کورد خویگرتوە بە خۆهەڵکێشانی بێ ناوەرۆك و بەتاڵ، کە باس دێتە سەرباسی هەر بابەتێك، هێشتا تازە دارە دارە دەکەن لە هەر بوارێکدا دەڵێن ئێمە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا چاکترین کەسین لەو بوارەدا، یان چاکترین نمونەین یان ئەزمونین لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بێئەوەی حیسابی ئەو هەموو خوێنەرە وریایەی کورد بکەن کە وەک کرمی تۆرە کۆمەڵایەتیەکانی ئینتەرنێتیان لێهاتوەو ئاگاداری جیهان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن.

زۆرجار دەڵێم دەبێت ئەو برادەرانە گوندێکی لا چەپ نەناسن بەناوی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستداو مەبەستیان ئەو شوێنە نەبێت هەر کاتێ باسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەکەن، چونکە ئەگەر لە پڕۆژەی بودجە توانیبێتیان چەندین گوندی وەهمی دەستنیشان بکەن و بودجەشی بۆ دانێن لەگەڵ بوونی نەخشەی کوردستانی گەورە لەسەر دیواری زۆربەی ماڵەکان و بوونی چەندین بەشی جوگرافیا لە زانکۆکانی کوردستان، بە دوری نازانین گوندی (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) یانیش بۆ ئەو مەبەستە داهێنا بێت تا سوێندەکەیان نەکەوێ، بە درۆ سوێند نەخۆن کاتێک دەڵێن ئێمە باشترینین لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە فلان وفیسار بوارەدا.

سەیر لەوەدایە زۆربەی جاریش ئەو نمونانەی کە نیشانی دەدەن، بەچاکترین نمونەی ئەو گوندە داماوەی [ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا] دادەنێن، نەک هەر باش نیە بەڵکو لێواولێوە لە عەیب و عارو بێ زەوقی و نانیشتیمانی و دژە کوردایەتی و تەژی لە گەندەڵی.

---

(٢٤) ٢٠١٢/٧/١٢ .

بۆ نموونە هەر لە پاش ١٩٩١ دەسەڵاتی کوردی ڕۆژانە بە ئێمەو دنیای دەگوت :ئەزموونی دیموکراسی کوردستان، چاکترین ئەزموونە لە سەرتاسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، هەتا عەرەبە فەقیرەکانی باشور و ناوەڕاست خەریك بوو باوەڕ بکەن و ئەزموونە ناوێزەکەمان بگوێزنەوە بۆ بەغداو بەسرا بەڵکو چەندە خراپن ئێستا خراپتر دەبوون.

ئەو زوڕنایەی [چاکترین ئەزموون لە سەرتاسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا] لە چەند ریکلامێکی پارەدراودا لە چەند ڕۆژنامەیەکی ئەمریکاو خۆرئاواش بڵاودەکرایەوە، ئەو ئەزمونە بەناو ناوێزەیە هەمووومان دەزانین چەندە مایەی شەرمەزاری و نەنگیە لە مێژووی کورد: ئەزمونێکە پڕیەتی لە براکوژی، کوشتن و تەسلیم کردنەوەی کوردانی خەباتگێڕی پارچەکانی تری کوردستان، تالانی سەروەت و سامانی میللەت، پەرتەوازەیی، کوشتنی هەستی ئینتیمای نەتەوەیی، قوڵ کردنەوەی گیانی حزبایەتی، دامەزراندنی دەسەڵاتی بنەماڵەیی و پەك خستنی پەرلەمان و هەرزان فرۆش کردنی نەوتی کوردستان بە ڕێژەیەک پێش خۆماڵی کردنی نەوتیش کۆمپانیا بێگانەکان خەونیان بەو ڕێژەیەی وەزیری وەزارەتە جانتا ڕەشەکە نەدیوە کە دەگاتە ٦٠% بە سەرەوە، زۆر جار ئەو هەرزان فرۆشیە دزەکانی لەندەنم بیردەخاتەوە کە جاروبار لەسەر شەقامەکان لاپتۆپی هەزار پاوەندی بە سەد پاوەند عەرزت دەکەن، کاتژمێری دوو هەزار پاوەندی بە شەست پاوەند دەدەن، چونکە پشتی پێ نەئێشاوەو دڵی بە خاوەنەکەی ناسوتێ، گرنگ ئەوەیە بای تلیاکەکەی بکات بۆ چەند ڕۆژێك.

بە هەمان شێوەی ئەزموونە پڕ لە عەیب و عارەکەمان، لە ماڵپەڕێکدا [گۆرانیبێژ] "مژدێن" کە یەکەم کەسە لە ناو کوردو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشدا بێگومان کە کامیرای بردە ناو ئاودەست و گۆرانی لەسەر ئینجانەی تەوالێتدا چڕی، گۆرانی بە نیمچە ڕووتی پێشکەش کردو وێنەی تۆپلێسی [ڕووتی نیوەی سەرەوەی لاشەی] خۆی بڵاوکردەوە بۆ ئەوەی بە قەولی خۆی تەحەدای ئەوانە بکات کە گوتویانە [م...ی] جوان نین، پاش ئەوەی لەڕاپرسی سایتێکدا بە دەنگی ئەو خەڵکەی گوایە جەماوەری ئەون بە خراپترین

گۆرانیبێژ راگەیانرا، کەچی زۆر ڕوقایمانە وەك ڕوقایمی زوڕناژەنانی ئەزموونە ناوازەکەمان دەڵێت:"من ئافرەتێکی پڕ داهێنانم لە مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستداو لە داهاتوودا هەر بەو هۆیەوە سوپاس دەکرێت".

مژدێن وادیارە کچی حەڵاڵ زادەی ئەزموونی کوردیە نەك لەبەر ئەوەی بە هەموو عەیب و عارەوە خۆی پێ پڕ داهێنانە لە مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەڵکو وەک چۆن زوڕناژەنانی ئەزموونە ناوازەکەمان، لە وەڵامی ئەوەی ڕەخنەیان لێبگرێت دەڵێن ئەوانە دوژمنن و چاویان بە ئەزموونە ناوازەکەمان هەڵنایێت، "مژدێن"یش بە ناحەزانی سیناریۆیە هونەرییە پۆرنۆگرافیەکانی دەڵێت:"من ئەو ئافرەتانەم پێ نەخوێندەوارو نا هۆشیارە کە سیناریۆکانی من رەت دەکەنەوە". بەڕاستی لە یەک دەچن دەڵێی دوو لەتی سێوێکن، سێوەکەش چاکترین سێوە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

# تێڕوانینێك لە هونەری هەڵكەوت زاهیر دا[٢٥]

هەڵکەوت زاهیر دیاردەیەکە لەگەڵ لێشاوی گەندەڵی و وەک پاشکۆ و پاشگرێکی ئەو تسونامیە گەندەڵەی کوردستان لەو خاکەدا سەوز بوو و باڵای دەرکرد. بەردەوامیشی لەسەر سوتەمەنی ئەو گەندەڵیەوە وەستاوە، دەنا کێ باوەڕ دەکات ئەو هونەرە ناڕەسەنە مایەی خۆشی بهێنێتەوە چ جای لەوەی قازانج بکات. ڕاستە ڕێژەیەکی زۆر لە هەرزەکاران و خەڵکیتر سەیری ئەو کارانە دەکەن بەڵام بلێی پارەی پێبدەن ئەوە زەحمەتە. ئەوانەی پاڵپشتی ئەو هونەرە دەکەن هەر ئەوانەن کە پاڵپشتی وەزیرو وەزارەتە گەندەڵەکان دەکەن کە بە ملیۆنەها دۆلار دیزەبەدەرخونە دەکەن بێ ئەوەی ڕۆژێک لێیان بپرسنەوە، یان وەك وەزارەتە ناو جانتاکەی ئاشتی هەورامی سەرەرای ئەو هەموو تاڵانکردنەی نەوت و سامانی نەتەوەیی هێشتا بە زیان کەوتۆتە سەر بودجەی هەرێم.

کێشەی هەڵکەوت زاهیر لەوەدایە زۆر بە نەفەسێکی بەرزەفڕو بوغرایەوە قسە دەکات، لە چاوپێکەوتنی لەگەڵ [ئێن ئار تیڤی] چەندین جار هەر وشەی تەحەدا بەکار دەهێنێت، لەوەش سەیرتر هەر لەسەرەتاوە خۆی لەسەروی ڕەخنەوە دادەنێت، دەڵێت گوایە ئەوانەی ڕەخنەی لێدەگرن دەیانەوێت لە سایەی عەزەمەت و گەورەیی ئەودا ناو دەر بکەن، ئەو لەهجەیە لە خۆباییە نوسەرێکی کوردی کاتی خۆی، کە یاخی بوو لە سێبەرەکەی خۆشی، بەبیر هێنامەوە، کە ئەویش هەروای دەگووت، شەو وڕۆژ وەک شۆڕشگێڕە ئاشوبیەکان یان فەوزەویەکان خەریکی پەلاماردانی ئەم و ئەو بوو، کەچی کەس بۆی نەبوو وەڵامی داتەوە نەوەک تاوانبار بکرێت بەوەی دەیەوێت بە پلیکانەی باڵای بەرزی ئەودا سەرکەوێت، تا لە کۆتاییدا دەستەمۆ کرا لە لایەن ئەوانەی کە جوێنی بە باوک و باپیریانیشی دەدا بە ڤایرۆسی سەوزە دۆلار، ئێستا بۆخۆی لە ئوتێلیکی راقی میوانی هەمیشەییە و هەرسەرگەرمی خواردنەوە ووڕێنەیە. کاتی خۆی لەڕابردودا

---

(٢٥) ئاوێنەنیوز ،٤ ی حوزەیرانی ٢٠١٢ .

خەڵکی زۆر هەبوو وەڵامی نەدەدایەوە نەوەک بڵێت دەیانەوێت لە سایەی زەبەلاحی و گەورەیی ئەودا ناودار بن، ئێستا هێندە سوک وڕیسواو قێزەون بووە خەڵک بێزی نایەت ناوی بخاتە ناو وتارەکانیان.

هەلکەوت زاهیریش جگە لە چەند کارێکی کەم کە دەتوانی بڵێی بەکار دەچێت، هەرچەندە سەرچاوەکانی ئاوازەکان ئەمڕۆ بۆ ئێمە مەعلوم نییە، ڕاست و چۆپ کەوتۆتە شێواندن و قێزەون کردنی هونەری کوردی. ئەو بەناو هونەرمەندە هەموو بەهرەکەی ئەوەندەیە لاسایی تیاترۆخانەکانی لوبنان و میسر بکاتەوە، چونکە لەوە دەچێت بە قەلب وەقاڵبەوە لەو بەشە هونەرە نزمەی ئەو دوو وڵاتە توابێتەوە، ئەو پیاوە سەرچاوەی ئیلهامی "سوعاد حوسنی"یە کە سەفوەت شەریف ١٨ فیلمی سێکسی ئەو ئیلهام بەخشەی هەڵکەوتی گرتوە. هەڵکەوت خەریکی هونەرێکە کە پێشان تەنها درەنگی شەو لە مەلهاکانی بەیروت و شارع الهرم قاهیرە پێشکەشی سەرخۆش و عەوداڵانی داوێن پیسی دەکرا، تایبەتیش بوو بە بادانی سمت و سینگ و دەربڕینی وشەی وروژێنەر بۆ جوڵاندنی هەستە نزمەکانی خوارەوە، وەکو نۆتی و هۆم شیکەواوەو تامی ئەو وئەویش بکەو تا دوایی. کەچی ئێستا بەڕۆژی ڕوناک لە سکرینی تەلەفزیۆنەکان یەکێک لە مێگەلەکەی هەلکەوت زاهیر بەشیوەیەکی زۆر ڕەخیس و بازاڕی بە تەنها یان بە یاوەری پلەی بۆیەکی **playboy** هەڵکەوت باسی دەست بردن بۆ سینەو گۆناو لێو ماچ کردن دەکات، گوایە نۆتیە واتە (بزێو و شەیتانە ...) گوێبگرە بۆ ئاستی ئەو وشانە کە سەرەڕای ئەوەی دەڵێی عەرەبێکی تازە کوردی فێربوو نوسیویەتی، تەنها ئاخ و ئۆفی هەیفا وەهبی و بوس الواوا و [بحبک یا حمار]ت بەبیر دێنێتەوە:

تۆ کۆرێکی هاری لاچۆ لە سەر ڕێگام
چاو لە چاوم دائەگری ماچت کرد لە گۆنام
ویستم لە دەستت ڕاکەم خۆت نزیک کرد لە لام
دەستت خستە ناو دەستم ماچت کرد لە لێوم

کاک هەلکەوت زاهیر تەحەداش دەکات کە هونەرەکەی ئەو لەناو هونەری کوردی لە لوتکە دایە، چونکە ئاهەنگەکانی پڕدەبن لە کچ و کوری هەرزەکار، ئەو برادەرە یان نازانێ یانیش خۆی لە گێلی دەدات کە لەبەرچی ئاهەنگەکانی ئەو لە ئاهەنگی بۆ نمونە هونەرمەندێکی ڕەسەنی وەك عەدنان کەریمیش قەرەباڵغتر بێت. چونکە هەڵکەوت ئاسانترین چەك لەو گۆڕەپانە بەکاردەهێنێت، کە چەکی وروژاندنی سێکسییەو هێزی جوانی ئافرەتە، بۆیە گومانم نییە هەیفا وەهبیش بینەری زیاتری هەیە لە ئوم کەلسوم لەسەر یوتیوبدا، لە یەتیوب کچێکی مەسیحی میسری باسی سیاسەتیش دەکات نەک بابەتێکی سێکسی، بەڵام چونکە زۆر جوانەو زۆر بە نازوعیشوەوە ئەدای دەکات، سەرەڕای ئەوەی قسەکانی فلسێکی قەڵب ناهێنێت لە دنیای سیاسەت و فیکردا، کەچی زیاتر لە ملیۆنێك و سێ سەد هەزار بینەری هەیە، ئەوانەی لە مێگەڵەکەی هەلکەوت و هەیفا کۆدەبنەوە بە پاڵنەری جنسی و سێکسیەوە دێن بۆ ئەوێ نەک بە پاڵنەری دیتن و بیستنی هونەرێکی ڕەسەن، ئەی ماقوڵە ئەو ناسلی و لۆکە و دەشنێ و ئەوانی تر بە نیمچە ڕووتی و بە وشە ڕوتەکانیان و جوڵە سێکسیەکانیان نیشانی گەنجانی وروژاو بدات لەجیاتی بچنە لای ئەو دەچن بۆ کۆڕی فاروق ڕەفیق بۆ نموونە، کاری هونەرمەندی هەقیقی بەرزکردنەوەی هەست و چێژی هونەرە لای خەڵک نەک تەخدیرکردنیان بە غەریزەی سێکسی.

سەیر لەوەدایە لە چاوپێکەوتنەکەیدا هێندە خۆی فریشتە ئاسا دەردەخات، خەریکە شەیتان شەرمی لێدەکات، کەچی قسەکانی هانی و باخان دەیسەلمێنن کە لەبەرامبەر ئەنجامدانی کاری هونەری داوای بەرامبەری نا ئەخلاقی و نامادديان لێدەکرێت جا لەلایەن خودی هەڵکەوت زاهیر یان ئەو تەنها ڕێنیشاندەرە، نازانم کێ داوایان لێدەکات، بێگومان کەسێکی زیرەکی ناوێت تا بزانێت ئەو شتە نامادیانە چیین کە داوایان لێدەکرێت، بەداخەوە نێوەندی هونەری کوردی بەرەو ئەو هەڵدێرە بردوە.

کورە نازدارەکەی ڕاوێژکارەکەی حکومەت، وەک چۆن ژمارەی پێوانەیی لەو ئاوازو وشە بەرزانە شکاندوە بە دانانی ٦٠٠ ئاوازی بێ دایک و باوك کە

هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێت لۆکەو ناسلی بە کوردی بیکەنە گۆرانی یان نانا و دومنیک و هەیفا وەهبی بە عەرەبی بیان چڕن، بە هەمان شێوە خەریکە ژمارەی پێوانەیی دەشکێنێت لە زیادەڕۆییەکانی لە دەربڕینە بێ پەردەکانی وەك:

هەوەس و هەوەسبازی هاتیتە بەر دەرگام
ویستت ماچێکم بکەی لێوت هێنا بۆ لام
دەستت برد بۆ سینەی من وتت ئاە پێم خۆشە

یان هاندانێکی بێ پەردە بۆ ڕابواردنی بێ سنوری کچان لەگەڵ ئەم و ئەو و شوو نەکردن:

بە قسەم کە شوو مەکە
یاری بە ئەو وخۆت مەکە
تا ئەتوانی خۆت ئازاد کە
تامی ئەو و ئەویش بکە!!!

ڕۆژبەڕۆژ قسە بێ پەردەکانی زیاد دەکات ئەجوائی بێ مۆڕاڵی مەلهاکانی بەیروت و قاهیرە دەهێنێتە ناو هونەری کوردی بە پشتگیری کەسانێك لە دەسەڵاتەوە، ئەو دەسەڵاتدارانەی کە بەس نیە ئەو پیاوەیان کردۆتە صدام حسێنی هونەری کوردی بە قەولی باخان، بەڵکو دەیانەوێت یەك کەناڵی ئاسمانی تایبەتیشی بۆ دامەزرێنن تا زیاتر هونەرە بێ پەردەو نۆتی و پۆرنۆیەکەی برەو پێبدات، ئەو دەسەڵاتە چی ماوە تێکی نەدابێت تا لێی ئەمین بین لەسەر هونەری کوردی و ئەویش تێک نەدات.

لە جیاتی زمانێکی فۆڕماڵی کوردی یەکگرتوو، دوو زمانی فەرمی دروست کردوە لە جوگرافیایەکی بچوکدا...

پێناسنامەی نەتەوەیی لە نێو گۆمی وەلائی حزبیدا خنکاند...گیانی ئینتیمای نەتەوایەتی لە دەروونی زۆربەی خەڵکدا کوشت بە گەندەڵیە زەبەلاحەکان کە هەموو سنورێکی لۆژیکی تێپەڕاندوە.

سەروەت وسامانی ئەو میللەتەی هەموو تاڵان کردوو بە هەدەری دا، وای لێهاتوە دەست و پێوەندەکانیان فڕۆکەی تایبەت بۆ مناڵەکانیان بە دیاری دەکڕن، ڕۆژێک دێت ئەو وڵاتە دەگاتە چاخی تەواو بوونی نەوت هەمومان یەکسان دەبین لە هەژاری و سواڵکەریدا، چونکە خۆ وەك وڵاتانی ئەوروپا خەمی نەوەی دواڕۆژو ئایندەمان نەخواردوە تا سامانە زیادەکامنان بۆیان بخەینە حیسابێکی تایبەتەوە، هەتا وڵاتێکی بچوکی وەك کوێت، لەترسی تەواو بوونی نەوت هێندە پڕۆژەی وەبەرهێنانی ئەنجامداوە لەسەر ئاستی جیهاندا، ئەگەر ئێستا نەوت کۆتایی پێ بێت کاریان لێ ناکات.

## موفرەداتەکانی گەندەڵی یەك پاکێچن...

پارەی زۆری بە هەوەنتە دەست کەوتوو پێویستی بە کاڵای گرانبەها هەیە، پێویستی بە سەیارەی دوا مۆدێل هەیە، پێویستی بە قەسرو تەلاری خەیاڵی هەیە، پێویستی بە گازینۆی قومار هەیە، پێویستی بە هونەرێکی شازو نۆتی وەک مێگەڵەکەی هەڵکەوت زاهیری هەیە، پێویستی بە ئاخ و ئۆفی نیشەبزوێنی دەشنێ و لۆکە و ناسیلی و باقی مێگەڵەکەیە، بەڵکو لەجیاتی هێنانی نانسی عەجرەم و هەیفا و ئەلیساو سەماکەرە ئیرۆسیەکانی جەمشید بەرهەمی خۆماڵی برەو پێبدەین تا عوملەی سەعبەمان بۆ بگەڕێتەوە نەچێتە گیرفانی سۆزانی و دەیوسەکانی عەرەب و فارس و تورك چونکە هینەکانی خۆمان ئەولاترن، کە ئەوە جۆرێکیشە لە کوردایەتی.

لە کێشەی کتێبی [ئایەتە شەیتانیەکان]ـی سەلمان ڕوشدی و فەتوا بەناوبانگەکەی کوشتنی، خەڵکێکی زۆر بەرگریان لێکرد یان لە دژی بوون، بەڵام ئەوەی لە هەموان زیاتر سەرنجی منی ڕاکێشا ئەوە بوو نووسەرێکی بەریتانی گووتی:"من دەڵێم سەلمان ڕوشدی موستەهەقی فەتوای کوشتنە لەبەر بیروڕاکانی نا، بەڵکو لەبەر ئاستی نزمی ئەدەبی نوسیندا".

هەڵکەوتیش موستەهەقی ڕەخنەو ئیدانەکردنە لەبەر هونەر نا، بەڵکو لەبەر ئاستی نزم و نارەسەنایەتی هونەرەکەی. دەسەڵاتیش وەک لەو بوارەی بەرهەم هێنانەدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوەو هەڵکەوت زاهیر توانیویەتی لە ساڵێکدا ٦٠٠ ئاوازی [نۆتی و هۆم شیکەواوا وتامی ئەو وئەم بکە] دابنێت، ئەگەر لە بوارەکانیی تری بەرهەمهێناندا هێندە بلیمەت بایە نە پێویستیمان بە کەرەوزی ئێرانی و نە بە پیازی کوێتی و نە بە تەماتەی سعودی و ڕۆنی تورکی و ماستی مۆزەمبیقی دەبوو.

# سێکسی دەم و ترسناکیەکانی (٢٦)

بەخوا ئەوە بابەتی من نییە لەسەری بنوسم، بەڵام لە بێدەنگی گۆڕەپانی ڕەخنەی ئیسلامی کوردی و پاش تەکلیفی دوو سێ کەس بە ناچاری ئەو وەڵامەم بۆ ئەو بابەتە نووسی، دەبوایە کەسێکی دیندارو پزیشك وەڵامی دابایەوە، کە ماشەڵڵا زۆرن و پڕی کوردستانن، بەڵام وادیارە بۆرن، لە جیاتی باسی ئەو بابەتانەی خۆیان باسی حەڕامێتی وێنەکێشان دەکەن، برەو بە توندڕەوێتی سەلەفی دەدەن.

موسڵمانان زوو زوو ئەگەر باسی بابەتێکی هەستیاری بە تایبەت جنسی بکەن، یەکسەر دەڵێن [لا حياء في الدين] شەرم لە دیندا نییە، ئەوە مەقولەیەکی ڕاست و جوانە، بەڵام ئەگەر لە شوێنی خۆیان بەکار بهێنرێت، چونکە بێ حەیاییش لە دیندا نییە، بابەتێکم خوێندەوە بە ناوی [تێڕوانینی شەرعی و تەندروستی لەسەر مژینی توڵی پیاو و زێی ئافرەت] کە بەڕاستی جورئەتێکی زۆری دەوێت باس بکرێت لە سایتە ئیسلامیەکان، کە خانمێك بە ناوی دکتۆرە کوێستان عەبدوڵا، نوسیویەتی، کە من نازانم ئەو خانمە دکتۆری چیە ئایین یان پزیشکی، چونکە لەلایەک بابەتەکەی لە گۆشەی تەندروستی بڵاوکروەتەوە، لە لایەکیتر، قسەکانی زیاتر لە قسەی کۆلکە مەلاژنێک دەچێت، نەك دکتۆرێک یان پزیشکێك.

سەیر لەوەدایە ئەو بابەتە دەمێکە بەر چاوم دەکەوێت، و من بەو کەمە زانیاریە تەندروستیەی کە هەمە، هەستم دەکرد کە بابەتێکی سەقەت و پڕ لە زانیاری هەڵەیە هەتا لە ڕووە دینیەکەیەوە، چ جای لە ڕووە تەندروستی وپزیشکیەکەیەوە .کورتەی ئەو وتارە دەڵێت: " وروژاندنی جنسیی یەکێکە لەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی بەخشینی ئارامیو ئاسودەیی رواندنو قوڵکردنی خۆشەویستیو گەشتنە چڵە پۆپەی کامەرانی لەنێوان ژنو پیاودا، وە زۆر جار پرسیارکراوە و دەکرێت وەزۆرێك لەهاوسەران توشی جۆریك لە

(٢٦) شرۆڤە ، ٢٠١٥/٠١/٠٢ .

رارایی هاتوون سەبارەت بەمژینی تولی پیاو لەلایەن ئافرەتەوەو مژینی زێی ئافرەت لە لایەن پیاوە وەیان یاری پێ کردنیو ماچکردنی کە ئایا بەوشێوەو شێوازە مومارەسەکردنی جنسییو وورووژاندنی یەکتر دروستە لەروی شەرعیەوە یان قەدەغەکراوە".....

ئەو دکتۆرەیە چونکە هەر کە سەرەتادا بڕیاری داوە لایەنگری ڕەوایەتی و دروستی ئەو مومارەسەیە سێکسیە بکات، هەتا وتەکانیشی بەو ئاڕاستە دەبات بێ گفتوگۆیەکی جیدی بەڵگەکان، باز دەدات بۆ ئەنجامەکەی کە دەیەوێت، وبەردەوام دەبێت و دەڵێت: "بۆئەم مەسەلەیە زۆربەی زانایان لەسەربنەمای )الاصل فی الاشیاء الاباحە) واتە( بنەرەت لە شتەکاندا ڕێپێدانە (فتوایان داوەکە هەرشتیك بەڵگەیەکی ئاشکراو روونی لەسەرنەبێت قەدەغە ناکرێتو لە سنوری ئیجازە پێدراوەکانە...هەندێکی تر لەزانایان بە دروستی دەزاننو دەڵێن ئەم مەسەلەیە خوای تاك وتەنها لێی بێ دەنگ بووەو شەریعەت نەرَێگری لێکردووە نەبە واجیبی داناوە لەبەرئەوە بوار هەیە مرۆڤەکان بیکەن و بەئەنجامی بگەیەنن.... بەڵام هە ندێك لەزانایان لەرووی ئەدەبو رێزی نێوان ژنو مێرد ئەو مەسەلانەیان بەباش نازانیوە و فتوای حەرامیان لە سەرداوە کەبەراستی بەڵگەکانیان لاوازەو زیاتر پەیوەستن بوون بەعورف و نەریتیان کردوەتە بەهانە بۆ حەرام کردنی"..

"جارێ ئەو بابەتە ناکەوێتە بەر (الاصل فی الاشیاء الاباحە)، چونکە ئەم مەسەلەیە خوای تاك وتەنها لێی بێ دەنگ نەبووەو شەریعەتیش ڕێگری لێکردووە لە چەندین دەقی ڕاشکاو و وازیحدا! لەبەرئەوە بوار نیە مرۆڤەکان بیکەن و بەئەنجامی بگەیەنن" سەیرم بەوە دێت خۆرئاوا ئەو هەموو شتە جوان و یاسا و بیر و ئازادیەکا وفەلسەفەی حوکم و زانستە گرنگانەی هەیە، بە هیچیان سەرسام نەبین، بێین بەو نەرێتە سێکسیە قێزەونە سەرسام بین!! وەرە ستەمکاری وگەندەڵی سیاسی و نەبوونی مافەکانی ئافرەت و نا سەروەری یاسا نەتخاتە ژێر فشار، لە جیاتی بکەویتە ژێر فشاری نەرێتە سێکسیە خۆرئاواییە بێ سنوور ودوور لە تەندروست وسروشتیەکان، کە ئەگەر دەزانین چۆ کەرامەتی ژن لەو نەرێتە سێکسیە

قێزەونانە و زەلیلکردنە سێکسیە **sexual degrading** پێشێل دەکرێت هەرگیز بیری لێناکەینەوە! ئەگەر ڕەواییت بەوەش دا، ئەی چی لە نەرێتە بێ شومارە سێکسیەکانی تر دەکەیت کە لە ئەووپا و خۆرئاوا دەگوزەرێت، کە مرۆڤ ڕووی باسکردیانی نییە.

لە ڕووی دینیەوە تەنها ئایەتێك بەسە کە دەفەرموێت: (وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُواْ النِّسَاء فِي الْمَحِيضِ وَلاَ تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ} ٢٢٢ البقرة واتە: [ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (عادەتی مانگانەی ئافرەت) پێیان بڵێ: ئەوە ئازارو زەرەرە، کەوابوو خۆتان بە دوور بگرن لە هاوسەرەکانتان کە لەو حاڵەتەدا بن و نزیکیان مەکەون تا پاک دەبنەوە، جاکاتێک پاک و خاوێن بوونەوەو خۆیان شت بچنە لایان، بەو شێوەیەی کە خوا فەرمانی داوە، بەڕاستی خوا تەوبەکاران و پاکانی خۆشدەوێت .

زۆر ڕوون وئاشکراشە کە مانای (فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللّهُ ( یانی شوێنی منداڵ بوون و نەك هیچ شوێنی تر، هەتا تەواوکردنی ئایەتەکە بە )ان الله يحب التوابين والمتطهرين) واتە خودا ئەوانەی خۆش دەوێت کە تۆبەکارن و پاکن و خۆیان دوور دەگرن لە پیسی وپۆخڵی! باشە لەوە پیس وپۆخڵتر هەیە کە ئەندامی زاوزێ بخرێتە ناو دەمی ئافرەتەکەت، یان بە پێچەوانەوە؟ !هەتا لە ئایەتێکیتر لە دوای ئەو ئایەتە، جەخت لەسەر شەرعیەتی چۆنیەتی جووتبوون دە کاتەوە، و زۆر ڕوونتر دەڵێت: (نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) ٢٢٣ البقرة [ ژنانی هاوسەرتان کێڵگەن بۆتان و شوێنی چاندنی وەچەن، جا بە هەر شێوەیەک دەتانەوێت تۆو بوەشێننە ناو کێڵگەکەتانەوە (بە هیوای بەرهەم) ....] لێرەش تەنها جەخت لەسەر شوێنی کێڵگە و کشتوکاڵ دەکاتەوە، کە شوێنی منداڵ بوونە. دەقی تر زۆرن لەو بارەوە، بەوەندە بەس دەکەین.

## باسی تێڕوانینە تەندروستیەکە

ئێمە چاوەڕوانمان دەکرد لە یەکێك کە خۆی پێ دکتۆرەیە، کە خۆی لە باسێکی وا هەستیار دەدات هەر نەبا بەپێی ناونیشانی وتارەکەی [تێڕوانینی شەرعی و تەندروستی لەسەر مژینی تولّی پیاو و زێی ئافرەت] باسی تێڕوانینە تەندروستیەکەشی کردبا، کە بەڕای من گرنگتر نەبێت لە تێڕوانینی شەرعیەکە بێ بایەختر نیە! من وەك کەسێکی ناشارەزا بە بواری زانستی پزیشکی، بە کەمێك بەدواداچوون وگەڕاندا شتی زۆر ترسناکم خوێندەوە لەسەر لایەنە نێگەتیڤە ترسناکەکانی [مژینی تولّی پیاو و زێی ئافرەت] کە ئەوە کاری من نەبوو، دەبوایە کاری ئەو هەموو دکتۆرە ئیسلامیە بایە، کە لە جیاتی بواری خۆیان، باسی ابن تیمیة و نواقض التوحید دەکەن! یان کاری ئەو خانمە بایە، نەك بێیت وبڵێیت فلان زانای دینی وای گووت و فلان وای گووت، یان هەموو سەرچاوەی بابەتەکەت لە سایتەکانی( مفکره الاسلام، اسلام اون لاین، الفتوی۔ السنه والجماعه .....هتد) بهێنیت، بەبێ ئەوەی یەك سەچاوەی زانستی پزیشکی تێدا بێت؟! بۆ تۆ مەلاژنی یان دکتۆری؟! ئەگەر ئینگلیزیش نازانیت، دەتتوانی بە عەرەبی بە دوای الجنس الفموي بگەڕابایت، تا بابەتێکی باشتر و هاوسەنگترت دەست کەوتبا.
ئەو دەقانەی خوارەوە چەند زانیارێکە لە چەند سایتێکی پزیشکی و ویکپیدیا وەرمگرتوە:

"زانستی پزیشکی نوێ پەیوەندیەکی زۆر گەورە و هەستیار دەبینێت لە نێوان دەم و تەندروستی گشتیدا، ودەمی مرۆڤ ڕۆڵی ئەو پەنجەرەیە یاری دەکات بۆ هاتنی زۆربەی نەخۆشیەکانی ئەندامەکانی جەستە، و وەك کەنارێکە بۆ هاتنە ناوەوەی جۆرەها ئینفێکشن و هەوکرن، کە دەکرێت سیستمی پارێزگاری لەشی مرۆڤ بگۆڕێت وکاری لێبکات. و بەهۆی سەرەکی نە خۆشیەکانی Sexually Transmitted Diseases STD نەخۆشیە سێکسیە گواستراوەکان دادەنرێت.

سێکسی دەم oral sex چەنین نەخۆشی دەم و هەناسە و ئەندامی سێکسی دەگوازێتەوە. تەندروستی دەم ڕۆلی ڕاستەوخۆی هەیە لە گواستنەوەی ئینفێکشنەکان، هەوکردنەکان [التهابات] برینێك لە دەمدا، و

پدووی خوێن لێهاتوو ، ولێوی زامدار و پێستی قڵیشاو هەلی گواستنەوەی ئینفێکشنەکان زیاتر دەکەن.

هەندێ هەرزەکار وادەزانن کە سێکسی دەم زۆر سەلامەتە، بەڵام دەبێت بزانن کە ئەو جۆرە سێکسە پەیوەستە بە گواستنەوەی چەندین sexually transmitted infections (STIs)هەوکردنە سێکسیە گواستراوەکانی وەك سفلیسsyphilis ، و herpesهێپیز، Chlamydiaکلامیدیا ، و HPV سیفەلیس هێپیز، لە هەمووشی ترسناکتر ڤایرۆسی ئیدز!HIV

HPVکە کورتەیHuman papillomavirus ، ڤایرۆسی شێوە گۆمەمکی مرۆڤە، نزیکەی ١٠٠ سەد جۆری ئەو ڤایرۆسە هەیە کە پێستی مرۆڤ دووچاری گرێ وقونێری وەک شێوەی گۆی مەمک دەکات، ٣٠ تا ٤٠ جۆری لە ڕێگای سێکسی دەمەوە دەگوازرێتەوە، هەندێک لەو گرێ وقونێرانە لەوانەیە گەشە بکەن وببنە خانەی شێرپەنجەیی ودوایش بۆ شێرپەنجەی تەواو، و زۆربەی حالەتەکانی شێرپەنجەی ڕەحم cervical cancer لە ڤایرۆسی HPV وە دەست پێدەکات.

## لە توێژنەوەیەکدا دەقاو دەق دەڵێت:

چەندین توێژینەوە پەیوەندی نێوان سێکسی دەم و ڤایرۆسی HPV شێرپەنجە پۆزیتیڤەکانی قوڕگی دەرخستوە، بە تایبەتی لەوانەی سێکسی دەم بۆ پیاوان ئەنجام دەدەن! زانایان پەیوەندیەکی بەهێزی نیون سێکسی دەم وشێرپەنجەکانی دەم و قوڕگیان دۆزیوەتەوە.

**Studies have shown a relationship between oral sex and HPV positive throat cancers, particularly in those individuals who perform oral sex on men....It has long being associated with genital warts and cervical cancer but now scientists have found a strong link with oral cancer – specifically cancers of the mouth and throat.**

ئەوە بۆ کەسێکی نەشارەزای پزیشکی وەك من، هێندە زانیاری ببینمەوە لەسەر ترسناکی ئەو نەرێتە سێکسیە قێزەون وترسناکە، دەبوایە کوێستان خانی دکتۆر کەمێك سەری خۆی ئێشاندبا بە ڕوونکردنەوەی لایەنی تەندروستی، وەك لە ناونیشانی وتارەکەی ئاماژەی پێکردوە، بەڵام ئاماژەیەکی بێ ناوەرۆکە.

## سەرچاوەکان:

١-http://www.ncbi.nlm.nih.gov/pmc/articles/PMC٢٨٤٠٩٦٨/Oral Sex, Oral Health and Orogenital Infections
٢- http://en.wikipedia.org/wiki/Human_papillomavirus
٣-http://www.netdoctor.co.uk/ate/sexandrelationships /sex/٢٠٠٤٠٠.html#ixzz٣NF٨f٠٠ty
٤-http://www.healthyteethdevon.nhs.uk/oral-health-information/public/how-to-look-after-your-mouth/harmful-practices/unprotected-oral-sex/

## سەرچاوەی وتارەکە:

تێڕوانینی شەرعی و تەندروستی لەسەر مژینی تولّی پیاو و زێی ئافرەت
http://www.shrova.org/Detail.aspx?id=٤٤٩٣&LinkID=١٨#.VKDMTQEADs
http://www.islampaik.net/dreje.aspx?jimare=٣٠&cor=٧

| تەوەری سێیەم: کلتوری ئافرەت کوشتن |
|---|
| - کورد پلەی یەکەم لە ژمارەی تاوانەکانی شەرەف تۆمار دەکات |
| - ئاگرە سورە لە خۆم بەدورە |
| - دیسان دەربارەی فاتیمە |
| - کاتێک خولە کۆمەڵە دەبێتە موسڵمانێکی توندڕەو لە میدیای بەریتانی |
| - نە ژن فریشتەن هەموویان و نە پیاویش هەموویان ئەهریمەنن |
| - شیرین بێ ڕەوشت نیە؛ بەڵکو زادەی کۆمەڵگایەکی دڵ ڕەق وبێ ڕەوشتە وڕیاکارە |
| - فەرخەندەکان دەبنە قوربانی مەلا و بانگخوازە توندڕەوەکان |

## کورد پلەی یەکەم لە ژمارەی تاوانەکانی شەرەف تۆمار دەکات[٢٧]

مۆبایل ئامێرێکی زۆر پێویست و گرنگە لە ژیانی مرۆڤی ئەم سەردەمە، خەڵکی کوردیش زۆر زوو لێی بەهرەمەند بوو، بەڵام هەندێ لایەنی نێگەتیڤیشی هەیە لەبەر بەد بەکارهێنانی.

بەرلەوەی مۆبایل بەو شێوەیە بەرفراوانە بڵاوبێتەوە، تاوانەکانی شەرەف لە کوردستان بەو شێوەیە زۆرە نەبوو. ئوردن بەناوبانگترین وڵات بوو لە ڕوودانی ئەو جۆرە تاوانانە، بەڵام ئەو ئامارو ژمارە ترسناکانەی لەسەر کوشتنی ئافرەتان لە کوردستان بڵاودەبێتەوە خەریکە کوردستان بەرەو پلەی یەکەمی جیهان دەبات لەو تاوانانەی بەناوی شەرەفەوە ئەنجام دەدرێن.

لە ڕاپۆرتێك لەو بارەیەوە لە ڕۆژی ٢٠٠٨/٥/١٧ لە ڕۆژنامەی ئیندیپێندنت Independent ی بەریتانی بڵاوکرایەوە، بە ناوی How picture phones have fuelled frenzy of honour killing in Iraq (چۆن وێنەکانی مۆبایل تاوانە دڕەندەکانی شەرەف زیاد دەکات لە عێراقدا) لە نوسینی پاتریک کوکبیرن Patrick Cockburn کە لە شاری سولەیمانیدا نوسیبوی. لەو وتارە وێنەیەکی زۆر تاریکی کێشابوو دەربارەی تاوانەکانی شەرەف لە کوردستان و هەموو عێراق بە گشتی، دەڵێت لە ڕاپۆرتێکی UN هاتووە کە زیاتر لە ٣٥٠ ئافرەت بە تاوانی شەرەف کوژراوە لە شەش مانگی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٧دا.

هەر لە یەکەم ڕۆژی بڵاوبونەوەی ئەو ڕاپۆرتە، سایتی (کەناڵی ئاسمانی عەرەبیە) ڕاپۆرتەکەی وەرگێڕابوو لەگەڵ گۆڕینی ناوی عێراق بۆ کوردستان. ئەوە دەقی وەرگێڕانەکەیە:(انتشار صور الجوال یغذی "جرائم الشرف" بکردستان العراق)، وادیارە ئەوەی ئەو هەواڵەی داڕشتوە تەنها مەبەستی بەجۆرێک لە تەشهیر کردن بێت بە کورد بۆیە ئەو تەعلیقاتانەی نوسرابوون لەسەر ئەو بابەتە زۆریان جۆێن و سوکایەتی تێدابوو لە دژی کورد، وەک بڵێی

---

(٢٧) ٢٠١٢/١٢/١٢ .

لە کۆمەڵگای عەرەبی ئەو جۆرە تاوانانە ڕوو نەدەن. بەڕاستی ئەوەی پێی دەوترێت تاوانی شەرەف کێشەیەکی زۆر گەورەیەو چارەسەرکردنی گەورەتر وزەحمەتترە.

جارێ ئەو تاوانانە هیچ پەیوەندیەکی بە ئاینەوە نیە، چونکە ئەو مەرجانەی قورئان دایناوە بۆ تاوانبارکردنی هەر یەکێک بە زینا، هێندە سەختە جێبەجێ بوونی تا ئەو ڕادەیەی سەحابیەکی غەیور بە پێغەمبەری گوت، ئەگەر دیتم ژنەکەم وا لە باوەشی پیاوێکدایە، دەتەوێت بەجێیان بێڵم وبچم چوار شایەد پەیا بکەم؟ وەڵڵا بە شمشێر لەت و پەتیان دەکەم. ئەوە سەحابی و بەرامبەر پێغەمبەر ئەو قسەیە دەکات، ئەی ئەو خەڵکانەی خۆمان کاتێک وێنەی کچی یا خوشکی یان خێزانی بەڕووتی دەبینێت دەبێت چاوەڕوانی چی لێبکەیت.

ڕێکخراوەکانی ئافرەتان زۆر جاران نەک هاریکاری چارەسەرکردنی کێشەکان نین، بەڵکو ئاڵۆزتری دەکەن. ئەوان هانی ئافرەتان دەدەن بۆ یاخی بوون بەسەر هەموو داب و نەریتێک بەبێ گوێدانە ئەنجامی ئەوە هاندانە، لە لایەکی تر هەزار ناو و ناتۆرە دەخەنە پاڵ ئەوانەی ئەو تاوانانەی شەرەف ئەنجام دەدەن، چارەسەریشیان بۆ ئەو پیاوانە هێندە سەقەتە، کە بریتیە لە خۆداماڵین لە شەرەف. ئافرەتێکی خەڵاتکراو کتێبێکی لەسەر چەند سۆزانیەک نووسی وا موخاتەبەی ئەو سۆزانیانە دەکات وەک بڵێی قەدیسە بن نەک کەسانێکی قوربانی چەند هەلومەرجێکی نالەبار، ڕاستە ئەو ئافرەتانە پێویستە یارمەتیان بدرێت و کێشەیان چارەسەر بکرێت، بەڵام تەقدیس کردنیان، میسداقیەتی وتەکانت ناهێڵێت. لە وڵاتان بۆ کەمکردنەوەی تاوان و نەخۆشی دەروونی پەنا دەبەنە بەر دین، لەلای ئێمە نەک سود لە دین وەرناگرین بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان، بەڵکو تاوانەکەشی دەخەینە ئەستۆ و پەراوێزی دەخەین، ئێمە لەگەڵ دژایەتی ڕاشکاوانەش لە دژی ئەو تاوانانەی ئەنجام دەدرێن بە ناوی شەرەف، بەڵام گومانمان نیە لە سەقەتی چارەسەریەکانیش، بۆ ئەوەی تاوانەکانی شەرەف نەمێنن دەبێت لە ڕوانگەی ڕێکخراوەکانی ئافرەتان و کەسانی تریش هەموو بونیەی عەقلی و فەرهەنگی

و نەرێتی خەڵکەکە بگۆڕێت، ئەوەش مەحاڵە، چونکە ئەوە خۆراکێکە لە ڕۆژهەڵات هەرس ناکرێت.

پێویستە چەندە دژی ڕەفتاری پیاوسالارین ئەوەندەش دژی لاسایی کردنەوەی کچ و کوڕە بەتاڵە هەرزەکارەکانی ئەوروپا بین. پێویستە کچەکان هوشیار بکرێنەوە بە مەترسی هەندێک جۆری پەیوەندی بێ کۆنترۆڵ یا دژە باو، کوڕەکانیش هوشیاربکرێنەوە لە مەترسی یاریکردن بە مۆبایل و، بە ئینسانی کردنی هەست و سۆزیان لەکاتی پەیوەندی بەستن لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەر، نەک هانیان بدەین بۆ زیاتر یاخی بوون و ڕازاندنەوەی هەڵەکان و ئاخنینی گوێیان بە بەها داڕزاوەکانی ڕۆژئاوا، لای ئێمە هەر کچ لەسەر شەرەف ناکوژرێت، بەڵکو کوڕیش دەکوژرێت لە هەندێک حاڵەتدا. بەڕاستی ئەو بابەتە (تاوانی شەرەف) زۆر باسی لێدەکرێت، بەڵام هەر لایەک لە هەمانەی خۆی گوێزەکانی دەژمێرێت، پێویستە هەموو لایەک لەو کۆمەڵەدا بەشدار بن لە دیتنەوەی چارەسەرێکی گونجاو بۆ ئەو تاوانە زۆرانەی بەناوی شەرەف ئەنجام دەدرێن، لەکاتێکدا زۆربەشیان فڕیان بەسەر شەرەفەوە نیە.

# ئاگرە سورە لە خۆم بەدورە[٢٨].

خەڵکانێک هەن کاتێ باس باسی خەڵکانی تر بێت بەوپەڕی ئازادی و سەخاوەت لەسەر حیسابی خەڵک قسە دەکەن، بەڵام کە کار گەیشتە خۆیان و کەس و کاریان ئەوە هەڵوێستیان بە تەواوی دەگۆڕێت. ئەو ڕەفتارانە لەناو گۆڕەپانی ڕۆشنبیری زۆر باوە، هەر رۆشنبیری کوردیش نا بەڵکو بەشێوەیەکی ڕەها. کاتێک کۆمەڵگای ئێمە توشی دیاردەیەکی دزێو دەبێت، لە جیاتی دۆزینەوەی چارەسەر یان گەڕان بەدوایدا هێندە ڕۆژئاوایی خۆیان نیشان دەدەن لە رۆژئاواش هەورازتر، ئەو کەسانە لە سنوری لاسایی کردنەوەی کوێرانەش ناوەستن بەڵکو لەوانیش پتر زیادەرۆیی دەکەن، هەروەک چۆن نووسەرێک ناوی لەو کچە کوردەی (فاتیمە) کە بەدەستی باوکی کوژرا لە سوید ناو نابوو بە پێشمەرگە. ئافرەتێکی دەرکەوتوو لەناو خێزانێکی لادێیی بچێت پەیوەندیەکی تەواوی لاشەیی و دەروونی لەگەڵ گەنجێکی سویدی ببەستێت، بە هێندەش نەوەستێت باوکی و براکانی بشۆرێتەوە بە جوێن و قسەی ناشیرین لە میدیای سویدی دا، بە دەست لەپشتدانی فێمینستەکانی سوید، ئەو ئافرەتە بۆچی پێشمەرگەیە.

من سەد لە سەد دڵنیام ئەگەر فاتیمە خوشکی ئەو برادەرە بایە ناڵێم دەیکوشت، بەڵام لایەنی کەم ئەو نەمریەی پێ نەدەبەخشی. بەڵام کورد لە کۆنەوە دەڵێت ئاگرە سورە لە خۆم بەدورە. هەڵوێستی ئەو رۆشنبیرە ڕووداوێکی راستم بە بیرهێنایەوە: رۆژێکیان ئەدیبێک لەسەر تەلەفزیۆن دەیگوت من ناڵێم ئافرەت نیوەی کۆمەڵە، بەڵکو سێ چارەگیەتی. ئەو کاتە من لە ماڵی مامۆستا (مەدحەت بێ خەو)ی شاعیر بووم، بەڕێز مەدحەت گوتی: ئەو بۆرە پیاوە وەک ئاژەڵ لە ژنەکەی دەدات، پێشی چەند رۆژێک ژنەکەی بەسەری شکاو، لە نیوەی شەودا دەرکردە دەرەوە..

---

(٢٨) رۆژنامەی ستاندەر، ٢٠٠٨/٦/١٥.

بڕواتان بێت لە چاوپێکەوتنەکەدا شانی هیچ فێمەنستێک نەدەگەیشت بە داوێنی کەوشەکانی ئەو، دەڵێن کاتی خۆی زانای ناوداری کورد مەردۆخی کەوتبوە شەڕە وتار لەگەڵ چەند زانایەکی شیعە مەزهەب لە دژی سیغە (زەواجی موتعە) لەبەر بە هێزی بەڵگەکانی مەردۆخی زۆربەیان پاشەکشەیان کرد، تەنها ئایەتوڵایەک نەبێت. دواجار مەردۆخی پێی گوتبوو ئەگەر ئەم جۆرە زەواجە وا بە پیرۆز دەناسێنی دەوەرە کچەکەتم لێ مارەکە بە سیغە. دەڵێن ئایەتوڵایەکە بە تەوهین پێکردنی حسێب کردبوو بە هەزار حاڵ کەمێک سارد ببوەوە. واتە بۆ خەڵکی پێی پیرۆز بوو بۆ خۆشی بە سوکایەتی دەزانی.

هەر لە گۆڕەپانی هونەری ئەکتەری بەناوبانگی میسری عادل ئیمام، کە فیلمەکانی پڕن لەو ئافرەتانەی کاریان ڕازیکردنی ئارەزوە نێرگسیەکانی عادل ئیمامەو بەس، چەندینیان پەشیمان بونەتەوە لە فیلمەکانیان لەگەڵ عادل ئیمام، لەبەر بەکارهێنیان بە خراپترین شێوە، هەر ئەو عادل ئیمامە لە چاوپێکەوتنێک کاتێ پرسیاریان لێکردبوو دەتەوێ کچەکەت ببێتە ئەکتەر، زۆر بە توندی وەڵامی دابوەوە: نەخێر! چونکە خۆی دەزانی لەوانەیە کچەکەی ئەویش ئیستغلال بکرێت وەک ئەو کچ و ئافرەتانەی ئەو ئیستغلالیان دەکات.

نمونەیەکیتر (احسان عبدالقدوس) ڕۆمان نووسی بەناوبانگ، ڕۆمانەکانی هەمووی بانگەشەیە بۆ یاخی بوون و خۆ ڕووت کردنەوەو پەیوەندیە نا شەرعیەکان، ئەو ڕۆمانانەی کراونەتە فیلم بەڵگەی بیرکردنەوەی ئەو ڕۆما نووسەن، بەڵام کاتێک کوڕەکەی (محمد احسان عبدالقدوس) ویستی هاوسەرێک بۆخۆی دەستنیشان بکات. باوکی واتە ئەو احسان عبدالقدوسە نەچوو کچێکی ئایدیالی ناو رۆمانەکانی یان شۆخێکی ناو ئەکتەرەکانی بۆ دەست نیشان بکات، بەڵکو کچی شێخ محمدی غەزالی زانای بەناوبانگ و میانڕەوی ئیسلامی بۆ دەستنیشان کردبوو.

ئەو خوە هەر لە سنوری رۆشنبیران و هونەرمەندان ناوەستێت بەڵکو هەموو بوارەکانی تری ژیانی دووفاقیمان دەگرێتەوە.

# دیسان دەربارەی فاتیمە[٢٩]

لە خوێندەوەم بۆ وتارەکەی (حامد درودی) لەژێر ناونیشانی (ئایا فاتیمە پێشمەرگە بوو؟) دەستخۆشی لێ دەکەم، بۆم بەدیار کەوت کە هێشتا لە نێو نووسەرانی کورد کەسانێک ماون حال و حیسابێک بۆ چەند بەهایەکی بەرز دادەنێن، بەر لەوەش من وتارێکم بە زمانی عەرەبی ناردبوو بە ناونیشانی (قتل الشرف فی المجتمع الکردی) کە برادەرانی ئەم تۆرە بەرێزە لە ٢٢-٣-٢٠٠٢ بە سوپاسەوە بڵاویان کردەوە. هەڵبەتە وتارەکەی کاک حامد بە سودتر بوو چونکە بە زمانی کوردی بوو.

بەڕاستی کاک حامد پەنجەی خستبوە سەر دیاردەیەکی زۆر دزێو کە لەناو بەناو رۆشنبیرانێک باوە ئەویش دەروون بەزینییە بەرامبەر ژیاری رۆژئاواو بەهاکانی. ئەو کەسانە لە سنوری لاسایی کردنەوەی کوێرانەش ناوەستن بەڵکو لەوانیش پتر زیادەرۆیی دەکەن، هەروەک چۆن کاک جەزا ناوی پیرۆزی پێشمەرگە دەکاتە کاڵای باڵای فاتیمە.

ئەم جۆرە رەفتارانە لە زۆربەی بوارە جیاجیاکانی ئەدەبی و زانستیش دووبارە دەبێتەوە بە تایبەتی لە بواری رۆژهەڵاتناسیدا. نمونەش زۆرن لەو بوارە بەڵام ئەوە مەبەستی ئێمە نیە. من هەزار دەر سەد دڵنیام ئەگەر فاتیمە خوشکی کاک جەزا چنگیانی با ناڵێم دەیکوشت، بەڵام لایەنی کەم ئەو نەمریەی پێ نەدەبەخشی. بەڵام کورد لە کۆنەوە وتوویەتی ئاگرە سورە لە خۆم بەدورە. ئەو هەڵوێستەی کاک جەزا روداوێکی راستیم بە بیردێنێتەوە رۆژێکیان ئەدیبێک لەسەر تەلەفزیۆن دەیگوت من ناڵێم ئافرەت نیوەی کۆمەڵە، بەلکو سێ چارەگیەتی. ئەو کاتە من لە ماڵی کاک (مەدحەت بێ خەو)ی شاعیر بووم، کاک مەدحەت گوتی: ئەو بۆرە پیاوە وەک ئاژەڵ لە ژنەکەی دەدات، پێشی چەند رۆژێک ژنەکەی بەسەری شکاو لە نیوەی شەودا دەرکردە دەرەوە. برواتان بێت لە چاوپێکەوتنەکەدا شانی هیچ فێمەنستێک نەدەگەیشت بە داوێنی ئەو.

---

(٢٩) ٢٦-٣-٢٠٠٢ .

## کاتێك خولە کۆمەڵە دەبێتە موسڵمانێکی توندڕەو لە میدیای بەریتانی[٣٠]

لە ٣٠/ ٩/ ٢٠٠٣ ڕۆژنامەکان بەریتانیا سەرتاسەر هەواڵی حوکمدانی عبداللە یونسی ناسراو بە خولە کۆمەڵە بڵاوکردەوە، کە پار کچە شازدە ساڵەکەی خۆی بە ناوی (هێشو) کوشت بە چەقۆ، لەسەر مەسەلەی پەیوەندی سێکسی کچەکەی لەگەڵ دۆستەکەی **boyfriend**.

من ڕای تایبەتی خۆم دەربارەی ئەو مەرگەساتە کۆمەڵایەتیانە دەربڕیوە، لەگەرمەی مەرگەساتی فاتیمە دا، کە ئەویش هەر بەدەستی باوکی کوژرا، نامەوێش لێرە دوبارەی کەمەوە.

بەڵام لەو کێشەیە نوێیەدا بێ بەهایی و بێ ڕەوشتی میدیای بەریتانی بەتایبەتی و ڕۆژئاوایی بەگشتی بە رونترین شێوە خۆی دەرخست.

من لێرە هاوسۆزی خۆم دەردەبڕم لەگەڵ خێزانی عبدالله یونس، بەڵام ئەوەی کە سەیرە ئەوەیە هەر یەکێک لەو جیهانە پان و بەرینەی وڵاتانی ئیسلامیدا هەڵەیەکی کرد، ئەوە یەکسەر ئەو میدیا بێ ئینسافە دەیقۆزنەوەو بەسەر ئیسلامی دادەبڕێنن.

هەموو ئەو ڕۆژنامانەی کە لەسەر ئەو ڕووداوەیان نووسی هەر لە سەردێرەوە وەسفی باوکی قوربانیەکەیان کردبوو بۆ موسڵمانی توندڕۆ. کەچی هەر یەکێک بگریت لە جالیەی کوردی لە لەندەن دەزانێت، کە عبداللە یونسی ناسراو بە خولە کۆمەڵە، فڕی بەسەر ئیلتیزامی ئیسلامی یەوە نەبوو، چ جای ئەوەی موسڵمانێکی توندڕەو بێت.

من لام گرنگ نییە کاک عبدالله یونس هیچ ئیلتیزامی ئیسلامی هەبووە یان نا، بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئەو هەموو تەرکیزە بکرێتە سەر شتێک کە هەمویان چاک دەزانن وا نییە، ئەوەش بە داخەوە مرۆڤ بێ

---

(٣٠) ٢٠٠٣/٩/٣٠ سایتی کوردستان نێت.

هیوا دەکات لەو دادگەریەی رۆژئاوا کە جاران خەونمان پێوەی ئەبینی، دەرسێکیشە بۆ مەفتونانی غەرب لە سویدو ئەڵمانیاو هۆڵەنداو فەرەنسا..هتد.

هیچیتر پۆزی ئەو دیموکراسیەتە لێنەدەن، کە بە دوای تەنها روداوێک (١١ی سێپتەمبەر) خەریکە سەرلەبەری قاموسی سیاسی و یاساییان سەرەولێژ دەکات.

لەگەڵ ئەو نوسینە وێنەی رۆژنامەی DAILY MAIL تان نیشان دەدەم کە چۆن لە مانشێتدا نوسیویەتی:(ئەو موسڵمانە توندڕۆیەی کە کچە (بەرۆژئاوابوەکەی) دایە بەر چەقۆ تا مردن بە ئەبەدی حوکم کرا)

نەمدەزانی رۆژنامەنووسانی رۆژئاواش بە عەقڵیەتی ڕەوت و کۆمەنیستە عێراقچیەکانی لەمەڕ خۆمان بیردەکەنەوە، کە خوا خوایتیان یەکێک غەلەتێ بکات تا بیخەنە ئەستۆی ئیسلام نەک موسڵمان.

خۆشترین نوکتەی ئەو رووداوە ئەوەیە کە خولە کۆمەڵە چۆن حزبەکەی ئێستا دڕندەترین هەڵمەتی گرتن و ئەشکەنجەدانی کۆمەڵی ئیسلامی بەرپا کردوە بە بیانوی قاعیدە بوون، بۆ رازیکردنی ئاپۆ سام، خولەش تا درەنگ سوربوو لەسەر تاوانبارکردنی قاعیدە بە کوشتنی کچەکەی.

وادیارە لەمەودوا ئەوەی متەق بکات، تاوانی قاعیدە بوونی دەخرێتە مل. دەبێ لەو مەکارسیە نوێیەدا چەندین سەر بکرێتە قوربانی جیهانخۆری یــو ئێــس ئــەی؟


Strict Muslim who stabbed to death his 'Westernised' daughter is jailed for life

By Matthew Bayley and Andrew Levy

## شیرین بێ ڕەوشت نیە؛
## بەڵکو زادەی کۆمەڵگایەکی دڵ ڕەق وبێ ڕەوشتە وڕیاکارە[٣١]

منیش وەك هەزاران کەس چیرۆکی پڕ مەرگەساتی (شیرین)ـم خوێندەوە، دەمەوێت لەسەر چەند خاڵێك هەڵوەستە بکەم:

بنچینەی کارەساتەکانی ئەو خوشکە بەڕێزو ستەم لێکراوە دەگەڕێتەوە بۆ خێزانەکەیان، کە بریتی بووە لە دایکێکی کڵۆڵ و نیمچە شێت و باوکێکی بێ ڕەوشت و جاهیل و نا مرۆڤ، باپیرێکی ساقیت و بێ ڕەوشت. ئەوەی پێی وایە شیرین خەتای هەبوە لە بێدەنگی کردن لە دەست درێژیەکانی باپیرە نامەردەکەی ئەوە حەتمەن هیچ لەبارەی سایکۆلۆژیەتی کچێکی منداڵی پەروەردەکراو بە سەقەتی لەناو خێزانێکی سەقەتدا نازانێت، ئەوە هەر شیرین نییە بێدەنگی لێکردوە، بەڵکو خوا دەزانێت سەدان و هەزاران شیرین هەبن کە دوچاری دەستدرێژی و زینای مەحارم ببنەوە بێ ئەوەی بوێرن هیچ بدرکێنن. شیرین ئەگەر قسەشی بکردایە کێ باوەڕی پێدەکرد لەو کۆمەڵگایە کە هەردەم شانازی بە بوونی بەها بەرزەکان دەکات.

کۆمەڵگای ئێمە ئەو ڕووداوەی جۆرج بەرنادشۆم بیردەهێنێتەوە کە نووسەرێکی بێ ئەرزش لە بۆنەیەکدا ڕەخنەی لێگرتبوو و بەتەوسەوە پێی گوتبوو :تۆ بۆ تەنها لەسەر مادە و پارە و پول و ئابوری دەنوسیت؟ بەرنادشۆش وەڵامی دابوەوە ووتبوی، ئەی جەنابت لەسەر چی دەنوسیت؟ ئەویش گوتبوی: من هەردەم لەسەر بەهاو قیەمە بەرزەکان دەنوسم. بەرنادشۆش وتبوی: هەرکەسەی لەسەر ئەو شتە دەنوسێت کە نیەتی، ئێمەی کوردیش هێندە باسی قیەم و فەزائیل و بەها بەرزەکانی کۆمەڵگای خۆمان دەکەین کەچی چیرۆکی شیرین و بەر لەویش چیرۆکی ئەیوبی فریشتە منداڵ کە بەبەر چاوی هاوسێکانی بە ئەشکەنجەی زڕدایك و باوکە بەرازەکەی کوژرا، دەیسەلمێنن کە کۆمەڵگاکەمان تا چ ئاستێك بێ بەهایە. بێ بەهایی

---

(٣١) کوردستانپۆست، ٢٠/١٠/٢٠١٠.

تەنها بۆ دەسەڵات و حکومەت ناگەڕێتەوە بەڵکو هەموو کۆمەڵگا دەگەرێتەوە بە حزبە علمانیەکان و ئیسلامیەکانەوە بە ئارەق خۆرو مەلاکانەوە بە دەرویش و هونەرمەندانەوە بە حاکم و مەحکومەوە.

ئەگەر ئەو حزبانەی کە خۆیان بە ئیسلامی دەزانن و خۆیان بە پارێزەری ڕەوشت و بەهاکان دەزانن لە جیاتی ئەو سیاسەتە دنیاویانەیان کەمێك گرنگیان بەکێشەیەکی کۆمەڵایەتی وا گەورە دابایەو چەند شوێنێکیان دابینکردبا بۆ داڵدەدانی ئەو ئافرەتە لێقەوماوانە ئەوە ئافرەتان ناچار نەدەبوون بچن بۆ شوێنێکی وەك ئەو شوێنانەی کە هەن کە رۆلێکی نێگەتیڤانەتر دەبینن لە پاڵنانی ئافرەتانی لێقەوماو بۆ باوەشی بەدڕەوشتی و خراپەکاری. ئەگەر حوکمەت بیویستایەو چاودێریەکی توندی ئەو شوێنانەی کردبایە هەرگیز ئەو شوێنانە نەدەبونە گۆڕەپانی تەراتێنی سێکسی مەسولەکان، ئەگەر حکومەت ئاگای لە دەزگای زیندان و ئەحداس بوایە ئەوە ئەو شوێنانە لە زیاتی اصلاح نە دەبونە افساد.

ئینجا سەیرم بەو هەموو خەڵکە دێت، کە بەهەینی جادەکانی دەووروبەری مزگەوتەکانیش بەرماڵ ڕێژ دەکەن بۆ نوێژ، کەچی هەموویان پێکەوە نەیانتوانی منداڵکارێکی وەك شیرین بپارێزن، بەتایبەتی شارێکی موحافزکارو دینداری وەك هەولێر، کە من خۆشم هەولێریم، لەو هەموو گیانی خێرخوازییە جێگای کەسانێکی لاوازی وەك کچ و منداڵانی بێ دەرەتانی لێ نەبێتەوە، دەبێت ئەو خێرخوازییە بەکەڵکی چی بێت.

ئەو حاکم رزگارەی کە بەعسیەکانیش خۆشیان دەوێت، لەبەر ئەو هەموو ڕیزو نەرمونیانیەی کە نواندی بەرامبەر خوێنڕێژێك و تاغیەکی وەك سەدام، کەچی بەرامبەر کچێکی لێقەوماو و قوربانی دەستە نەگریسەکانی ئەو کۆمەڵگا نەخۆشەمان تا ئەو ڕادەیە بێ ئیحساس و بێ بەها بێت، دەبێت چ بەو کەسانە بڵێین کە هیچ دەربارەی یاسا نازانن.

ئەو پیرە مەسیحیەی کە بەدرۆ لە هەولێر بەڕەوشت و سەر ڕاست ناسراون، یەکەم کەس بێت لەگەڵ شاگردێکی موسڵمانەوە دەستدرێژی بکەنە سەر شیرین، دەبێت کێی تر بەهای بەرزی لا مابێت.

باسی کێیتر بکەین، قاچاغچییە بێ ڕەوشتەکان کە لەبیرمە کاتێ لە یۆنان بووین، باسی بە ئەنقەست خنکاندنی پیاوێکیان دەکرد تا دەستدرێژی بکەنە سەر ژنەکەی. باسی ئەو دەجالانە بکەین لە وێنە مەلا لوقمان و مەلا عەلی کەلەکێ وئەوانیتر بکەین.

بەڕاستی کارەساتی شیرین دیوی ناوەوەی کۆمەڵگا نەخۆشەکەمانی بێپەردە نیشان دا، زانیمان ئێمەی کورد تا چەند بێبەشین لە بەهای بەرزو هەتا لە بەهای شارستانیەتی نوێ. هەر دوێنێ بوو ژمارەی پێوانەییمان تۆمار کردبوو لە زۆری جاش و خاینان، ئەو جاش و خاینانەی دوێنێ کە ئەمڕۆ شۆڕشگێڕەکان وەك گلێنەی چاویان دیفاعیان لێدەکەن.

## فەرخەندەکان دەبنە قوربانی مەلا و بانگخوازە توندڕەوەکان[٣٢]

بەر لە مانگێك بلۆگەرێکی بەنگلادیشی ئەڤیجیت ڕۆی، کە لەگەڵ خێزانی بوو لەسەر شەقام دەیان کەسی چەتون بە چەقۆ و بۆڕی و بەرد کوشتیان بەوپەڕی درندایەتیەوە، گوایە ڕەخنەی لە دین گرتوە، مەلا و توندڕەوان و دڕندە دینیەکان بونەتە دین، لای خەڵکانیکی سادە و گوێ لە مستی ئەو توندڕەوانە.

لە ڕۆژی ٢٠١٥/٣/١٩ لە کابولی ئەفغانستان، جەهل و عەقڵیەتی غەوغائی دینی دڕندەو نا مرۆڤ بەهەموو بەهاکانی مرۆڤایەتی، دیسان هەست و سۆزی تاڵاوی دۆڕاندنی ژیاری و مێژوویی و پاشکەوتوویی خۆیان لە جەستەی ئافرەتێکی بەستەزمانی ١١ ساڵ نەخۆش بە نەخۆشی عەقڵی و دەروونی خاڵیکردەوە بە جۆرێک کوشتیان، کوشتنی حەزرەتی مەسیح و جەعدی کوڕی درهەم حەللاج و گیڤاراو هەموو شەهیدانی مێژوو لە چاو شێوازی دڕندانەی شەهیدکردنی فەرخەندە، قەتلی ڕەحیم بوون.

لە وڵاتی غەوغائیەتی دینی، کە مەلا و بانگخواز ئازادن لە تەکفیرکردن و شەیتاندن و هاندانی کوشتنی خەڵك بە جەماعی، بۆ کەسانێکی وەك غەیرە موسڵمان و بێ حیجاب و عەرەقخۆر و نوێژنەکەرو عەلمانی...هتد، زۆر ئاسانە بە وشەیەکی توندڕەوێك، پڕوپاگەندەیەکی دینداریێکی توندڕەوی ئەحمەق چاکترین موسڵمانیش ببێتە قوربانی بیرتەسکی و بێ ئاوەزی و دەروون دڕندەیی ئەو جەماوەرە بێ سەروبەر و گێرە شێوێنەی کە ئەو مەلا و بانگخواز گێرە شێوێنانە دروستی دەکەن. بەس بڕواننە ئەو کەمیەتە زۆرەی لە عونفی لەفزی لە دەمی دینداره گوێ لە مستەکانی ئەو مەلا و بانگخوازانە، ئەو کات دەزانیت چ مرۆڤیکی توندڕەوی بێڕەحم و نا مرۆڤ و پڕ لە قەسوەت و بێ بەهایی دروست دەکەن.

---

[٣٢] - ٢٠١٥/٣/٣٠ میللەت پرێس

ئەو کات دەزانن ئاسایشی میللەت و نەتەوەمان چەند لە مەترسیدایە، ئەگەر هاتوو ئەوانە بەکارهێنران لەلایەن ئەو بانگخواز و مەلایانە بۆ ئەجێندایەکی دژە کورد و دژە مرۆڤ لە ژێر پەردەی دیندا.

فەرخەندەی نەخۆش، تەمەن ٢٧ ساڵ، وەك هەر ئافرەتێکی داماوی تری ئەو وڵاتە بۆ نەخۆشیەکەی دەچێتە لای مەلایەکی نوشتەچی، دیارە یەك دوو نوشتەی دەداتێ و وادیارە پێی گوتوە بیسوتێنە، ئەویش دەیسوتێنێت، کەسانیکی توندڕەو و بێ بەزەیی بەرامبەر ئەو ئافرەتە لاوازە، خەڵکی لێ هاندەدەن و دەڵێن قورئانی سوتاندوە، یەکسەر جەماوەری بێ عەقڵ و بێ ڕەوشتی ئەو میللەتە، کە دەڵێن ئەوروپاش بەقەد ئەوان نێربازی تێدا نییە، ئەو ئافرەتە دەدەنە بەر بەرد و دار و لێدان و سوکایەتی بە جەستەشی دەکەن و تا دەیسوتێنن، بەبەرچاوی پۆلیسە بێهەڵوێست و جاهیلەکانی ئەفغانستان.

لە هەموو تاڵاوتر باوکی فەرخەندە دەڵێت: کچەکەی حافیزی قورئان بووە، دەرچووی کۆلێژی شەریعەت بووە، هەردەم نوێژی خۆی کردوە ناکرێت شتێکی وای کردبێت، بەڵێ ناکرێت مامە گیان، بەڵام جەماوەری بێ مێشکی سەدەکانی تاریکی پێویستی بە لێکۆڵینەوە چیە، ئەوە ژنێکی زەعیفە خۆ قاعیدەی ئەمریکی نییە کە ویستیان لە ساڵی ٢٠١٢ هێرشی بکەنە سەر، هەر بەبیانووی سوتاندنی قورئان، کە ئەویش درۆ بوو، ٣٠ کەسیان بکوژێت لە دووری سەد مەتر لە قاعیدەکەیانەوە، ئەوە ئافرەتێکی زەعیفەی نەخۆش و بەستەزمانە، کێ هەیە لەو کۆمەڵگا دواکەوتوە دینیانە بە ئافرەت نەوێرێت؟ منداڵی نیرێنەش لەو کۆمەڵگایانە زمانیان لەسەر ئافرەت درێژ دەکەن.

پاش کوشتنیشی مەلایەکی توندرەوی بێ بەها، بەناوی محمد نیازی، کە بۆ هەموو ئەفغانستان دەرکەوت کە ئەو ئافرەتە شەهیدە کارێکی وای نەکردبوو، بەبێ تاوان وا دڕندانە کوژرا، هەتا حکومەتی ئەفغانیش ئەو شایەدیەی بۆ دا، زیاتر لە ٣٠ کەس لە بکوژان و پۆلیسی تەماشاکەر گیران،

کەچی هێشتا مەلای توندڕەو لە یەکێك لە گەورەترین مزگەوتەکانی کابول، مزگەوتی وەزیر ئەکبەر خان، لە نوێژی هەینی ڕۆژێك دوای ئەو تاوانە داوای ئازادکردنی مرۆڤ کوژەکانی کرد، چونکە پەروەردەی دەستی خۆیانن.

میانرەوان و ئازادیخوازان و ئافرەتانی ئەفغانستان، سەرەڕای ئەو جەوە تۆقێنەرەی غەوغائیەکان دروستیان کردوە، بەوپەڕی ئازایەتی هاتنە سەر شەقام، بە پێچەوانەی داب و نەریتی گەندەڵی ئەفغان ئافرەتان بە شانی خۆیان تەرمی فەرخەندەی جوانەمەرگیان هەڵگرت و ناشتیان لە تەحەدایەکی بێ وێنە بۆ ئەو ستەمە زۆرەی لە ئافرەتی ئەفغانی دەکرێت، بە هاندانی مەلا و بانگخوازە توندڕەوەکان.

ئەگەر کورد ئاگاداری خۆی نەبێت، بە دووری مەزانن جەماوەرێکی ئاشوبگێڕو گوێ لە مستی مەلا و بانگخوازە توندڕەوەکانی وەك ئەوەی ئەفغانستان و بەڵکو دواکەوتوتریشمان بۆ دروست دەکەن. دەیان فەرخەندەش دەبنە قوربانی وتارە توندوتیژەکانیان[٣٣].

(٣٣) ئەوە لینکی ڤیدیۆکەیە کە ناکرێت بەبی دیتنی هەست بە قەبارەی تاوانەکە بکەیت:
https://www.youtube.com/watch?v=nBtlfkON-cM

## نە ژن فریشتەن هەموویان و نە پیاویش هەموویان ئەهریمەنن[٣٤]

درندەیی پیاو و ئاشتیخوازی ژن لە ژینگەیەکی تەندروست دەردەکەوێت، نەك لە خاكێك (داب و نەریت ، وتاری دینی ، یاسا) هەمووی لە بەرژەوەندی پیاو بێت، پیاوی باش لە نێو ئەو خاکە بە دیار دەکەوێت، ئایە ئەو ژینگەیەی کە لایەنگیری لێ دەکات، بۆ بەرژەوەندی خۆی وەبەری دەهێنێت یان وەك مرۆڤێکی تەندروست مامەڵەی یەکسان لەگەڵ خوشك و ژن و هەموو ئافرەتێك دەکات.

فریشتەیی ژن لەو خاکەی کە پیاوستانە دەرناکەوێت، فریشتەیی ژن لەو وڵاتانە دەردەکەوێت کە یاسا و فەرهەنگ و دامەزراوەکان هەمووی بەلای ئافرەتاندا دەیشکێننەوە، ژن دەتوانێت بە تەلەفۆنێك بۆ پۆلیس پیاوەکەی بخاتە سەر شەقام، تاوانباری کات بە توندوتیژی، نەهێڵێت هەتا منداڵەکانیشی ببینێتەوە، ئەو تورکمانەی لە هەولێر باشە، گرنگ ئەوەیە لە ئەنقەرە باش بێت، یان ئەو مەسیحیەی لە عەنکاوە و شەقڵاوە باشە، گرنگ ئەوەیە لە سوید خۆپیشاندان نەکات لە دژی کورد و پێشمەرگە.

دیاردەیەکی نا هاوسەنگی دزێو لە ناو نێوەندی ڕۆشنبیری کوردی بڵاو و باوە، ناوە ناو سەرهەڵدەداتەوە، بەتایبەتی لە کاتی کارەساتە کۆمەڵایەتیەکان و کوشتنی ژن دا، مەبەستم لە دیاردەی سوک و ڕیسواکردنی پیاوە، پیاو بە گشتی وەک ڕەگەزێك، نەک ئەو پیاوانەی کە تاوانەکەیان ئەنجام داوە. نازانم ئەگەر وڵاتان بەو لۆژیکە حوکمیان کردبا، دەبوایە لە ئوسترالیا هەموو ئێرانیەکی شیعە دەرکرابا، لە ئەمریکا سعودی نەمابا، لە هەولێر کوردیکی ئێرانی نەمابا، لەبەر هەڵەی چەند کەسێکی تاوانبار و نەخۆش و تیرۆرست. بەڵی چەند کەسێك لەبەر هۆی جۆراوجۆر، هەندێکیان باش و هەندێکی زۆر سەلبی خۆیان دەکەنە ساحێبی دۆزی ژن و وەك پیاوێك جوێن بە خۆشیان دەدەن تا بە پیاویتر ڕادەگات، هەندێك لەو

---

(٣٤) خەندان ، ٢٠١٤/١٢/٢٥.

برادەرانە گومان لە هەستی مرۆڤایەتیان ناکرێت، بەڵام زۆر بەخراپی و ساویلکانە گوزارشی لێدەکەن، هەشیانە وەك چیرۆکنووسێکی کوردی ناودار، هەر لەبەر خۆ ڕاوەشان لە پێش ئافرەتان و غەریزەی مێبازی مەرایی دەکات و جوێن بە خوا و ئەرز و ئاسمان و خەڵك و کورد و پیاو دەدات لە یەك جوملەدا. ئەخر برا تۆ کەوتیتە ناو دژەوانەیەکی زۆر ساویلکانە بێ ئەوەی پێی بزانیت، تۆش پیاوی کەچی بەو شێوەیە ئینتیحاریە بەرگری لە ژن دەکەیت، ئایە ئەوە بەڵگە نییە کە هەزاران و سەدان هەزاران و ملییۆنەها پیاوی سەر ئەو زەمینە بەرگری لە ژن و مافی ژن دەکەن؟ من وەك پیاوێك لەسەردەمی زگورتیاتی و پاش پێکهێنانی خێزانیش، بەرگری زۆرم لە مافەکانی ئافرەت کردوە بێ ئەوەی خۆم بکەمە کلاون و موهەریجی ژنان، ئەوانەی ئاگاداری نووسینەکانمن دەزانن سەبارەت بە بەرگری کردنم لە مافە ڕەواکانی ژن لە نێوەندە دینیەکان، چەندین ڕەخنە و تانە و تەشەرم بۆ هاتووە، هەندێکیان تا سەرلێواری تەکفیر کردنیان بردووم، تا ماویشم دژی ئەو داب و نەریت نۆرمە کلتوری و ئاینیە ساختانە دەجەنگێم، کە پیاویش قوربانیەتی، نەك هەر ژن. دەست لەو بەرگریکردنەش هەڵناگرم چونکە ئافرەت لای من نیوەی تەواوکەری هاوکێشەی ئینسانیەتن.

ئافرەتی کورد هەرچەندە بارودۆخی لە ئافرەتی زۆر کۆمەڵگایتری ئیسلامی باشترە، بەڵام بێگومان لە ئاستی پێویست نییە، پێویستی بەکاری باشر و زۆرتر و هاوسەنگتر هەیە، ئەو قسە ڕەق و سوکانەی دژی پیاوانی دەنێرن هیچ لە کێشەکە چارەسەر ناکات، چونکە ئەو زمانەی کە سەرکۆنەی پیاوی پێدەکرێت، زمانی کەسێکی ڕۆشنبیر و دوور بین و هاوسەنگ نیە، هەڵبەتە بەکارهێنانی ئەو تەرزە زمانە بەشایەنی کەسێکی خاوەن غەمی فەرهەنگی هەقیقی نابینم. ئەوە زمانی گروپێکی فێمنستی ئایدیۆلۆژی فاشیل و فاشیستن تا سەر ئێسقان، هەتا لە نیوەندی فێمنستیش ڕەزایان قورسە .ئەوە زمانی فێمیزمی ئەسکەندنافی و فیمینیزی سوێدی توندڕەوە، کە لە فیلمێکی دۆکیومێنتاری کە پێشتر بڵاومان کردۆتەوە دەربارەی توندرەوترین فێمنستانی سەر زەوی کە فێمسنتە سویدیەکانن، ئەوانەی وەك لەو فیلمە دەردەکەوێت بە ئاشکرا دەڵێن: ناونانی پیاو بە ئاژەڵ هێشتا

مەرایی کردنە بۆ پیاو، پیاو تەنها ماشێنێکی زاوزێ کردنە یان دیلدۆیەکی ڕۆیشتوە...یەکێ لە قوربانیەکانی فێمنیزم لەو فیلمە دەڵێت :هەموو پیاوان بکوژن، من پەیوەندیم لەگەڵ زۆر پیاو لە ژیانمدا بڕیوە، من زۆر بەزەحمەت هیچیتر دەتوانم پەیوەندیم هەبێت بە پیاوی تر. هەستێکی خۆشە هەر لە دەوروبەری کچان بێت، ئەو دەوروبەرەی کە تێیدا دەتوانێ خۆت بێت. ئەو فێمنستە توندرەوە ڕادیکاڵانە خۆیان ئامادە دەکەن بۆ جەنگی جیهانی هەرماجیدۆنی ژنان و پیاوان، جەنگ لە دژی ئافرەت لە جیهان و سویدیش دەگوزەرێت. ئێمە ئامادەباشی دەکەین لە پەناگاکان و لە ڕێکخراوەکانی تری ئافرەتان، ئێمە نەخۆشخانەی مەیدانی دروست دەکەین.

بۆیەش فێمنستی سویدیمان بە نمونە هێنایەوە، چونکە زۆربەی هەرە زۆری فێمنیزمی کوردی بە پیاوە فێمنستەکانیشەوە، لەو کانیاوە لێڵ و نامرۆیی و فاشیستەی فێمینیزمی سویدی ئاویان خواردۆتەوە، هەڵگری هەمان تێڕوانین و بیرە شەڕانگێژیەکانیانن. ناکرێت نە ئافرەتانمان، نە پیاوانمان ئەو زمانە سەقەت و وتارە ڕەگەزیە فاشیستە بەکاربهێنن لە دژی پیاودا، کە لەوانەیە ژمارەیان لە ژمارەی ژنانی فێمنستی ئاکتیڤ زۆرتر بێت، لەوانەی کە خەبات دەکەن بۆ مافەکانی ئافرەتان.

بەڕاستی دوورە لە دادگەری و ئینسافەوە ئەو هەموو قوربانیانەی باوکانمان بۆ ئێمەیان داوە لە کارکردنی بەردەوام و لەبەر سەرما و سۆڵ و گەرمایی، ناچار بوونە تەنازول بۆ هەزاران کەسی هیچ و پوچ بکەن، بەس لەپێناو ئەوەی منداڵەکانیان لە کچان و کوڕان و ژنەکەیان ئاتاج بە کەس نەبن، چوونە بۆ بەرەکانی شەڕ بۆ پەیداکردنی پاروە نانی خێزانەکەیان بەوپەڕی لە خۆبوردەیی و میهرەبانی و خۆشەویستیی، عار و شورەیی نیە ئەو هەموو قوربانیانەی پیاوان لەبیر بکەین و، بڵێین پیاو بەس هێزی هەیە و سۆزی نییە. ئێمە نابێت بەو چاوە سوکەوە سەیری پیاو بکەین، دەبێت ڕەخنە لەو داب و نەریتە دزێوانە بگرین کە ئەرکی جێبەجێکردنی ئەو داب و نەریتەی بە دژی ئافرەتانی خستۆتە سەر شانی پیاو. نە ژن فریشتەن هەموویان و نە پیاویش هەموویان ئەهریمەنن، لە وڵاتێکی ئەسکەندنافی

بووم چیرۆکی بەدڕەوشتی و بێ بەهایی وام دەبیست لە ژنانی کورد، هەر مرۆڤ لەگەڵ بیستنیدا باشە ڕقی لە هەموو ڕەگەزی ئافرەت نابێتەوە.

یەك نمونە: کابرایەك شەو و ڕۆژ سێ چوار منداڵی خۆیی و ژنەکەی بەخێو دەکرد، کاریشی هەبوو لەبەر خاتری ژنەکەی، لە ماڵەوە دانیشتبوو بێکار تا بوار بۆ ژنەکەی خۆش کات بخوێنێت و ڕەگەزنامە بە دەست بهێنێت، لە قوونی منداڵ شوشتنەوە و ناندانیانەوە بگرە تا دەگاتە جل شوتن و قاپ شوشتن و چێشت لێنان و بردنە قوتابخانەو بردنە دەرەوە بۆ یاری هەمووی لەسەر شان بوو، کەچی ژنەکەی لە خوێندندا دەستی لەگەل مناڵـە ورتکەیەکی هەرزەی لە خۆی بچوکتری بە چەندین ساڵ تێکەڵ کردبوو، بەدزی پیاوەکەی دەچوە ماڵی ئەو منداڵەو دەشیهێنایەوە ماڵەکەی خۆشیان، کاتێ پیاوەکە ڕۆژێك بۆ دەرەوەی شار ڕۆیشتبا، پاش جیابوونەوەش، ئێستا ژنەکە هەوڵی ئەوەش دەدا باوکەکە مناڵەکان هەر نەبینێت، هەرچەندە مناڵەکان باوکیان لە دایکیان خۆشتر دەوێت، لەبەر ئەوەی هەر باوکەکە خزمەتی کردوون، ئەویش بێخەم لەگەڵ منداڵە ئیمۆکە ڕادەبوێرێت، دەیان چیرۆکیتری بێویژدانی ژنانم دەستکەوتوە، کە پیاوی خۆیان بە کوشت داوە بۆ زەوقێك، کچی بچوکی خۆی کوشتوە، چونکە بە پەیوەندی دایکی زانیوە، بێگومان من ناڵێم پیاوەکان فریشتەن، بەڵام ناشڵێم ئەهریمەنن، ناشڵێم ژنان فریشتەن و هەڵبەتە ناشڵێم ئەهریمەنن. بەڵام کە ژن لە کوردستان هیچ ناکەن ئەوە ژینگەکەیە وای لێکردوون کە هیچی ئەوتۆیان پێ نەکرێت.

بۆیە دەبێت هەوڵی پەروەردەیەکی هاوسەنگی هەردوو ڕەگەزەکە بدەین لەسەر بنچینەی هەق، نەك هێز .لە هەر شوێنێك ستەم هەبوو دژی ژن دەبێت بەشێوازێکی هاوسەنگ بەرەنگاری بینەوە، نەك بە سوکایەتی کردن بە پیاو.

# ئافرەت و توندڕەوی ئایینی
# بەشی دووەم

## تەوەری یەکەم: ئافرەت و توندڕەوی ئایینی

- تەحەیوز دژی ئافرەتان
- دەربارەی خەتەنەکردنی مێینە
- عەقلیەتی نیوبینی ئافرەتان
- ئایە جنۆکە بەس دەچێتە لەشی فەقیرحاڵ و موغەفەلەکان
- خۆت بپارێزە لەو دەستەواژانە
- حەدیسە هەڵبەستراوەکان و کاریگەریەکانی لەسەر پێگەی ئافرەت

## تەوەری دووەم: سەلەفییەت و کێشەی ئافرەت

### ١- پیرۆسترۆیکای سەلەفییەت

- ڕەبیعی مەدخەلی: ئافرەت جێگای متمانە نین
- ئەو کۆمەڵگایەی تاڵیبان و هاومەشرەبەکانیان موژدەی پێ لێدەدەن
- سەعوەدە و ڕەبابە ژەنین لە قەدەغەی ئافرەت لە لێخوڕین
- گەڕانەوە بۆ سەردەمی جاریە و کەنیشکەکان
- کەناڵی ابن العثیمین و نوکتەیەکی لەسەر ئافرەت
- آمنة نصیر بە شێخانی سەلەفیەت

### ٢- نا بۆ بە سعودی کردنی ئافرەتانمان

- خوشکانی کۆمەڵ و قوتابخانەی ((واللە لنمنعهن))
- کەناڵی سپێدە و پەتای داعشیەت یەکگرتوو کەوتۆتە ژێر کاریگەری سەلەفیەکان
- فرەژنی مۆدەی گەندەڵ و ئیسلامیەکان
- هێرشی تێزاب acid attack گەیشتە کورستانیش
- نا بۆ بە سعودی کردنی ئافرەتانمان
- هەولێر و دینداری مەلا سوسەیی وەک نمونە

- مەلای خەتێ یان مەلای سوسێ
- ئیبن ڕوشد و ئازایەتی کورد
- شێخ مستەفا زەڵمی و چەند سەرنجێك

## تەوەری سێیەم: حیجاب

**١- حیجاب یەکەمینی یەکەمەکانە**
- حیجاب یەکەمینی یەکەمەکانە
- ئەردۆگان و هیستریای حیجاب لە نێوان سیاسی و ئاینیدا
- کەس بەبێ حیجابی کافر نابێت، مەلا شارستێنی
- ئەگەر مەلا شارستێنی وتاربێژی میانڕەو بێت باشترە وتاردان قەدەغە بکرێت
- مەلاکانی کوردستان وچیرۆکە سەرەڕۆکانی نیقاب و حیجاب
- گفتوگۆی دوو مونەقەبە لەبازاڕێکی شەعبیدا
- نامیلکەی چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ کەنیزەکانی داعش

## ٢- وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان

**٢- وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان**
- وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان ١-٣
- وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان ٢-٣
- وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان ٣-٣
- ئەرستۆ وەك دامەزرێنەری فەلسەفەی چەوسانەوە و نزمێتی ئافرەتان

## تەوەری یەکەم: ئافرەت و توندڕەوی ئایینی

- تەحەیوز دژی ئافرەتان
- دەربارەی خەتەنەکردنی مێینە
- عەقلیەتی نیوبینی ئافرەتان
- ئایە جنۆکە بەس دەچێتە لەشی فەقیرحاڵ و موغەفەلەکان
- خۆت بپارێزە لەو دەستەواژانە
- حەدیسە هەڵبەستراوەکان و کاریگەریەکانی لەسەر پێگەی ئافرەت

# تەحەیوز دژی ئافرەتان

## لە لایەن موسڵمان و سەرچاوەکانی ئیسلامدا هەیە[٣٥].

ناوەندە فەرهەنگیەکان و بزاڤە فیێمنستیەکان و ئافرەتان لە جیهانی ئیسلام لە زۆر بۆنەدا ئیسلام و موسڵمانان بەوە تاوانبار دەکەن، کە زۆربەی سەرچاوەکانی لە ڕوانگەی پیاوان نوسراوەتەوە: لە فیقە و تەفسیر و حەدیس و هەندێکیان هەتا عەقیدەش بڕ دەکەن. بێگومان نووسەرانی ئیسلامی بەتایبەتی و موسڵمانان بەگشتی وەڵامێکی زۆریان بۆ ئەو تۆمەتانە نووسیوە، هەزارەها لاپەڕیان ڕەشکردۆتەوە بەستایشی هەموو هەڵوێستێکی فیکرو بەرهەمی ژیاری ئیسلام بەرامبەر بە ئافرەت.

بەش بە حاڵی خۆم لە زۆر حەدیس و مەسایلی فیقە و تەفسیر هەستم بەدزەکردی ئەو تەحەیوزە کردوە، یان جۆرێک لە تەحەیوز و نا یەکسانی هەتا سوکایەتیشم بەرچاو کەوتوە لە دژی ئافرەت. وابزانم زۆر تێربووین لەو نووسینانەی کە سەرتاسەری گوڵباران کردنی ئافرەتە بە هەڵوێستەکانی ئیسلام بەرامبەری، کەچی لە واقیعدا وێنەکە زۆر دوورە لەو هیوایە کەسك و پەمەییانەی هەندێک لە نووسەران لەسەر کاغەز دەینەخشێنن.

بۆ نمونە کە حەزرەتی عائیشە گوێی لە حەدیسێک بوو ئەبو هورەیرە و کەسانی تر دەیگێڕنەوە دەڵێت: ئەوەی نوێژ دەبڕێت بریتین لە ئافرەت و گوێدرێژ و سەگ، وەک موسلیمیش ڕیوایەتی کردوە:(یقطع الصلاه المرأة و الحمار و الكلب) عائیشە گوتی: (ئێمەتان بە کەرو سەگ چواند، قەسەم بەخوا پێغەمبەرم دیوە نوێژی کردوە، منیش لەسەر چوارپایەکەم ڕاکشا بووم لە نێوان ئەو و قیبلەدا (فقالت عائشه شبهتموها بالحمير و الكلاب و الله لقد رأيت رسول الله يصلى وأنا على السرير بينه وبين القبله مضطجعه) کەسانێکی دەق پەرست تا ئێستاش بەرگری لەو جۆرە حەدیسانە دەکەن گوایە ناو

---

(٣٥) ڕۆژنامەی ستاندەر ، ٢٠٠٨/١/٣٠.

هێنانی (ئافرەت و گوێدرێژ و سەگ) لە یەک سیاقدا مانای وەک یەکی لە هۆی بڕینی نوێژ ناگەیەنێ. چونکە (الاقتران فی النظم لا یستلزم الاقتران فی الحکم) وەک بڵێی ئەو نوسەرانە لە حەزرەتی عائیشە عەرەبی زانتر بن، ئینجا قسەی ئەبو هورەیرە پەسند دەکەن بەسەر قسەی عائیشە (ڕەزای خوایان لێ بێت) هەرچەندە زانایی و نزیکی عائیشە لە پێغەمبەر زۆر زۆرتر بوو لە ئەبو هورەیرە، بەڵام لەوانەیە بەس لەبەر ژن بوونی عائیشە ئەو هەڵوێستە وەرگیرا بێت.

لەبەر بوونی توراسێکی زل و زەبەلاح لەو تێڕوانینە کەم و کورتە دەرهەق بە ئافرەت، زۆر جار هەڵوێستەکان بە شێوەیەکی ویستی و خۆنەویستی بەدژی ئافرەتدا دەشکێنەوە. هەڵوێستی ئیسلامیەکانی کوێت (بە سەلەفی و ئیخوانەوە) لە دژی دەنگدان و خۆ کاندید کردنی ئافرەتان چەندین ساڵ بەبیانوی حەدیسێک، هەڵوێستی نێگەتیڤی ئیسلامیەکانی یەمەن، کە لە ئاکامدا بە دەنگی ژنان لە هەڵبژاردندا دۆڕان. لە هەمووی سەیرتر لە ئەزهەر کۆڕبەندی [مەجمەعی] لێکۆڵینەوەی ئیسلامی کە لە ٣٠ زانای پیاو پێک هاتوە بە تێکڕای دەنگ دژی هاتنی زانایەکی ئیسلامی ئافرەت بوون بۆ بوونە ئەندام لەو مەجمەعە، زاناکەش نە نەوال سەعداوی بوو، نە فاتیمە مەرنیسی بوو بەڵکو ئافرەتێکی ناودار بوو کە پێی دەڵێن موفتی ئافرەتان دکتۆرە (سعاد سالح) ڕاگری پێشوی کولێژی توێژینەوەی ئیسلامی لە ئەزهەردا، کە دەڵێت:"ویستم ئەو کۆتە بشکێنم کە بەسەر زانایانی ئافرەت سەپێندراوە بۆ چوونە ناو مەجمەع، کەچی تەنها یەک دەنگم هێنا لە کۆی ٣٠ دەنگدا، ئەوەش شێلگیری ئەندامە پیاوەکان دەردەخات لەسەر ڕێگرتن لە هاتنە ناوەوەی ئافرەت بۆ مەجمەع بەبێ ڕەچاو کردنی ئاستی زانستی و کەفائەتی، کە هەندێک جار لە هی ئەندامە نێرینەکان زیاترە... ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە بیری نێرسالاری زاڵە بەسەر مەجمەعدا".

زانایەکی تر دکتۆرە (مەلیکە یوسف) مامۆستای شەریعەت لە زانکۆی قاهیرە لەو بارەیەوە دەڵێت:"ئەگەر هەر پیاوێک ستەم لە ئافرەت بکات لەوانەیە عوزری بۆ بهێنینەوە بە نەفامی، بەڵام چ عوزرێک بۆ زانایان

بهێنینەوە کە چاوەڕوانیان لێدەکرێت پەرۆشی دادپەروەری بن، بەڕێزی ئیسلام بۆ ئافرەت بزانن".

زانایەکی تر دکتۆرە (ئامینە نەسیر) ڕاگری پێشوی کولێژی توێژینەوەی ئیسلامی لە ئەسکەندەرییە، دەڵێ:"ئەو ڕەفتارانەی کە لە زانایانی ئاینی دەرچوون بە هەڵگەڕانەوەیەکی فیکری و شارستانی دێتە حسێب کردن، قەدەغەکردی ئافرەتی زانا و لێوەشاوەیە لە تاوتوێ کردنی کێشەکانی خودی خۆی، تا بە تەنها پیاوان ببنە خاوەن ڕاو ڕاوێژ وەک بڵێی ئافرەت هەر نەبن".

ئەگەر ئەوە حاڵی دەمارگرژی نێرسالاری بێت لە ئەزهەر کە ناسراوە بەمیانەڕەوی و سنگ فراوانی و لێبوردەیی، ئەی دەبێت حاڵی تەحەیوز کردن لە دژی ئافرەتان چۆن بێت لە لایەن سەلەفیە بێ حەوسەلەکان کە پێیان کوفرە ئوتۆمبیل لێخوڕیت، یان وێنەی لەسەر ناسنامەی خۆی هەبێت، بەڵکو سەرتاسەری قەوارەی ئافرەت لە نەزەریان بریتییە لە عەورەتێک و هیچی تر.

# خەتەنەکردنی مێینە[٣٦]

دڵخۆشم بەو ڕێکلامە هوشیارکەرەوەی کە دەیکەن لە دژی خەتەنەکردنی ئافرەتان لە تەلەفزیۆنە کوردیەکان. من دەقی ئەو قسانەم گوتوە چەندین ساڵ پێش ئەو ڕێکلامە، ئەوە نمونەی وتارێکی ساڵی ٢٠١١ یە دەربارەی خەتەنەکردنی مێینە.

خەتەنەکردنی مێینەش کە هەندێك مەلای کوردستان شەڕی مان و نەمانی لەسەر دەکەن، ئەوە لە قورئاندا هەر باسیشی لێنەکراوە، لە حەدیسیشدا ئەوەی هاتووە ئاراستەی دەمی لە نێرە، جگە لە چەندین حەدیسی لاوازداو لە سیرەشدا یەک بەڵگە نییە کە پێغەمبەر هیچ یەکێک لە کچەکانی خەتەنە کردبێت، ئەوەشی دەڵێت پێغەمبەر لە رووی نەهاتوە باسی بکات، وەک چۆن بەرچاوم کەوتووە، ئەوە ئەو سەختگیرە نە لە ئیسلام نە لە پێغەمبەر باش تێنەگەیشتوە تاوانیش دانە پاڵ پێغەمبەرە بە نەگەیاندنی هەموو پەیامەکەی. لەوەش سەیرتر خەتەنەکردنی مێینە لە مەنزڵگای وەحیشدا (دورگەی عەرەب و سعودیەش) بوونی نییە ئەو وڵاتەی کە فقهاکان (عمل اهل المدينه) کاری خەڵکی مەدینە بە سەرچاوەیەکی شەریعەت دادەنێن. ماقولە ئەو هەموو هەقیقەتە پشتگوێ بخەین هەر لەبەر خاتری قەولێک لە کتێبێکی مەزهەبێدا و هەموو ئافرەتانمان لە پێناویدا سەقەت بکەین، نەخێر ئەوە ناکەین، با ئەو قەولە نەک هی شوێن کەوتەکانی شافیعی با هی خودی شافیعیش بێت.

بێگومان خەتەنەکردنی مێینە چەند جۆرێکی هەیە، هەرە باشەکەی سەقەتکردنی جەستەی مێینەیە (Female genital Mutilation) بە مانای وشە دەتوانین سەدان زیانی خەتەنەکردنی مێینە بژمێرین هەتا شێخ یوسفی قەرەزاوی لە سالی ٢٠٠٩ فەتوایەکی دەرکرد بە پشت بەستن بە ئەنجام گەلێکی چەندین توێژینەوەی زانستی کە کەسانی متمانەدار پێی هەستا

(٣٦) ٢٠١٥/٣/١١ فەیسبوك.

بوون، کەوا خەتەنەکردنی مێینە نە فەرزێکە تا جێبەجێ بکرێت، سەرباری زیانبەخشیشە بە ئێستا و دوارۆژی ئافرەتان، شێخ قەرەزاوی لە فەتواکەیدا ئاماژەی بەوە کرد، کە سکالا و دادی ئافرەتانی خەتەنەکراو زۆر بووە، دەناڵێنن بە کاریگەری نێگەتیڤی ئەو خەتەنەکردنە بەسەر ژیانی هاوسەریان بۆیە شێخ یوسفی قەرەزاوی دەگاتە ئەو دەرەنجامەی:" بۆیە منیش دەنگم دەخەمە پاڵ ئەوانەی دەڵێن هیچ پاکانەیەک لە گۆڕێدا نییە تا بەردەوام بین لەو عادەتە (واتە خەتەنەکردنی مێینە) لە ئیسلامیشدا هیچ بەڵگەیەکمان نییە نە لە قورئان و نە لە سونە و نە لە ئیجماع و نە لە قیاس و نە لە مەسلەحەت کە وامان لێبکات دەستبگرین بەو عادەتەوە، بە پێچەوانەوە هەموو بەڵگە شەرعی و واقیعیەکان هانمان دەدات ئەو عادەتە (واتە خەتەنەکردنی مێینە) قەدەغە بکەین، بۆیە من فەتوا دەدەم بە قەدەغە کردنی ئەو عادەتە لە پێناو سەلامەتی ژن و کچانی موسڵمان و منداڵی موسلمان و پاراستنیان لە هەر زیانیک".

کەوا بوو قەدەغە کردنەکە لەلایەن گەورەترین فەقیهی هاوچەرخدا هاتوە، نەک لە کۆنگرەی جولەکەکان لە پەکین وەک مەلا توندرەوەکانی هەولێر و کوردستان لە هەندێك لە وتارە ئاگرینەکانیان ئاماژەی پێدەکەن.

خۆزگە خەڵکی کوردستان و بەتایبەتی شارەکەشم هەولێر دینداریەکی هوشیارانەتریان کردبا نەک هەر رۆژەی مەلایەک فریویاندا. لەسەر شانی ئەوان گەورەبن و ناودار بن، دوایش دەنگی پێ بدەن تا بچێتە پەرلەمان، لەوێش ببێتە بتێکی بێ دەنگی مووچە خۆر، زۆر نەنگییشە بۆ هەرکەسێ ئەلف و بێی فەرهەنگی هەبێت چەپڵە بۆ کەسانێکی وا دژە مێینە و ئافرەت و دژە ئازادی لێبدات، یان فریو بخوات بە قسەکانی سەر منبەریان، چونکە کاتێ مینبەر جێ دەهێڵن ئیتر لە پەرلەمان هیچیان پی نییە بیڵێن، چونکە ئەوێ مزگەوت نییە بە کەیفی خۆیان قسە بکەن و خەڵکیش ناچار بێت گوێیان بۆ ڕاگرێت. ئەو وتارە توندەی زۆر لە مەلایان پەیڕەوی دەکەن لە دژی ئافرەتان لە کافر کردنیان لەسەر حیجاب و لە هاندانی باوک و مێردو برایان بۆ بەکارهێنانی توندوتیژی لە دژیان، بەڕای من خیانەتێکە بە خودی

ئیسلام و نیوەی میللەتی کوردی دەکەن، وەك شێخ محمد الغزالی گوتەنی، ئەوەی ژن دەچەوسێنێتەوە بە ناوی دین خیانەتکارە بە ئیسلام و بە دین.

# عەقلیەتی نیوبینی ئافرەتان(٣٧)

زۆر دەمێکە بیر لەو بە نیوبینینەی فەقیهەکان دەکەمەوە بۆ ژن، بۆچی وای لێهاتوە خودی ژن و خوێنی و کەرامەتی و نرخی بە نیوە دەبینن. ئەوەی ئەو بابەتەی خستەوە یادم نامە کراوەکەی بێگەرد تاڵەبانی، ئەندامی پەرلەمانی کوردستان لە فراکسیۆنی کەسك بوو کە ئاڕاستەی عەلی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی کردووە، دەڵێ: "دەمەوێت دوور لەسیاسەت بەڵکو وەك ژنێك بۆ داکۆکی کردن لە هاوکارانم کە لەسەر لیستەکەی بەڕێزتان ئەندامی پەرلەمانن داوای روونکرنەوەت لێبکەن ....بەپێی زانیاریەکانم باجێکتان داناوە لەسەر مووچەی پەرلەمانتارەکانتان کە تا ئێرە دەسەڵاتی خۆتانە، بەڵام ئەوەی سەرسوڕمانی دروستکرد لای من ئەوەیە کە باجی ژنە پەرلەمانتارەکانتان دوو ئەوەندەی باجی پەرلەمانتارە پیاوەکانتانە". یانی ئەگەر دەستکەوت دابەش بکرێت وەک میرات: للذکر مثل حظ الانثیین جێبەجێ دەکرێت، کە پیاوەکە دوو بەش بەرامبەر یەك بەش بۆ ژنەکە وەربگرێت! باشە ئەوە ئایەتە أمنا باللّٰه.

بەڵام کە باج خرایە سەر مووچەی ئەندامانی پەرلەمان ئایەتەکە ئاوەژوو دەکەنەوە و دەبێتە للانثی مثل حظ الذکرین، بەڕای من ئەو عەقلیەتە نیوبینیەی ژن هەمووی لەسەر قیاسی شەهادەت دان و میرات بەشکردندا هاتووە، واتە مادام قورئان لە میراتدا دەڵێت: ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾ ، مادامەکێ لە شایەدی داَن دەڵێت :﴿وَاسْتَشْهِدُواْ شَهِيدَيْنِ من رِّجَالِكُمْ فَإِن لَّمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ﴾ کەوابوو ئەو بە نیوەکردنەی میراتَ و شایەدی ئافرەتان لە ئاست پیاواندا، هانی فەقیهەکانی ئیسلامی داوە لە چەندین بابەتی تر ژن بە نیوە بکەن. بەڕای من تێڕوانینی کۆمەڵگای عەرەبی پێش ئیسلامیش ڕۆڵێکی بەهێزی هەیە لە فۆرمەڵەکردنی ئەو تێروانینە نیوبینیەدا، عەرەبەکانی جاهیلیەتی پێش ئیسلام دەیانگووت:"تەنها ئەو کەسە میراتمان دەگرێت کە شمشێر هەڵبگرێت و

---

(٣٧) خەندان ، ٢٠١٤/١٢/٢٠.

بتوانێت پارێزگاریمان لێبکات" "لا يَرِثُنا إلا من يحمل السيفَ ويَحْمي البيضة".

هەموو مەزهەبەکان لەسەر ئەو بە نیوە بینینەی ئافرەتان کۆکن، لە ژێر کاریگەری ئەو دوو پاڵنەرە فەقیهەکان هاتن خوێنبایی [دیە]ی ئافرەتانیان بە نیوەکرد بە چەندین حەدیسی زەعیف و بێبنەما. لە بیانووویان بۆ پاکانە هێنانەوە بۆ ئەو پرەنسیپە نادروستەی بەنیوبینینی خوێن و ژیانی ئافرەتان دەڵێن: ئیجماعی سەحابە هەیە لەسەر دیە، خوێنبایی ئافرەتان نیوەی خوێنبایی پیاوە، ئەوەش بۆ کەمڕێزی و بچوك کردنەوە نیە، چونکە زیانی ماددی بە کوشتنی ئافرەت کەمترە لە کوشتنی پیاو، فەقیهە هاوچەرخەکان لەژێر کاریگەری چەمکە مرۆییەکانی سەردەمدا زۆر برو بیانوو دەهێننەوە بۆ پاکانە کردن بۆ ئەو نیوبینییەی ژنان، بەڵام فەقیهە کۆنەکان هەردەم ڕاستگۆترن و ڕاستەوخۆ هۆکار و عیلەتی ئەحکامەکانیان ڕاستەوخۆ دەڵێن.

ئیبن حەزم لە إعلام الموقعين بە ئاشکرا دەڵێت:" بە نسبەت دیە، خوێنبایی یەوە، لەبەرئەوەی ئافرەت ناقیسترە [کەمترە] لە پیاو، پیاو سودی زیاترە لەو (ئافرەت)، چونکە پیاوان بۆشایگەلێك پڕ دەکەنەوە، ئافرەت پێیان پڕ نابێتەوە، لە بواری پایە دینیەکان و هەڵسوڕاندنی ویلایەتەکان و پاراستنی سنورەکان و جیهاد و ئاوەدان کردنەوەی زەوی، ئەنجامدانی پیشەسازی، کە بەرژەوەندی گشتی بێ ئەو پیشەسازیانە نایەتە دی، بەرگری کردنیان لە دنیا و دین، بۆیە نرخی ئافرەتان یەکسان نییە لە دیە و خوێنبایی. خوێنبایی ژنان وەک خوێنبایی کۆیلە و ماڵ و سامانیتر حسێب دەکرێت، حیکمەتی خوای خاوەن شەرع وا پێویستی کرد کە نرخی ئافرەتان بکاتە نیوەی نرخی پیاوان ، لەبەر ئەو جیاوازیەی لە نێوانیاندا هەیە".

قال ابن القيم رحمه الله في: وأما الدية فلما كانت المرأة أنقص من الرجل، والرجل أنفع منها، ويسد ما لا تسده المرأة من المناصب الدينية والولايات وحفظ الثغور والجهاد وعمارة الأرض وعمل الصنائع التي لا تتم مصالح العالم إلا بها، والذب عن الدنيا والدين لم تكن قيمتهما مع ذلك متساوية وهي الدية، فإن دية الحر جارية مجرى قيمة العبد وغيره من الأموال، فاقتضت

حكمة الشارع أن يجعل قيمتها على النصف من قيمته لتفاوت ما بينهما. ا.هـ والله أعلم.

لە عقیقە [گوێزەبانە]ـدا، واتە کاتێ منداڵ لە دایك دەبێت بۆ کوڕەکە دوو ئاژەڵ سەردەبڕێت و بۆ کچ یەک ئاژەڵ، بێگومان دەیان فەرمودەو قەول و ئیجتیهادیان دروست کردوە بۆ سەلماندنی مەشروعیەتی ئەو بەنیوەکردنە، باوەڕتان بێت مرۆڤ وەك باوک، ئەگەر شعوری هەبێت شەرم دەکاتەوە ئەگەر کوڕی بوو دوو ئاژەڵ سەربڕێت و کە کچیشی بوو یەك ئاژەڵ، واتە ئەگەر کچ و کوڕێکی بوو لە یەك زگدا دەبێت لەبەر خاتری ئەو ڕێکەوتە یا قەدەرە بایۆلۆژیەی Y و Xکە هێلکەی دایکەکە دەپیتێنێت، دەبێت دوو ئاژەڵ بۆ Y و Xبکەیتە گۆزەبانە، ئەگەریش X و Xبوو کە دەبێتە کچ، یەك سەر ئاژەڵی بۆ سەربڕی.

لە مەسەلەیەکی تری هەستیاردا، کە ئازادکردنی بەندەیە، ئەبو هوریرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر [د.خ] فەرمویەتی: «أيما امرئ مسلم أعتق امرءا مسلما استنقذ الله بكل عضو منه عضوا من النار»، [هەر کەسێکی موسڵمان، موسڵمانێکی ئازاد کرد لە بەندایەتی ، خودا بە هەر ئەندامیکی لەشی بەندەکە، ئەندامێکی لەشی ڕزگار دەکات لە دۆزەخ] لەو حەدیسە ڕەگەز دیارینەکراوە زۆر ماقوڵە، بەڵام ئەو عەقلیەتە نیوبینیەی ژنان هەداناداتا تا ڕیوایەتێکی تر دروست دەکات، وەك لە ترمذی دا هاتوە، کە پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی:( لم أعلم مخالفاً من أهل العلم قديماً ولا حديثاً في أن دية المرأة نصف دية الرجل) (هەر موسڵمانێك دوو ژنی موسڵمان ئازاد بکات، دەبنە ڕزگارکەری لە ئاگر)، واتە هەر دوو سەری ژنەکان سەرێکی پیاوەکە ڕزگار دەکەن، چوارپێی ئەوان دوو پێی پیاوەکە و هاکەزا..

نازانم چ عەقڵیەتێکە بەدوای شتی وا نا ئینسانی و بێ مانا دەگەڕێت بۆ جەختکردنەوو لەسەر ئەو عەقلیەتە نیوبینیەی ژنان، کاتی ئەوە نەهاتووە ئەو نیوبینیەی ژنان لە فیقە و تێڕوانینی دینی و مرۆییمان بسڕینەوە. لە دەستوری قەتەردا شێخ یوسف القرضاوی بڕیاری یەکسانیدا لە خوێنبایی نێوان ژن و پیاودا، دەڵێت:"بەنیوەکردنی خوێنبایی ژنان هیچ بەڵگەیەکی

ڕاست و ڕاشکاو مانای نییە نە لە کیتاب و نە لە سونە، هەرچەندە ئیمامی شافیعیش دەڵێت: لم أعلم مخالفاً من أهل العلم قديماً ولا حديثاً فى أن ديه المرأه نصف ديه الرجل. (هیچ ناکۆکێکم لە ئەهلی عیلم نەدیوە ، نە کۆن و نە نوێ، کەوا خوێنبایی ژنان نیوەی پیاوە).

لە کۆنەوەش کەسانێکی زانای وەك أبو بكر الاعصم، ابن عليه، لە نوێکانیش شێخ محمود شلتوت لە کتێبی الإسلام عقيده و شريعه، محمد أبو زهره لە کتێبی العقوبه و شێخ قەرەزاوی بڕوایان وایە کە خوێنبایی ژنان یەکسانە بە خوێنبایی پیاوان. بەڕای من هەتا ئەو دوو ئایەتەی میرات و شەهادەت دانیش ئەگەر لە هۆکارەکانی وردبینەوە، دەردەکەوێت هیچ موبەریرێکی واقیعی نەماوە، لە سایەی ئەو گۆرانکاریە گەورەیەی بەسەر دۆخی ئافرەتاندا هاتوە، لە ڕووی پێگەیشتنی زانستی و کامڵبوونی مرۆیی و توانا عەقڵیەکانی، کە ناکرێت بە هیچ جۆرێک بەراورد بکرێن لەگەڵ ژنانی سەردەمی پەیام. جاروبار پێویستمان بە ئیجتیهادە لە (نص)یش، نەك وەک دەڵێن: ئیجتیهاد نییە لەگەڵ بوونی دەقدا، لا اجتهاد مع النص.

## ئایە جنۆکە بەس دەچێتە لەشی فەقیرحاڵ و موغەفەلەکان[38]

شێخ علی بن مشرف العمری یەکێکە لە گەورەترین شێخە تایبەت و پسپۆر لە -زانستی- دەرکردنی جنۆکە لە سعودیە و قوتابی بن بازە، زیاتر لە (٢٠) ساڵ بەس خەریکی دەرکردنی جنۆکە بووە لە لەشی فەقیرحاڵەکان، پاش ئەو تەمەنە درێژە تۆبەی کرد لەو پیشەیە فریودەرەی خەڵکی ئاسایی، لە ڤیدیۆیەکدا[(٣٩)]، دەڵێت، ئەوەی دەگووترێت لەو بابەتە هیچ بەڵگەیەکی دینی قورئانی و سونەی لەسەر نییە، تەنها فریودانی خەڵکە، لە هەمووی خۆشتر دەڵێ: بەڵگەی سەرەکی لەسەر درۆیی ئەو شتە ئەوەیە، ئەگەر نەخۆشیەک بۆ نمونە وەک شەکرە هەبێت، دەبینین زۆر بڵاوە خەڵکی هەمووی لە جۆرەها چین و توێژ تووشی دەبن، بە زاناو نەزان و دەوڵەمەند و هەژارو نێرو مێ و گەورەو بچووك، کەوابوو شەکرە ڕاستە، بەڵام جنۆکە چوونە جەستەی مرۆڤ، بە درێژایی ئەو هەموو ساڵانەی کە کارم چارەسەری دەرکردنی جنۆکە بوو، تەنها دەچووە لەشی دەبەنگ و گێل و فەقیرحاڵەکان، ڕۆژێك نەمدیت بچێتە جەستەی زانایەک یان دکتۆرێك یان عەلمانیەك کە باوەری بە دینیش نەبێت، سبحان الله تەنها دەچێتە جەستەی دەبەنگان.

دەڵێت، ڕۆژێك ژنێك هاتە لام ٢٠ ساڵ فریویان دابوو بەوەی کە جنۆکە چۆتە لەشی و تووشی مەس هاتوە، دەڵێت: پێمگووت: تۆ چووزانی مەست هەیە؟ دەڵێت گووتی کە قورئانم لەسەر دەخوێنن یەکسەر تووشی سەرع و هاوارکردن دەبم و جنۆکە لەسەر زمانم قسە دەکات، ئەگەر باوەر ناکەیت قورئانم لەسەر بخوێنە، دەڵێ شیعرێکی عەرەبیم لەسەر خوێند یەکسەر تووشی هات و هاوار هاواری بوو، دەڵێ گووتم: دایە ئەوە شیعر بوو، قورئان نەبوو، گووتی: توخوا بە ڕاستیتە، خودا ئەو دەجالانە بگرێت کە منیان فریودا بوو. دەڵێت یەکسەر جارێکی تر قورئانم لەسەر خوێند هەر هیچ کێشەی نەما، هەر لەوێ چاك بوەوە و عەیبی تێدا نەما.

---

[38] - ٢٠١٥/٢/٢٠ ئیسلام پەیك

(٣٩) https://www.youtube.com/watch?v=٣ON٠SB٠kGpw

دەجال و قۆڵبڕەکانی وەك مەلا علی و شێخ لوقمان و حاجی لێزەر، ئەمڕۆ هەزاران کەسی فەقیرحاڵ و نەخوێندەواریان فریوداوە بە ناوی جنۆکەو قسەی بێبنەما، کە بەس بەو جۆرە خەڵکە فەقیرحاڵانە دەوێرێت، لەجیاتی کۆمەڵگا یارمەتیان بدات بۆ چاکبوونەوە لەسەر شێوازێکی زانستی و جوان، لە جیاتی ئەوە، لەبەر نەزانیان بە دەستی خۆیان دەیانبەنە لای ئەو دەجال و جادووکەرانە تا زیاتر شێتیان کەن، ئەو خەڵکە فەقیرحاڵەی تووشی ئەو حاڵەتە دەبێت بە شێوازی ئیحاء، چرپاندنە دڵ وەک لە سایکۆلۆژیا باسی دەکرێت، قەناعەتیان پێ دەهێنن کە جنۆکە چۆتە لەشیان، کە باوەڕیان کرد، تازە زۆر قورسە بتوانیت قەناعەتی پی بهێنیت کە ئەو شتە ڕاست نیە، زۆربەی ئەوانەی ئەو پیاوە چارەسەری کردوون ئێستا جوێنی پێ دەدەن دەڵێن درۆ دەکات ئیتیفاقی کردوە لەگەڵ پاشای جنۆکەکان، هیچیتر ئەزیەتیان نەدات، ئەوانیش هیچیتر ئەزیەتی مناڵەکانی نادەن یەعنی توازن الرعب و حرب الباردة یە لە نێوان ئەو شێخە و جنۆکەکان هەیە.

گەورەترین بەڵگەی ئەو دەجالانە ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت:﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ....﴾ (البقرة : ٢٧٥)، ئەوانەی سوو دەخۆن، هەڵسوکەوت ناکەن و ڕاست نابنەوە (لە گۆڕدا) مەگەر وەک ئەو کەسەی کە شەیتان دەستی لێوەشاندبێت (هەر لە دنیادا سروشتی نین، لە قیامەتیشدا وەک شێت دەبن).

بێگومان موفەسیرەکان عادەتێکی زۆر خراپیان هەیە، کە ئەویش کۆپی پێست کردنی بیروڕای موفەسیرانی پێش خۆیانە، بێ بیرکردنەوە لە لێکدانەوەیەکی تایبەت بەخۆیان لە زۆربەی تەفسیرەکان ئەو دیاردەیە باوە.

ئیمامی الرازي دەڵێت:"التخبط" مانای لێدانی ڕەمەکیە، بەو پیاوەی کە کارێکی دێتە پیش و نازانیت چی بکات دەڵێن: بەڕەمەکی ڕەفتار دەکات (إنه يخبط خبط عشواء)، شەیتان خەبتی دەکات، ئەگەر دەستی لێوەشاند بۆ شێت کردنی، کە وەك لێدانیکی ڕەمەکییە سەرسوڕهێنەرە.

"التخبط معناه الضرب على غير استواء، ويقال للرجل الذي يتصرف في أمرٍ ولا يهتدي فيه: إنه يخبط خبط عشواء، ..... وتخبطه الشيطان: إذا مسّه بخبل أو جنون, لأنه كالضرب على غير الاستواء في الإدهاش".

لە مەسەلەی دەست لێدان و دەست لێوەشاندیش [مس] ئەو کارە دەکەن، زۆربەیان ئەو دەست لێوەشاندنە دەسەلمێنن لە دووبارەکردنەوەی رای پێشووی خۆیان، لە کۆتایشدا دەڵێن ئەوە ئیجماعی موفەسیرینی لەسەرە.

بەڕای ئێمە ئەو تەفسیر کردنە راست نییە و ئەسڵ و ئەساسی نییە، لەبەر چەندین هۆ:

لە قورئاندا دەربارەی شەیتان دا هاتووە، کە بە خەڵك دەڵێت: ﴿وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُمْ مِّن سلطان إِلاَّ أَن دَعَوْتُكُمْ فاستجبتم لِي﴾ (إبراهيم:٢٢).

"شەیتان دێتە قسە و بە شوێنکەوتوانی دەڵێت: وەنەبێت من هیچ زۆرو دەسەڵاتێکم بەسەر ئێوەدا هەبووبێت، جگە لەوەی (بەوەسوە سەوخەتەرەو خەیاڵ) بانگم کردن ئێوەش بەدەممەوە هاتن و بەقسەتان کردم،... کەوابوو هیج دەسەڵاتیکی نییە بەسەر خەڵك، چ جای بجێتە لاشەیانەوە، و کاری خراپشیان پی بکات".

بە ڕاشکاوی لەو ئایەتە هاتووە کە شەیتان توانای لێدان و فێرکردن و ئەزیەتدانی کەسی نییە.

هەروەها لە ئایەتێکیتر هاتووە:﴿الثالث :أنه مأخوذ من قوله تعالى: [إِنَّ الذين اتقوا إِذَا مَسَّهُمْ طَئِفٌ مِّنَ الشيطان تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ﴾ (الأعراف : ٢٠١ ).

"بەڕاستی ئەوانەی کە پارێزکار و تەقوادار بوون، کاتێک خەتەرەو خەیاڵێک لەلایەن شەیتانەوە تووشیان بێت، ئەوە خێرا بێدار دەبنەوە و

خوای خۆیان بیر دەکەوێتەوە و هۆشیار دەبنەوە، ئیتر دەستبەجێ بینا دەبن و بەرچاویان ڕوون دەبێت".

واتە مەسەکە تەنها تەشبیهیکە لە حاڵی ئەو کەسەی لەرەلەر و کێشمەکێشیەتی لە نێوان خاتیرە و وەسوەسەی شەیتان و بانگی ویژدانی و ئیمانی.

ئەگەر شەیتان توانای لێدانی مرۆڤی هەبوایە دەیتوانی هەموو موسڵمانان بکوژێت، هەموویان لەناو خوێنی خۆیان بگەوزێنێت، پارەو سامانیان لێ بفەوتێنێت، عەقڵیان لێ تێك بدات، هەرچەندە تێکیش چووە، بەڵام بە دەستی خودی ئینسانەکانە- مزگەوتەکانیان بۆ لێ ناڕوخێنێت، ئەگەر گەورەترین دوژمنی موسڵمانانە، ئەوە هەرگیز لەگەڵ عەدالەتی خوادا ناگونجێت شەیتان زاڵ بکات بە کەیف خۆی لەم و لەو بدات.

ڕاستیەکەی نمونە هێنانەوەی قورئان بۆ سووخۆران بە کەسێك کە وەک فێی گرتوو هەڵدەپەڕێت لەبەر مەس و دەسلێوەشاندنی شەیتان، مانای هەقیقەتی ئەو زانیاریە نییە، بەڵکو قورئان موجاراتی عەقڵیەتی عەرەبی دەکات، نەك بۆ سەلماندنی بیروڕایان لەبارەی کەسی فێ گرتوو و شێت، بەڵکو بۆ زانینی گەورەیی تاوانی سووخواردن، کە چۆن ڕۆژی قیامەت لە کاتی زیندووکردنەوەی وەك فێدار و شێت هەڵدەستێتەوە.

خاوەنی تەفسیری المنار، شێخ محمد رشید رضا تەفسیرێکی نزیك لەو چەمکەی کردوە کە دەڵێت:" ثم إن التشبيه مبني على أن المصروع الذي يعبر عنه بالممسوس يتخبطه الشيطان ، أي أنه يصرع بمس الشيطان له وهو ما كان معروفا عند العرب وجاريا في كلامهم مجرى المثل ".

قال البيضاوي في التشبيه : " وهو وارد على ما يزعمون أن الشيطان يخبط الإنسان فيصرع ، ......وقد ثبت عند أطباء هذا العصر أن الصرع من الأمراض العصبية التي تعالج كأمثالها بالعقاقير وغيرها من طرق العلاج الحديثة"

"ئەو لێکچواندنە لەسەر بنچینەی ئەوە کراوە کە فێدارەکە، کە پێی دەڵێن مەسکراوە شەیتان دەستی لێوەدەشێنێت و لێی دەدات، واتە لەبەر مەسی شەیتان فێی گرتووە، ئەوە بیروباوەڕێکی باو بوو لەلای عەرەب، لە کاتی قسەدا وەک نمونە دەیانهێنایەوە.

البيضاوي لەو تەشبیهەدا دەڵێت؛ " ئەوە هاتووە لەبارەی ئەو زەعمەی [داوایەی] کە شەیتان دەست لە مرۆڤ دەوەشێنێت و خەبتی دەکات و تووشی فێی دەکات، ئایەتەکە نایسەلمێنێت کە ئەو فێ یەی تووشی ئادەمیزاد دەبێت لە هەقیقتدا بە کاری شەیتانەوە تووشی دەبێت، هەروەها ڕەتیشی ناکاتەوە... لەلایەن پزیشکانی ئەو سەردەمە سەلمێندراوە کە فێ لە نەخۆشیە دەماریەکانە، وەک نەخۆشیەکانی تر بە داو دەرمان چارەسەر دەکرێت و بە ڕێگای چارەسەری تری سەردەم".

# خۆت بپارێزە لەو دەستەواژانە(٤٠)

**بەڕاستی ئافرەتێکی پیاوانەو مەرد بوو!**

**کچێك هەڵبژێرە لەگەڵ تۆ ئافرەت بێ ولەدوای تۆ پیاو بێت!**

**هەر بە ژنان ناچێت دەڵێ پیاوە لە رەفتارەکانیدا!**

ئەو جۆرە قسانە ئەگەر لێی وردبیەوە جۆرێك لە ئیهانەی تێدایە بۆ ژن و ئافرەت، هەرچەندە مەبەستیشت ستایش کردنی بێت. چونکە پیاو و پیاوەتی دەکرێتە پێوەری چاکی، چاکی پێوەری نییە و رەگەزی نییە، نابێت چاکە وەسف بکرێت بە پیاوەتی یا ژنایەتی، هەر کەسێك چاکە بکات ژن بێت یان پیاو چاکەیە. پێویست ناکات ببێتە پیاو یان رەگەزی خۆی بگۆڕێت تا کارێکی چاکی لێبوەشێتەوە. ناونانی کاری چاکە بە پیاوەتی هەڵەیەکی کۆمەڵایەتیە نابێت خەڵکی ڕۆشنبیر دووبارەی بکاتەوە. پیاوی وا ناچیز و ناشەریف هەیە ژن و کچی بەکرێ دەدات، یان بەخۆی دەستدرێژی دەکاتە سەر کچی خۆی، ئافرەتیش هەیە سواڵ دەکات و کاری قورس دەکات، قوربانی بە تەمەن و جوانی خۆی دەدات، لە پێناو پێگەیاندنی هەتیوەکانی.

وەك دەستەبژێری رۆشنبیرو کۆمەڵگەش دەبێت رزگارمان بێت لەو دەستەواژە چەوتانە. نابێت کاتێك ستایشی ئافرەتێك دەکەین بڵێین:

لە هەڵوێستەکانی پیاوانە و مەردانە بوو...چونکە ئەوە بە پێوەرکردنی پیاو و پیاوەتیە بۆ هەموو کارێکی بەرزو چاك، کە بەرهەمی خودی ئەو کۆمەڵگایەیە، کە کچ و مێینەکانی لەسەر ئەو چمکە سەقەتە پەروەردە دەکات. ژنایەتی مانای (بێ هەڵوێستی و ترسنۆکی و رەزیلی و بەخیلی...) هەموو سیفەتە نێگەتیڤەکان دەگەینێت لەناو جوغزی ئەو فەرهەنگە. وەك نوسەرێکی تونسی دەڵێت:"ئێمە وەك پشیلە پەروەردەیان دەکەین، دەمانەوێت وەك شێریش دەرچن".

---

(٤٠)٢٠١٣/١٢/١ سایتی پێنوسەکان.

**من وەك موسڵمانێك ڕێگە بەخۆم نادەم ئەو دەستەواژانە بەکاربهێنم لە کاتی دواندنی ئافرەتدا، کاتی خۆی پەیوەندیم لەگەڵ ئیسلامیەکی ناوداری ئیخوان لەسەر ئەوە تێکچوو، کە لە کێشەیەکی کۆمەڵایەتدا کە من لە نێواندا بووم و تەرەف نەبووم، کاتێ وەك شاهێد گوتم ئەوە قسەیەو پەیمانە خوشکی گەورەت لەبەر چاوی مندای، کابرای ئیسلامی، کە شەو رۆژ قورئانی دەخوێند، هەفتانە دوو ڕۆژ بەڕۆژوو دەبوو، شەو نوێژی بە بەردەوامی دەکرد، بەمنی گوت: ئینجا قسەی ژنان چیە، ژن و قۆندەرە، هەڵبەتە لەبەرچاوی دایکی و خوشکەکەی و چەندین ئافرەتی تری مەجلیسەکە. توشی شۆك هاتم لێی، پاش وەڵامێکی توندی بڕیارم دا کە هیچی تر بە سودفەی فیلم هیندیش نەیبینمەوە لەبەر ڕیزنەگرتنی بۆ دایک و خوشکی و نیوەی مرۆڤایەتی.**

**ڕۆشنبیری هەقیقی جا ئیسلامی یا عەلمانی بێت یان هەر شتێك بێت، دەبێت خۆی لێڕابێنێت لەسەر بەکارنەهێنانی ئەو دەستەواژانە، کە لەبەر باوێتیانیشدا هات بەسەر زمانی لەبەردەم ئافرەتێکدا بڵێت: ببورە هەڵەم کرد لە دەربڕیندا. لە ستایشی کاری باش و بەرزو پۆزەتیڤی ئافرەتێك مەڵێ ژنێکی پیاوانەیە، بڵێ: بەراستی ژنێکی رەسەن و مەردە، یان بەڕاستی ژنە بەمانای وشە. تا کچانمان وا لێڕابێنین کچایەتی خۆیان خۆش بوێت، نەك هەموو شتە باشەکان مۆری نێرسالاری لێدەین، تا کەسایەتیان بەهێزو بەرزی ژنانە دەربچێت.**

# حەدیسە هەڵبەستراوەکان

## کاریگەرییەکانی لەسەر پێگەی ئافرەت[٤١]

لەبیرمە لە ساڵانی ١٩٩٢ یان١٩٩٣ تەواو نازانم مێژوەکەی، من و چەند برادەرێك ڕۆژنامەی (ڕابوون)ـمان بەڕێوە دەبرد، کە پەیوەندی ئیسلامی خوێندکاران و لاوان دەریان دەکرد.

هەر لەو ڕۆژگارە هەستم بەو جەورو ستەمانە کردبوو، کە کۆمەڵگاو توراسی دینی لە ئافرەتی دەکات. هەندێك لە حەدیسی موضوعم بەرچاو کەوت لە یەکێك لە زنجیرەی ئەحادیسی موضوعەی ئەلبانی، کۆمکردنەوە، وابزانم پێنج شەش حەدیس بوون، وەرمگێڕانە سەر کوردی و بڵاوم کردنەوە، لە ژێر ناونیشانی"خۆت لەو فەرمودە هەڵبەستراوانە بپارێزە" وابزانم من یەکەم کەس بووم کە زاراوەی هەڵبەستراوم بۆ حەدیسی موضوع بەکارهێنا.

بۆ ئەوەی نازانێت، حەدیسی موضوع یان هەڵبەستراو: بەو حەدیسانە دەگووترێت کە بە دەمی پێغەمبەر گوتراون، زانایانی ئەهلی حەدیسیش باوەڕیان بە ڕاستی ئەو قسانەو دانە پاڵ پێغەمبەر نییە.

ئەو حەدیسانەی کە کۆم کردنەوە هەستم کرد، ڕاستە ئەلبانی و زانایانی تری ئەهلی حەدیسیش دەڵێن هەڵبەستراوە، بەڵام دیتم زۆر سەیر بە ناخی کۆمەڵگای کوردی و کۆمەڵگا ئیسلامیەکانی تر شۆڕ بۆتەوە، لە زۆر لە داب و نەریت، قسەی نەستەق و پەندی پێشینان دا خۆی گوزارش دەکات.

نەك ئەوە سەرنجم دا هەندێك لە هەڵوێستەکانی ئەو دیندارانە، هەتا سەلەفیەکانیش دەربارەی ئافرەت، لە ژێر کاریگەری ئەو حەدیسە هەڵبەستراوانە دروست بوون.

---

(٤١) ستاندەر، ٢٠١٥/٠٥/٠٨ .

هەرچەندە زانایانی حەدیس بە دوورو درێژی باسی ترسناکی کاریگەری حەدیسی هەڵبەستراویان کردوە لەسەر خودی دینی ئیسلام و شێواندنی.

کچی حەسەن بەنای "ئیستشهاد حەسەن بەنا]" دەڵێت:"کەسانێك هەن ئافرەت لە مافەکانیان بێ بەش دەکەن، بە بەکارهێنانی فەرمودەگەلێك، کە هەندێکیان هەڵبەستراویشن بۆ پێشێلکردنی مافەکانی ئافرەت و دابەزینی ڕیزی، هەڵە تێگەیشتنی هەندێکیان، نمونەی بە حەدیسی«ناقصات عقل و دین» هێناوە""[٤٢].

ئەو کاتە سەرنجم دا کە ئەو حەدیسە هەڵبەستراوانە لە زۆر لایەنەوە سوکایەتی بە ئافرەت دەکەن و زۆربەی زۆری ئەو ماناو چەمکانەی لەو حەدیسە هەڵبەستراوانە باسکراون، کە زۆربەیان لە بنەڕەتدا داب و نەریتی باو بوە، دوایی ویستویانە لە ڕێگای حەدیسەوە جارێکیتر برەوی پێ بدەنەوە، هەتا لەو بوارانەی کە ئیسلام چاکسازیشی کردوە بۆ ئافرەت، هەوڵی بەتاڵکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی دراوە، لە ڕێگای ئەو فەرمودە هەڵبەستراوانەدا. نەك هەر ئەوە زۆر لەو بیروڕایە توندانەی دینەکانیتری وەك جولەکە و مەسیحی دزەیان کردە ناو تەفسیر و فیقهیش، زۆریشیان وەك حەدیسی هەڵبەستراو ڕەنگی دایەوە. بەرای ئێمە ماوەی ١٠ ساڵی پەیامی مەدینە، زۆر کورتترە لەوەی توانیبیتی هەموو ئەو چاکسازیانەی کە کردویەتی لە هەلومەرجی ئافرەتدا جێبەجێیان بکات. چونکە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و داب و نەرێتی کۆمەڵگا کاتی زۆرتری دەوێت، بۆیەش ئەو هەموو بیروبۆچون و داب و نەریتە کۆنانە لە ڕێگای حەدیسی هەڵبەستراوەوە خۆیان بەرهەم هێناوەتەوە. حەدیسی هەڵبەستراو لە زۆر لایەن هێرش دەکەنە سەر مرۆڤایەتی ئافرەت، دیارترین بوار کە ئافرەت لەو حەدیسە هەڵبەستراوانە هێرشیان کروەتە سەر، لە واقیعیشدا بەرجەستە بووە لەناو کەسانێك و چین و توێژێك، ئەوانەن:

(٤٢) المصري اليوم /http://www.almasryalyoum.com/news/details ٢٤٠٦٦٩

## -پرس پێکردنیان و پێچەوانەکردنیان

[شاوروهن و خالفوهن] وەك ئەو حەدیسە هەڵبەستراوە دەبینین بۆتە پەندێکی کوردی کە دەڵێت: پرسیان پێ بکەن و بە گوێیان مەکەن.

یان ئافرەت عەقڵی لە کۆشیدایە، کە هەڵستایە سەرپێ لێی بەردەبێتەوە.

لە هەمووی عەنتیکەتر پرس پێکردنی ئافرەت هەر لۆ فشەی، پاشان بەگوێ نەکردنیان، چونکە بەرەکەتت بەسەر دەبارێت ئەگەر وات کرد.

[لا يفعلن احدكم امرا حتى يستشير، فان لم يجد من يستشيره فليستشر امرأة ثم يخالفها، فان في خلافها البركة] السيوطي، الدرر المنتثرة.

کەس هیچ کارێك نەکات تا ڕاوێژ بە کەسێك دەکات، ئەگەر کەسی دەست نەکەوت، با پرس و ڕاوێژ بە ئافرەتێك بکات، ئینجا پێچەوانەی بکات، چونکە لە پێچەوانەکردنیان بەرەکەتی تێدایە.

## -گوێڕایەڵی کردن لە ئافرەت کارەساتی لە دوایە

حەدیسێکی هەڵبەستراو دەڵێت [طاعة المرأة ندامة] بەگوێکردنی ئافرەت پەشیمانی لەدوایە.

دوایێ هانی پیاوان دەدەن لەو حەدیسەی کە دەڵێت: [اهلكت الرجال حين اطاعت النساء] پیاو لە ناوچوون کە بە گوێی ئافرەتانیان کرد.

نەك هەر ئەوە بەڵکو پیاو بە گوێڕایەڵی ئافرەت پیاو دەچێتە دۆزەخ! [من اطاع امرأته كبه الله عز وجل في النار على وجهه]

ئەوە لە کاتێکدا لە غەزوەی حودەیبیە کاتێ پێغەمبەر [د.خ] بە پرس و رای "ام سلمة"ی کردو کە بوە هۆی ئەوەی هاوەڵانی واز لە یاخیبوون بهێنن کاتێ سێ جار پێی گووتن [قوموا و انحروا، ثم احلقوا] هەستن قوربانیەکانتان

سەربڕن و دوایش قژتان بتراشن، بەڵام بە گوێیان نەکرد، ئوم سەلەمە گووتی: تۆ هیچیتر پێیان مەڵێ و بڕۆ خۆت ئاژەڵەکەت سەربڕە و قژت بتراشە، کە پێغەمبەر وای کرد، هاوەڵانیشی وایان کرد.

-ئەو حەدیسە هەڵبەستراوانەی کە ئافرەت وەك مەخلوقێکی شەهوانی وێنا دەکات، لەو حەدیسانە هەڵبەستراوانە باسی ئافرەت دەکرێت وەك کەسێکی شەهوانی ڕیزپەڕ، کە بەس بیر لە سیکس دەکاتەوە وەك ئەو حەدیسە هەڵبەستراوەی کە دەڵێت [عقولهن في فروجهن] عەقڵیان لە دامێنیان دایە.

و [فضلت المراة على الرجل بتسعة وتسعين جزءا من اللذة ولكن الله القى عليهن الحياء] [ژنان بە نەوەت و نۆ بەش لە شەهوەت بەسەر پیاوان پەسەندکران، بەس خوا حەیای پێداون] لە زۆر نێوەندی شەعبی و خەڵکی ئاسایی ئەو بیرۆکەیە باوە، کە ئافرەت لە پیاو سێکسیترن، کەچی هەر پیاون گێچەڵ دەکەن بە ئافرەت، دوایان دەکەون، شیعریان بۆ دەنووسن، گۆرانیان بۆ دەڵێن، جاروبار پیاویشیان بۆ دەکوژن.

## -یان حەدیسی هەڵبەستراو هەن کە دەڵێن دۆزەخ لە بنەڕەتدا بۆ کەم عەقڵ و ئافرەتان دروست بوە:

لەو بوارەدا حەدیسێك هەیە کە ئافرەت یەکسان دەکات بە سفهاء و کەم عەقڵان [الا ان النار خلقت للسفهاء، وهي للنساء الا التي اطاعت قيمها] اخرجه الطبراني.

دۆزەخ بۆ کەم عەقڵان دروستکراوە، کە بۆ ئافرەتە تەنها ئەوانەی نەبێت کە گوێڕایەڵی سەرداری خۆیان دەکەن. بەداخەوە حەدیسی سەحیحیش هەن لەو مانایەوە نزیکن، بەڵام جارێ ئەوە باسی ئێمە نین.

## -قەدەغەکردنیان لە خوێندن و فێرکردن

چەندین حەدیس لەو بارەیەوە هاتووە کە دەڵێن: [:« لا تعلموهن الكتابة - أي النساء - ولا تسكنوهن الغرف وعلموهن سورة النور[

ئافرەتان فێری خوێندن ونوسینیان مەکەن، لە ژورەکانتان نیشتەجێیان مەکەن، فێری سورەتی نوریان بکەن! ئەگەر لە ژوورەکان نیشتەجێ نەبن، ئەی لە حەوشە بن؟! حەدیسێکی تریش هەیە دەڵێت [لا تسكنوهن في العوالي] لە شوێنی بەرز وەك نهۆمی دووەم وسییەم! لە حەدیسێکی تری هەڵبەستراودا دەڵێت: [لا تعلموا نساءكم الكتابة] ئافرەتانتان فێری خوێندن ونوسین مەکەن! ئەوە هەڵوێستی هەقیقی کۆمەڵگای ئیسلامی بوە بەرامبەر فێرکردنی ئافرەت، بۆیە هەتا تەفسیرە نوێکانی پێش پەنجا ساڵیش وادەڵێت! ئەگر ژن فێری نوسین بوون بۆ دۆستەکانیان دەنووسن.

## -ئافرەت عەورەن

حەدیسی هەڵبەستراو لەو بارەیەوە زۆرن کە ئافرەت وەك عەورەت و عەیب وعار نیشان دەدات ودەبێت بشاردرێتەوە، بەداخەوە چەندین حەدیسی سەحیحیش لەو بارەیەوە هاتوە، وەك چۆن حەدیسی هەڵبەستراوویشی لە بارەیەوە هاتووە! حەدیسێکی هەڵبەستراو دەڵێت: [انما النساء عي وعورة فاستروا عيهن بالسكوت واستروا عوراتهن في البيوت] ژنان بێ زمان و عەورەتن، بێزمانیان بشارنەوە بەبێ دەنگ کردنیان، وعەورەتیشیان بشارنەوە لە ماڵەوە!

لە حەدیسێکیتر دەڵێت ئافرەت دە عەورەی هەیە، کە مێردی کرد پیاو عەورەتێکی دادەپۆشێت، کە مردیش قەبر نۆ عەورەکەی تری دادەپۆشێت! [للمراة عشر عورات فادا زوجت المراة سترالزوج عورة وادا ماتت ستر القبر تسع عورات]

واتە مەگەر مەرگ هەموو عەورەتەکانی داپۆشێت بۆیە حەدیسێکی هەڵبەستراویتردا دەڵێت: [موت البنات من المكرمات] مردنی کچان ڕێزگرتنی ئێوەی تێدایە! ئەوە چ عەقڵیەتێکی بۆگەن ئەو بیروڕایانەی داڕژتوە؟!

## -سوکایەتی سەیرکردنی ئەو ئافرەتانەی منداڵیان نابێت یان نەزۆکن

[ ..والحصير في ناحية البيت خير من امرأة لا تلد] پارچە حەسیرەیەك لە لایەکی ژورەکەت  جاکترە لەو ئافرەتەی منداڵی نابێت.

ئەو حەدیسە هەڵبەستراوە بەڕاستی لەناو زۆربەی کۆمەڵگا ئیسلامیەکان کاریگەری دیارە، کە چەند بە چاوی نزم سەیری ئەو ئافرەتانە دەکرێت کە منداڵیان نابێت، وەك بڵێیت خۆی بەرپرس بێت لەو حالەتە! یان مرۆڤ ڕیزی بە خۆیەوە نییە بەڵکو بەشتێکیتر بەستراوەتەوە! ئەو ژنانەی منداڵیان نابێت بە تایەتی لە ناو ژینگە دواکەوتوەکان، هێندە سوکایەتی وگاڵتەی پێ دەکریت و پێی دەگوترێت داری بێ بەر، زۆر جار کارەساتی گەورەی لەدوادا بوە، وەك خۆ سوتاندن یان خۆ کوشتن! لە چاکترین عاڵەتدا بە چاوەی سۆز وزگ پێ سوتانەوە تەماشایان دەکەن.

-ئافرەت ڕێگرن لە پەرستنی خوا بە ڕاستی

حەدیسێکی هەڵبەستراو دەڵێت: [لولا النساء لعبد الله حقا حقا] ابن الجوزي الموضوعات، ئەگەر ژن نەبا خودا بەتەواوی دەپەرسترا.

## -خۆپارێزی لە ئافرەتی خراپ و وریایی لە چاکەکانیان

[قال لقمان لابنه: يا بني استعذ بالله من شرار النساء، وكن من خيارهن على حذر فانهن لا يسارعن الى خير، بل هن الى الشر اسرع]

گوایە لوقمان ئامۆژگاری کورەکەی دەکات: کوڕم پەنا بە خوا بگرە لە ئافرەتی خراپ، بەرامبەر جاکەکانیسیان ئاگاداربە، چونکە بۆ خێر خێرا نین، بەڵکو بۆ خراپەکاری پەلەیانە.

ئەمەو مانا و چەمکی زۆر سەلبیتر و خراپتر باسکراوە لە دژی ئافرەت کە ناکرێت باسی هەموویان بکەین، ئەو کاتە تەنها دەوێراین لە حەدیسی هەڵبەستراو بکۆڵینەوە، دوایی زانیمان کە ئەو حەدیسانەشی بەناوی سەحیحن، پڕن لە سوکایەتیکردن و بە کەم سەیرکردنی ئافرەت، بەلام بیگومان لە نزمی ئاستیاندا ناگەن بە حەدیسی هەڵبەستراو کە هەیانە دەڵێت: صوالحهن فاجرات و، واما طوالحهن فعاهرات! چاکەکانیان فاجیرەن و خراپەکانیان سۆزانین.

| تەوەری دووەم: سەلەفییەت و پرسی ئافرەت |
|---|
| ١- پیرۆسترۆیکای سەلەفییەت |
| - ڕەبیعی مەدخەلی: ئافرەت جێگای متمانە نین<br>- ئەو کۆمەڵگایەی تاڵیبان و هاومەشرەبەکانیان موژدەی پێ لێدەدەن<br>- سەعوەدە و ڕەبابە ژەنین لە قەدەغەی ئافرەت لە لێخوڕین<br>- گەڕانەوە بۆ سەردەمی جاریە و کەنیشکەکان<br>- کەناڵی ابن العثیمین و نوکتەیەکی لەسەر ئافرەت<br>- آمنة نصیر بە شێخانی سەلەفیەت |

# پیرۆسترۆیکای سەلەفییەت

## پەڕینەوە لە قسەی کتێب وناملکەو کاسێت بەرەو واقیع[٤٣]

ئەوەی لەو ڕۆژگارە لە نێو سەلەفیەتدا ڕوودەدات زۆر لە پیرۆسترۆیکا Perestroika ی کۆمۆنیزمی سەردەمی گۆرباتشۆف لە هەشتاکاندا دەچێت، کاتێ گەورەترین کرانەوەو بنیاتنانەوەی ئەنجامدا لەناو فیکرو سیاسەتی کۆمۆنیزم و دەوڵەتی سۆڤیەت کە بەجۆرێک لە جۆرەکان بەرجەستەی کۆمۆنیزم بوو. دەبێت چی بێت وا سەلەفیەتی پەشۆکاو کردبێت وا بەپەلەپروزکێ کە تا دوێنێ هەموو ئەو بیروڕایانەی بە کوفرو بیدعەو هەرتەقەیان دەزانی ئەمڕۆ مەشروعیەتی پێ بدەن.

دەکرێ هۆی ئەو پاشەکشێیە لە هەڵوێستە [عەقایدیەکان]یان بگەڕێتەوە بۆ هێزی پرنسیپەکانی دیموکراتیەت، یان هێزی کورسیبازی یان هێزی واقیع، ئێمە لێرەدا زەنی چاکیان پێدەبەین و دەڵێین ئەگەرچی دەکرێت هەموو ئەو هۆکارانە هۆی ئەو پاشەکشێیانە بن بەڕێژەی جیاواز، بەڵام چەپۆکی واقیع و پەڕینەوە بۆ دونیای واقیع دوور لە قسە توندوتیژەکانی مینبەری سەلەفیەت و دوور لە قسە نامەسولەکانی کاسێتی بانگخوازە سەلەفیەکان و دوور لە نامیلکە بەرگ لوسەکانی سعودیەو خەلیج و دوور لە قسەی ناو ئەلقە داخراوەکان، گەورەترین هۆکاری ئەو پاشەکشێیە و بەخۆدا چوونەوەن.

ئەو سەلەفیەتیەی کە زەمەنی وەستاندبوو لە وێستگەی سێ نەوەکەی سەلەفی ساڵح لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر [درودی خوای لەسەر بێت] فەرزی کردبوو لەسەر هەموو موسڵمانان وەزیفەی بیرکردنەوە ئیلغا بکەن لە ئاست هەر کاروبارێک سەلەفی ساڵح چارەسەریان بۆی هەبێت، هەر لەو ڕوانگەیەوەش ڕوبەری حەرامەکانیان هێندە بەرفراوان کرد بوو، وەک رووبەری ئاویان لێکرد بوو بە نسبەت وشکایی زەوی، لە ناکاو لە پاش

---

(٤٣) کوردستان پۆست ، ٢٠١٢/٠١/٠٢.

شۆڕشەکانی بەهاری وڵاتانی عەرەبیدا کە ئاواتە خوازین چەپکێ لە نێرگزی ئەو بەهارە بەبەر هەموو پارچەکانی کوردستانیش بکەوێ، زۆربەی چەمکەکانیان گۆڕی، چونکە گۆڕانکاریەکان زۆر خێران خەریکە هاوسەنگی خۆیان لەدەست دەدەن لە فراوانکردنی ڕووبەری ڕێگەپێدراوەکان [موباحەکان] وەک ئەو لێدوانەی وتەبێژی حزبی نوری سەلەفی کاتێ گوتی: ئێمە ڕیز لە ڕێکەوتنەکانی کامپ دەیڤێد لەگەڵ ئیسرائیل دەگرین، کە ئەو قسانە نەک بە پێوەری ئیسلامی سەلەفی، بەڵکو بە پێوەری نەتەوەییە عەرەبەکانیش کوفرە.

هەر ئەو سەلەفیانە لەسەر زمانی قوتبێکی هەرە گەورەی سەلەفیەت لەسەردەمی پێش شۆڕش و قسەی موحازەرات و پاش تێری بەر سێبەری داوای بەکۆیلە کردنی خەڵکی غەیرە موسڵمانی دەکرد بۆ چارەسەری کێشەی هەژاری بە جیهاد کردن، وەک لە وتارێکی سەربەخۆ باسمان لێوە کرد، کاتێ ابو اسحاق الحوینی دەڵێت:"هو الفقر اللى إحنا فيه ده مش بسبب تركنا للجهاد؟، مش لو كنا كل سنه عمالين نغزو مره ولا اتنين ولا تلاته مش كان هيسلم ناس كتير فى الارض"، كل واحد كان هيرجع من الغزوه جايب معاه "يقصد الاسرى" تلات اربع اشحطه وتلات اربع "نسوان" وتلات اربع ولاد، اضرب كل رأس فى ستميت درهم ولا ستميت دينار يطلع بمالیه کویسه"

(مەگەر ئەو هەژارییەی ئێمە تێیدان بەهۆی وازهێنانمان لە جیهادکردن نییە؟ ئەگەر ئێمە ساڵانە جارێک ودوو یان سێ جار غەزامان کردبا خەڵکێکی زۆر موسڵمان دەبوون لەسەر زەوی، وهەرکەسەی دەگەڕایەوە لەو غەزایە بە سێ چوار پیاو (ئەو وشەی اشحطەی بەکار هێناوە کە سوکایەتی پێکردنە بە ئادەمیەتی مرۆڤی ناموسڵمان وەک علوجی کۆنی توراسمان) و سێ چوار ژن و سێ چوار منداڵ، هەر سەرێکی بدە لە شەش سەد درهەم یان دینار پارەیەکی چاکت لێی دەست دەکەوێت).

ئەوە چارەسەری سەردەمی قسەی نەزەری وناواقیعی بوو کەچی ئێستا ناوێرن باسی ئیسرائیلیش بە خراپە بکەن لەبەر ئەمری واقیع.

سەلەفیەکان هەر کتێبێکیان بکەیتەوە باسی کوفری سیستمی دیموکراتیەت دەکات هەتا ئەو ڕادەیەی لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی کەسایەتیەکی سەلەفی بەشداربووی یەکەم هەڵبژاردنی دیموکراسی میسر داوەت کرابوو وەک فەیلەسوفێکی دیموکراتیەت باسی لە بەها دیموکراسیەتیەکان دەکرد، بەڵام توشی پەشۆکان هات کاتێ گرتەیەکی ڤیدیۆیی ئەو برادەرەیان لێدا لە سەردەمی قسەی مینبەرو تیۆریدا دەڵێت دیموکراسیەت کوفرە.

هەر سەرۆکی حزبی نور عماد عبدالغفور لە دوا چاوپێکەوتنەکانی ڕەتی دەکاتەوە کە ئازادییە گشتیەکان وەک ئازادی دەربڕین و جل پۆشین بخرێتە ژێر حوکمی بنەماکانی شەریعەت دەڵێت:" ئەو شتانە بە زۆرەملێ نین" هەڵوێستی سەلەفیەتی هاوچەرخ لە دیموکراسیەتدا هاتا لە سەلەفیە کۆنەکانیش خراپترە، ئەوەتە لە سەردەمی زانایەکی سەلەفی بەناوبانگی وەک محمد رشید ڕەزا، خەڵکی هێندە سەرسام بوون بە دیموکراسیەت و بنەماکانی تا ئەو ڕادەیەی دەیانگوت دیموکراسیەت لە ئسولی ئایینی خۆمانە بۆیە ئەو زانایە لەرۆژنامە بەناوبانگەکەی وەڵامیان دەداتەوە، بەڵام چۆن وەڵامێك وەک زانا سەلەفیەکانی ئەو سەردەمە ناڵێت دیموکراسیەت مانای حاکمیەتی جەماوەر دەگەیەنێت کە ئەویش شیرک و هاوبەشی بڕیاردانە بۆ خوا، بەڵکو دەڵێت:" ئەی موسڵمان مەڵێ ئەو حوکمە [دیموکراسیەت] ئەسڵێکە لە ئسوڵی ئایینی خۆمان، لە قورئان و ژیننامەی خەلیفە ڕاشدیەکان پێمان زانیوە نەک لە بەرخورد کردن لەگەڵ ئەوروپیەکان، دیتنی ئەحواڵی رۆژهەڵاتیەکان. چونکە ئەگەر ئەحواڵی ئەو خەڵکەتان واتە [ئەوروپیەکان] پەندیار و نموونە نەبوبێت، کاری لێنەکردبان نە تۆ و نە هاوشێوەی تۆ بیرتان نەدەکردەوە کە ئەوە [واتە دیموکراسیەت و بنەماکانی] لە ئیسلامدایە".

دەربارەی ئافرەت کە توندوتیژی سەلەفییەت و سەلەفیەکان بەدیارترین شێوەو توندترین شێوە دژی ئەو ڕەگەزە دەردەکەوێت، چونکە ئافرەت لە نێوان دوژمنە بێ شومارەکانی بە لاوازترین ئەلقە دادەنێت، کاتێ فەرمانڕەوا سەرکوتی دەکات و کۆمەڵگا پشتی لێدەکات هەموو چەقی توندوتیژی

ئاڕاستەی ئەو [زەعیفانە] دەکات و لەواندا تەعویزی خاڵیکردنەوەی توندوتیژیەکانی دەکاتەوە، بۆیە وەک لە کوێت و سعودیەو میسر سەرانی سەلەفیەت نەک دژی خۆکاندیدکردنی ئافرەت بوون، بەڵکو دژی دەنگدانیشی بوون، لە سعودیە دژی لێخوڕینی سەیارەو سەفەرکردنیشین بەبێ مێردو مەحرەم با دایکی دە منداڵیش بێت. ئەو هەموو کارانەش بە بیانووی حەدیسێکی وەک "لن يفلح قوم ولّوا أمرهم امرأة" ئەنجامی دەدەن کە ئامادە نین گوێ بۆ هیچ تەفسیرێکی تری جگە لە خۆیان بگرن وەک تفسیری شێخە ڕوناکبیرەکانی تری وەک محمد الغزالي، بەڵکو لە هەر موناسەبەیەک باسی مافێکی ئافرەتان کرا ئەو حەدیسە دەڵێن و دەڵێنەوە، کەچی لەبەر هێزی واقیع و لەبەر خاتری مەجلیسی عەسکەری ئافرەتیشیان تەرشیح کرد بەشێوەیەکی زۆر کاریکاتێریانە کە لەجیاتی وێنەی کاندیدە ژنەکان بەوەکالەت یان وێنەی گوڵێکیان لەجێی دانا بوو یان وێنەی مێردەکانیان، کە هێندەی نەبرد ئەویشیان ڕاست کردەوە بە بڵاوکردنەوەی وێنەی ژنە مونەقەبەکانیشیان.

ئەوە لە کاتێکدا نەک وێنەی ئافرەتان بەڵکو وێنەی پیاوانیش حەرامە لە فیقهی سەلەفییەت، کەچی ئێستا خەریکە ژمارەی کەناڵە فەزاییەکانی سەلەفییەت زۆرتر دەبێت لە گرۆهەکانی تر.

لە سەرەتادا گوتمان ئەوەی ڕوودەدات پیرۆسترۆیکای سەلەفییەتە، بەڵام مەرج نییە پیرۆسترۆیکا بتوانێ چارەسەری داخراوی و ئینغیلاقیەتی فیکری سەلەفییەتی پێ بکرێت، چونکە چۆن پیرۆسترۆیکای غۆرباتشۆف هەرەسی هێنا بە خودی کۆمۆنیزم وزەبرێکی وەشاندێ کە تا ئەمڕۆ نەیتوانیوە پشتی لێ ڕاست کاتەوە، لەوانەیە سەلەفییەتیش کە لە زۆر ئەدگارەکانی هاوشێوەی کۆمۆنیزمە لە بواری مۆنۆپۆڵکردنی هەقیقەت و سوکایەتکردن بە نەیارانی و حەتمیەتی تاریخی و گەلێک بواری تر، لەگەڵ ئەو پیرۆسترۆیکایە پشتی بەعەرز کەوێت، چونکە چاکترین پێچواندن بۆ کۆمۆنیزم و سەلەفییەت ئەوەیە کە ئەو دوانە دوو تێڵای چەماوەن شکانیان لە ڕاستکردنەوەیاندایە. ئەو قسانە ڕاستە ئاڕاستەی سەلەفییەکان دەکرێنة بەڵام مانای ئەوە نییە زۆر

گەشبینیش بین بە سەرکەوتنی ئیخوان لە تاقیکردنەوەی دیموکراسیەت بەهەموو میراتە فیکری و مێژووییە نا دیموکراتیەکەی کە سەنگی تەرازووی بەرەو سێنتراڵیزم و تۆتالیتاریەت زیاتر لارە تا ئازادییە گشتیەکان.

## ڕەبیعی مەدخەلی[٤٤]

# ئافرەت جێگای متمانە نین

زۆر ئاساییترە بڵێیت ئوتۆمبیل لێخوڕین بۆ ژن مەترسی تێدایە لە ڕووی بەدەنیەوە و لە ڕووی ئاسایشی کەسێتی خۆی، یان بڵێیت کاریگەری دەبێت لەسەر حەوزی ئافرەت و منداڵی نابێت، وەك مەلایەکی سعودی ئەو قسانەی بۆ خۆی دروست کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی بڕوانیتە هەموو ئافرەت بەچاوێکی نزم، لەبەر بێ متمانەیی بەڕەوشتی ئافرەت، لەبەر ئەوەی نەوەك خۆی بخاتە باوەشی یەکەم پیاو کوێ دەیبینێت، لەبەر ئەوەی ئەگەر ئوتۆمبیل لێخوڕێت، دەچێتە ژوانی دڵداری، ئەگەر پیاو نەبن ژن دەفەوتێن.

ئەو تێروانینە پڕ لە تۆمەت و سوک سەیرکردنی ئافرەت، کرۆکی وتاری سەلەفیەتی کۆن و نوێیە، لە فتاوى فضيلة الشيخ ربيع بن هادي المدخلي (ج : ٢) ـ (ص : ٤٢٠) هاتوە: "پرسیار: ئایە جائیزە ئافرەت ئوتۆمبیل لێخوڕێت؟ وەڵام: نەخێر، چونکە ئەو کارە فەسادی زۆرە، واتە زۆر لە ژنان بێ ڕەوشت و فاسید دەبن، ئەگەر پیاو حەبلی بۆ شلـکردن [وەك ئاژەڵ حەبلی بەکارهێناوە]، ئوتۆمبیل لێدەخوڕێت و دەچێت بۆ گەڕان بەدوای دۆست، چاوجاوانێ [مغازلة] لەوانەیە ژوان بکات، لەوانەیە، لەوانەیە... ئافرەت پێویستی بە پاراستن و بە قەوامەتی پیاوە، شوێنی بنەڕەتی خۆشی ماڵەوەیە: ((وقرن في بيوتكن ولا تبرجن يبرج الجاهلية الأولى )) [ الأحزاب : ٣٣ ] .
(( الرّجال قوّامون على النساء )) [ النساء : ٣٤ ] .

ئەگەر قەوامەتی پیاو نەبێت ژنان فەوتاون، ئەگەر پیاوان بەسەریان ڕابگەن و قەوامەتی شەرعیان لەسەردا سەپاندن، ژنانیش ڕاست دەبن، ئەگەریش پیاو حەبلی بۆ شلـکردن، لە زۆربەی حالەتدا تووشی لادان دەبن" ئەوە دەقە عەرەبیەکەیە:

---

(٤٤) میللەت پرێس ، ٢٠١٤/٠٤/١٣.

**السؤال : هل يجوز للمرأة أن تسوق السيارة ؟**

الجواب : لا ؛ لأن هذا فيه مفاسد كثيرة ، وكثير من النساء يعني قد تفسد إذا ألقي لها الحبل على الغارب ، تقود السيارة وتذهب قد تخادن ، قد تغازل ، قد تعمل المواعيد ، قد ، وقد ، المرأة تحتاج حماية وتحتاج قوامة ، وأصل موقعها في المنزل ((وقرن في بيوتكن ولا تبرجن يبرج الجاهلية الأولى )) [ الأحزاب : ٣٣ ] . (( الرّجال قوّامون على النساء )) [ النساء : ٣٤ ] .

ولولا قوامة الرجال لضاعت النساء ، إذا استقام الرجال وقاموا عليهن القوامة الشرعية استقامت المرأة ، وإذا ألقي الحبل على الغارب فإنها قد تنحرف غالبا[٤٥].

جا تەسەوەرکە، خاوەنی ئەو بیرە دواکەوتووە لە کوردستان شوێن کەوتە و ئەتباعی ببێت. بەڕاستی حەیفە بۆ کورد کە بە سەدان پلە پێشکەوتووترە لە کۆمەڵگای سعودی چەپێنراو، کەچی ئێستا وا بە دەبەنگی دەروێشاتی بۆ فیکرێکی بۆگەنی دواکەوتووی دەوارنشینی وا بکەن

(٤٥) فتاوى فضيلة الشيخ ربيع بن هادي المدخلي [ (ج : ٢) . (ص : ٤٢٠).

# کۆمەڵگایەکی تاڵیبانی؛

## هاومەشرەبەکانیان موژدەی پێ لێدەدەن

چیرۆکی تاڵیبانە توندڕەوەکان لەگەڵ ئافرەتدا زۆر سەیرە، جاروبار پێکەنین هێنەریشە. جاروباریش خەم و پێکەنین بەیەکەوە کۆدەکاتەوە. دژایەتی ئەو برادەرانە بۆ ڕەگەزی مێ شورەییە، کە دەیانوێت بیدەن بە بەرۆکی ئیسلامدا. لە یەکەم رۆژی گرتنی جڵەوی دەسەڵات، کچان و ئافرەتانیان لە خوێندن قەدەغە کرد، بە هەزار بڕوبیانوی هیچ و پوچی وا کە لای هیچ مرۆڤێکی ئاسایی قابیلی قبوڵـکردن نین.

بەڵام ئەوەی یارمەتی تاڵیبانی دەدا لە بەردەوام بوون لەسەر شێوازی دواکەوتوە، دواکەوتوویی خودی کۆمەڵگای ئەفغانستان و هەندێک بەشی پاکستانە، ئەگینا لەپاش ڕووخانی حوکمیشیان کە هێشتا لە ڕیزی نەیارانن بەردەوام نە دەبوون لەسەر قەدەغەکردنی مێینەکان لە خوێندن، بەڵکو لە ژیانێکی ئاسایی لە هەر شوێنێک دەستیان پێی ڕابگات.

لە ٢٠٠٩/١/١١ تاوانێکی هێندە گەورەیان ئەنجامدا دەرهەق بە چەند قوتابیەکی کچ، کە ویژدانی هەموو خاوەن ویژدانێکی هەژاند، کاتێ شەش پیاوی دەبەنگی مێشک داخراو بە تێزاب هێرشیان کردە سەر کۆمەڵێ کچ لە ڕێگای قوتابخانە لە شارۆچکەی (میروەیس)ـی سەر بە شاری هیرات، کە لە ژێر دەسەڵاتی تاڵیبان دایە. ئاکامی ئەو هێرشە دڕندانەیە سوتان و شێواندنی ڕوخساری ١١ قوتابی و چوار مامۆستای ئافرەت بوو، کە حاڵەتی کچێک بەناوی (شەمسیە) لە هەمویان خراپتر بوو، شێوەی بە تەواوی سوتاوەو شێوێندراوە. شەمسیە دەڵێت من و خوشکێکم لە ڕێگای قوتابخانە بوین کاتێ ماتۆڕ سوارێک لێمان نزیک کەوتەوەو گوتی:"ئێوە دەچن بۆ قوتابخانە؟" ئینجا پەچەی سەر ڕوخساری منی لێکردەوەو ماددەیەکی سوتێنەری بەدەموچاوی داکردم"، شەمسیە سەرەڕای شێوانی ڕوخساری چاویشی زۆر کز بووە، هەتا بە زەحمەت دەتوانێت بخوێنێتەوەش. سەیر لەوەدایە سەرەڕای ئەو هێرشە دڕندانەیە کەسوکاری کچەکان وەک شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی لە دژی ئەو توندڕەوانە بە تەحەداوە بەردەوام بوون لە ناردنی کچەکانیان بۆ

قوتابخانە، شەمسیە دەڵێت:"باوک و دایکم پێیان گوتم دەبێت بەردەوام بم لە چوون بۆ قوتابخانە هەتا ئەگەر بشکوژرێم". ئێستا هەموو کچانی ئەو ناوچەیە گەڕانەوە بۆ قوتابخانە، دایکی شەمسیە کە نەخوێندەواریشە دەڵێ:"نایانەوێت ئێمەی ئافرەت بخوێنین، دەیانەوێت دەبەنگ بین".

بێگومان لەبەر کاردانەوەی توند لە هەموو لایەکەوە تاڵیبان نکوڵی کرد لە ئەنجامدانی ئەو هێرشە، بەڵام بە ڕەسمی لە مزگەوتەکان و شوێنە گشتیەکان بڵاوکراوە هەڵدەواسن، کە داوا لە خەڵک دەکەن کچەکانیان نەنێرن بۆ قوتابخانە، کاتێ دیتیان خەڵک گوێیان پێ نادەن ئەو کارە ترسنۆکانەیان کرد، کە زۆر گونجاوە لەگەڵ عەقڵییەتی توندڕەوان، کە لە عێراق لەناو تازیەو مزگەوتیش خۆیان دەتەقێننەوە، یان مرۆڤی نەخۆش و بێ هۆشی بەستەزمان تەقەمەنی لێدەبەستن و دەیتەقێننەوە.

بەودوایەش کە دۆڵی سوات کەوتە ژێر چەپۆکی تاڵیبانی پاکستان، بەر لە هەموو شتێک بڕیاری قەدەغەکردنی ڕەگەزی مێینەیان دا لە قوتابخانەو چوونە دەرەوەی ماڵ بێ مەحرەم، ئەوەش ئیبداعێکی تاڵیبانی پاکستانە بەسەر تاڵیبانی ئەفغانستان. ئافرەتێکی سوات بە ناوی هوما کە مامۆستایە، دەڵێت:"ژیان بۆتە بازنەیەکی داخراو، نازانم پێتان بڵێم بە چ دەردێک دەچم بۆ قوتابخانە، سەرەڕای سەپاندنی نیقاب و پەچە دەبێت لەگەڵ پیاوێک دەرچم بۆ قوتابخانە یان بۆ دەرەوە، ئافرەت ئەگەر باری تەندروستی خەراپیش بێت ناتوانێت لە ماڵەوە دەرچێت بەبێ پیاو، ژیانێکی چاڕسکەرو پڕ لە بێزارییە تا ڕادەی گریان. هیچ تەرفیهێک نییە، نە تەلەفزیۆن نە سینەما نە مۆسیقا، ناتوانم هەتا بڕۆم بۆ بازاڕیش".

لە دەسکەوتەکانی تاڵیبانی پاکستان لە سوات لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوو، تا ئێستا تەقاندنەوەی ١٩١ قوتابخانەیە کە ١٢٢ی هی کچانە. ئەو هەموو کارە دزێو نا مرۆییانە بە ناوی تەتبیق کردنی شەریعەتی ئیسلامی دەکرێت، ئایا ئەوە کاری دڵسۆزانی ئەو دروشمە نییە ئەو کارە دزێوانە ئیدانە بکەن، ئەگەر ئیدانەشی ناکەن بڵێی هەمان موژدەی تاڵیبانی پاکستان و تاڵیبانی ئەفغانستان یان پێ بێت بۆ خەڵک.

# سەعوودە و ڕەبابە ژەنین(٤٦)

## لە قەدەغەی ئافرەت لە لێخوڕین

لە وتارێکمدا کە باسم لە دیاردەی لاسایی کوێرانەی بەناو سەلەفیەکانی کوردستان بۆ زانا وەهابیەو سعودییەکان دەکرد، لەبەر تێگەیشتن لە خودی خۆ بەکەمزانی خەڵکی لاساییکەر، وتم لەوانەیە ڕۆژێك دێت نۆرەی ئەوەش بێت وەك سعودیەکان، کە مایەی گاڵتەجاری دونیای ئیسلام و غەیری ئیسلامن لەبەر قەدەغەکردنی لێخوڕین لە ئافرەت، ئێوە لە کوردستان هەمان داوای قەدەغەکردن بکەن. باوەڕتان بێت کەمێ بە دوو دڵیەوە ئەو چەند دێرەم نووسی، چونکە دەمزانی زۆر بێ کەسایەتی و لاوازن بەرامبەر هەموو شتێکی سعودی و وەهابی تاڕادەی بەچۆکداهاتن و توانەوە لەناو کلتوریشیان، وەك دیشداشە لەبەرکردن و بەکارهێنانی دەستواژەی عەرەبی سەلەفی، هەندێکیان هەر بەتەواوی زمانی کوردیان فەرامۆشکردووەو منداڵەکانیان هاندەدەن عەرەبی باشتر فێربن، بەڵکو هەیانە لەماڵەوە بە عەرەبی قسەدەکەن لەگەڵ منداڵەکانیان لە فریوخواردنیان بەو حەدیسە ئومەویی سەرمۆرانەی کە هانی خەڵك دەدەن زمانی خۆیان فەرامۆشکەن، بەس برەو بەزمانی عەرەبی بدەن، چونکە زمانی ئەهلی بەهەشتیشەو ئەوەی عەرەبی بزانێت و، بە کوردی یان هەر زمانێکی تر قسە بکات نیفاق لە دڵی دەڕوێت.

سەرەڕای ئەو شتانە هەرگیز نەمدەزانی پێشبینیەکەم دێتە جێ و لە کوردستان سەرەڕای جیاوازی ئاستی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی، بوونی دڵفراوانی و تەساموحی دینی، داوای قەدەغەکردنی لێخوڕین کەن لە ئافرەتان، کە لەوەتی کورد ئوتومبیلی دیتوە ئافرەت هەبووە لێیخوڕیوەو سەدان هەزار ئافرەتی شوفێر هەیە لەو کوردستانە کە ئوتومبیل لێدەخوڕن بەبێ ئەوەی ئەو هەموو کارەساتانە رووبدات، کە لە کتێبە عەنتیکەو بەرگ

---

(٤٦) ئیسلام پەیك ، ٢٠١٤/١٠/٥ .

لووسەکانی سعودیەو خەلیج دا هاتوە، کە بە عەقڵیەتی زیندانیکەرو پاسەوانی زیندان نووسراوە لە کۆمەڵگەیەکی بەدەوی و پڕ گومان لە ئافرەت و لە غەریبە.

خەڵك لە سعودیەش بێ دەنگ نین، بەڵکو ناوە ناوە، ئافرەت و پیاوانێکی زۆری بە ویژدان، چالاکی دەکەن لە دژی ئەو قەدەغە کردنەو چەندین جار ئافرتان لە دژی ئەو قەدەغە کردنە بە کۆمەڵ ئوتۆمبیل یان لێخوڕیوە، زۆریشیان تووشی زیندانی و سزای دراوی هاتوون، لەو کاتانەش دەسەڵاتی سیاسی ئالی سعود لە ترسی چاوکراوانەوەی خەڵك و وەرگرتنی هەقێك بە خۆپیشاندان دژی گۆڕینی وەزعەکە دەوەستن، پیاوانی ئایینی وڵاتیش تا دەتوانن هێرش دەکەنە سەر چالاکوانەکان و بەچەندین تۆمەتی گەورەی وەك ئیلحادو دەعوەکردنی خەڵك بۆ یاخیبوون لە یاساکانی دەوڵەت، خروج علی ولی الامر و لیبڕالیەت و چەندین تۆمەتی تری ئامادە. لە دوا چالاکیدا موفتی سعودیە الشیخ عبدالعزیز آل الشیخ لە میانی سیمنارێکدا گووتی:بڕیاری قەدەغەی ئافرەت لە لێخوڕین بۆ پاراستنی کۆمەڵگایە لە شەڕ، داوای لە کۆمەڵگا کرد قەدەغەی ئافرەت لە لێخوڕین نەکەنە خەمێکی سەرقاڵکەرە، داوای لە کوڕو کچانی وڵات کرد، ئاگاداربن لە شەڕانگێزی کەناڵـە میدیاییە غەرەزدارەکان کە لە کەمین دانیشتوە بۆ دەوڵەت و بۆ ئەو خزمەتەی بە ئیسلام و موسڵمانانی دەکات، چونکە ئەو کەناڵانە بەرزەکی گەندەڵی و بڵاوکردنەوەی شوبهەت و فەسادن.

نازانم کام شەڕە تووشی ئیسلام و موسڵمانان دێت لە لێخوڕینی ئوتۆمبیل لەلایەن ئافرەتانەوە، کام خێرو خزمەتی دەوڵەتی سعودی بۆ ئیسلام و موسڵمانان، ڕاستە لە ١% ئەو پارەیەی کە لە فیسق و فەساد و کەناڵـی خراپ سەرفی دەکەن، دەکەنە خێر بۆ ریایی، کەچی دە ئەوەندەیان زیاتر بۆ دێتەوە لە وەرزی حەجدا کە ملیۆنەها موسڵمان بۆ حەج کردن بەرەو ئەوێ دەچن و پارەیەکی زۆر لەو وڵاتە خەرج دەکەن، کە لە بنەڕەتدا پێویستی بەو پارەیە هەر نییە، وڵاتێکە غەرقی ناو دەریای پترۆدۆلار بووە. لەلایەکی تر هەر بەو پارەیە توندترین و شێواوترین نوسخەی ئیسلامی

سعودی بە دنیادا بڵاودەکەنەوە، هەر بەو پارەیە هەزارەها کتێب و نامیلکەی توندڕەوی بە خۆڕایی بە چوارلای دونیادا بڵاودەکەنەوە، تا لەئەنجامدا ئیسلامیان لە دنیادا تووشی گەورەترین تەنگژە و ناوزڕاندن کردوە، دینێکە بە فیکری توندڕەوانی ئەوان و وەبەرهێنانی دوژمنان و ناحەزانیشی وابێزێندراوە، ملیۆنەها موسڵمان باجەکەی دەدەن ڕۆژانە. ئەو هەموو کارەساتەی ئیسلامی سعودی وەهابی شەڕ نیە، بەڵام لێخوڕینی ئوتومبیل لە لایەن ئافرەت شەڕە و دەسیسەی دوژمنانە، دەبێت ئەو شەڕە چی بێت.

دەڵێن ئافرەت نابێت لێخوڕێت، دەبێت شوفێری هەبێت، پێیان دەڵێن شوفێری بێگانە خراپترە لەوەی ئافرەت بەخۆی لێخوڕین بکات، چونکە مانەوەی لەگەڵ شوفێرەکەش خەڵـوەتە، دەڵێن ڕێگا خەڵوەت نییە، چونکە ئیمام ئەحمەد وەك المروزی لێیەوە دەگێڕێتەوە، کە پرسیاری لێکرا: کلفرۆش کە بە تەنها لەگەڵ ژنێك قسە دەکات، ژنی تریان لا نەبێت خەڵوەیەو نەهی لێکراوە؟ گووتی: لەسەر ڕێگان، گووتیان : بەڵێ، گووتی: خەڵوە لە ماڵەوە دەبێت، کەوابوو خەڵوە نیە شوفێرەکە بەرەو کوێی ببا، چونکە ڕێگا خەڵوە نیە، دەڵێت کێشە نیە شوفێری ژنی بۆ دەهێنین، واتە کیشە نیە ژنێکی موسڵمانی پاکستانی یان میسری ئوتۆمبیل لێخوڕێت، بەڵام نابێت ژنێکی سعودی ئەو کارە بکات، دیارە ئافرەتانی تر کۆیلەن و ئافرەتە سعودیەکان ئازادن.

دەڵێن با ئافرەتی کافری شینیان بۆ بهێنن، دەڵێین لەوە ناترسن ئەو ئافرەتە (کافرانە) ئەخلاق و ئەتواری ژنەکان و پیاوەکانیشتان بگۆڕن.

دەڵێت ئەوە نیە ژنان لەسەر کەژاوەی حوشتر سواردەکران و پیاوێك حوشترەکەی لێدەخوڕی، پێیان دەڵێین هەر ئەو کەژاوە لێخوڕینە نەبوو خەریك بوو ناوی پاکترین ژنی پێغەمبەر عائیشەی پێ بزڕێنرێت؟ دەڵێ نازانم حەدیسەکان وادەڵێن.

ئەوە کێشەی ئەو کۆمەڵگایەیە لە جیاتی عەقڵ، دەق و قال فلان و اخبرنا علان بەڕێوەی دەبات، هەرچەندە ئەو دەقە بۆ کۆمەڵگایەکی تر هاتبێت، یان مولزەمیش نەبیت، کەی ئیسلام لیخوڕینی هەر شتێکی لە ئافرەت قەدەغە کردوە تا ئێوە قەدەغەی کەن.

دەڵێین: ئەی پێتان خۆشە ئافرەتان بە گواستنەوەی گشتی دووچاری سەدان شتی خراپ و گێچەڵی سێکسی بن؟ دەڵێن نا مەبەستمان ئەوەیە ژن ببەستینەوە بە شورەی ماڵەوە لە ڕووی دراوییەوە لە ڕێگای گەشەپێکردنی ئابووری خێزانی، پیشەسازی ماڵی، کە سودمەندی ئابووری خۆی سەلماندوە، یان کاری ناو ماڵ ببیننەوە لە ڕێگای ئینتەرنێت، ئەگەریش خوێندی لەڕێگای خوێندن لە دووردا بخوێنێت تا پێویستی بە چوونە دەروە نەبێت وەك ابي ثفال المري تابيعى، کاتێ پرسیاریان لێکرد دەربارەی چوونە دەرەوەی ئافرەت؟ گووتی: بۆچی دەردەچێت؟ بەخوا نە لە نەفیرو بانگی جیهاددا دەردەچێت، نە بۆ لێخوڕینی وشتر دەردەچێت. کەوابوو ئامانج لە کۆتاییدا زیندەبەماڵکردنی ئافرەتەکەیە، بێگوومان پاسەوانی زیندان بە عەقڵیەتی زیندانیکردن بیردەکاتەوە. نوێژکردنی ماڵەوەی لە مزگەوت باشتر بێت، کار لەناو ماڵەوە بکات بەناوی ئابووری خێزانی وەك باو بوو پێش شۆڕشی پیشەسازی، لەماڵەوە بخوێنێت لە ڕێگای ئۆنلاین، کەوابوو ئەو تابیعیە ڕاست دەکات، بۆچی دەردەچێت؟ کە نە لە نەفیرو بانگی جیهاددا دەرچوونی لەسەرە، نە لێخوڕینی وشتر کاری ئەوە. مەسەلەکەیان واتە لێخوڕینی ئوتومبیل لە لایەن ئافرەت، لەبەر بەتاڵی مێشکیان هێندە گەورە کردوە، لای ئەوان هەزاران کارەساتی سەرزلی لێدەکەوێتەوە، لەو کارەساتانەش:

١- دەرخستنی دەموچاوی و قۆڵ و باسکی.

٢- نەمانی حەیا، لەناوچوونی پیاوەتی و شەخسیەتی پیاو.

٣- قەرەباڵغی دروستکردن بۆ پیاوان، کە پیاوان شایان و خاوەن هەقی لیخوڕینی ئوتۆمبیلن و خاوەن هەقی ڕێگان زیاتر لە ئافرەتان. ببینە لەو ڕەگەزپەرستیەی.

٤- دەبێتە هۆی هەڵەخەرجی، هەر کچێك ئوتۆمبیل داوادەکات، بە مۆدیلیش دەیگۆرێت، باشە تۆ عیلاقەت چیە بوەو؟ بۆ باسی هەڵـەخەرجی پیاوانی سعودیە ناکەن بە لێشاو پارە لە ڕابواردن و سۆزانیەکانی ئەوروپا سەرف دەکەن.

٥- ناچاربوونی دەرکردنی مۆڵەتی لێخوڕینی ئوتومبێل لەگەڵ وێنەی ئافرەتەکە، لەو کارەساتەی.

٦- ناچاری سواری ئوتۆمبیل بوون لەگەڵ پیاودا لە کاتی تێکچوونی ئوتۆمبیلەکەی! بۆ نابێت باوکی یان برای یان مێردی بێت بەدواییدا.

٧- ئاسانی ڕفاندن و گێچەڵ پێکردن و تاوگیرکردنی ئافرەت لە کاتی تەنیایی، فڕان فڕانە، بە ژیانی دارستان دەچێت.

٨- مەفاسیدی ڕەوشتی، بەپێی توێژینەوەیەکی یونیسکو ئەو کۆمەڵگایانەی ژن ئوتۆمبیل لێدەخوڕیت [واتە هەموو جیهان] لادانی ڕەوشتی زۆرترە لەوانەی ژن ئوتۆمبیل لێناخوڕێت [واتە سعودیە] کەوابوو با هەموو جیهان بەدوای عەقڵیەتی بلیمەتانەی سعودیە بکەون بۆ ڕزگار بوون لە لادانی ڕەوشتی.

٩- لێخوڕینی ئوتومبیل لە لایەن ئافرەت کردنەوەی دەرگایەکی داخراوە لەبەردەم ئافرەتە بەدڕەوشتەکان بۆ کەمکردنەوەی بڵاوکردنەوەی بەدڕەوشتی لە کۆمەڵگادا، لە قەدەغەکردنی لێخوڕینی ئوتومبیل لە لایەن ئافرەت تەسک کردنەوەی بواری بەدڕەوشتیە لەبەردەم ئەو ئافرەتە خراپانە، واتە لەبەر خاتری ڕێژەیەکی کەم بەدڕەوشت هەموو ئافرەتانی سعودیە سزا بدرێت.

١٠- بێوەژن و موحتاجەکان لە کۆمەڵگادا سوود لە ڕێگادانی لێخوڕینی ئوتومبیل لە لایەن ئافرەتەوە نابینن، چونکە زۆربەیان ناتوانن لەبەر هەژاری ئوتۆمبیل بکڕن، جگە لە خەرجیەکانی ئوتۆمبیل، شورەییە لە وڵاتێك کە هەرە

وڵاتی دەوڵەمندی جیهانە باسی هەژاری و نەتوانینی ئوتۆمبیڵ بکڕێت، لەلایەن بێوەژن و ژنە هەژارەکان. ئەوە چ لۆژیکێکی نەخۆشانەیە، هۆیەکی تریش لەلای منەوە بۆ قەدەغەکردنی لێخوڕینی ئوتومبیل لە لایەن ئافرەت، ئەوەیە لەوانەیە ببێتە هۆی سەرسوڕاندنی شوفێرە پیاوەکان و زۆربوونی ڕووداوەکانی هاتووچۆ و کەمبوونەوەی ڕێژەی پیاوان، ڕاوەستانی کردەی خۆکوژی و جیهادی وەهابی لە جیهاندا.

یان لەوانەیە لێخوڕینی ئوتومبیڵ لەلایەن ئافرەتەوە ببێتە هۆی هەڵـگیرسانی شەڕی جیهانی سێیەم، لەبەر لاوازی عەقڵی ئافرەتان ئافرەتێك خۆی بکێشێت بە باڵوێزخانەی ئەمریکی لەئەنجامدا شەڕی ئەمریکاو سعودیەی لێبکەوێتەوەو جیهان هەمووی تێوەگلێنە ناو کێشەکەو لەئەنجامدا شەڕی جیهانی سێیەم هەڵگیرسێت، مرۆڤایەتی لەناو بچێت لەبەر لێخوڕینی خانمی.

دەیان قسەو بەڵگەی قۆڕتر کە فلسێکی سووتاو ناهێنێت دەیهێننەوە، هەتا یەکێکیان نامیلکەیەکی دەرکردوە بەناوی: عشرون مفسدة من مفاسد قيادة المرأة للسيارة، بەڵام وەك کچە تونسییەکی قارەمانی پێشبڕکێی ئوتۆمبیل دەڵێت، بەڕاستی تەنها گفتوگۆ کردن لەسەر قەدەغەکردنی لێخوڕینی ئوتومبیل لەلایەن ئافرەت، سەخافەتە.

ئێستا فشارەکان زۆرن بە دووری نازانم چەند ساڵێکی تر ئەوەش بگۆڕێت بە مەرسومێکی شاهانە ڕێگا بدرێت بە لێخوڕینی ئافرەت، ئەو کاتە ئەو هەموو بەڵگا بێ مانایانەی ئێستا دەیهێننەوە بۆ قەدەغەکردنی لێخوڕینی ئوتومبیل لە ئافرەت، هەمووی دەبێتە دەقێکی مێژوویی بێ کەڵك.

## سەرچاوە:

http://www.saaid.net/Doat/ehsan/٩٥.htm
عشرون مفسدة من مفاسد قيادة المرأة للسيارة
لە سایتی شرۆڤەش بڵاوکرایەوە

## گەڕانەوە بۆ سەردەمی جاریە و کەنیشکەکان[٤٧]

### ابو اسحاق الحوینی

کاتێ ڕەخنە لە خیتابی سەلەفیەت دەگرین، خودا ئاگادارە هیچ پاڵنەرێکی شەخسیمان نیە، نە پاڵنەری شوهرەت و نە پاڵنەری ماددی، چونکە ڕێگای ئاسانتری زۆر هەیە بۆ شوهرەت پەیداکردن لەبەر بوونی شوبهەیەک یان لەدەستدانی سەربەخۆیی پێیدا نەڕۆیشتین، گوێمان لێدەبێتەوە جاروبار تانەی بێدینیمان لێدەدەن بە نسبەت ئەو تانەیەش دەڵێین، سەلەفیەت هەموو کەسێکی دەرەوەی بازنەی خۆیان بە بێدینی تاوانبار دەکەن جا با لە ئاستی ئەبو حەنیفەی نوعمانیش بێت، کە سەدان و هەزاران جار تەکفیر کراوە، لە سەرچاوە سەلەفیەکان لە نووسینەکانی پێشوماندا بە درێژی باسمان کردوە. تەنها هۆیەک و پاڵنەرێک هەمان بێت لەو بوارە، شکاندنی دیواری پڕ لە ترس و لەرزی پیاوانی دینیەو گۆڕەپانی ئیسلامییە، لەبەرامبەر توندڕەوی و دڕندایەتی ئەو فیکرەیە کە ناویان ناوە بە سەلەفیەت.

دوای شۆڕشەکانی تونسی و میسری، وەک هەموو جارێک دیسان لە هەلومەرجی پڕ پشێوی و پاشاگەردانی، دەیان گروپی سەلەفی سەریان هەڵداو، دەستیان دایە کار منداڵبازاڕی لە هێرش کردنە سەر قەبرو مەزارەکان و سوتاندنی کەنیسەکان، خۆشکردنی ئاگری تایفەگەری و تەجاوز کردنە سەر هەندێک شوێنە گشتیەکان ...هتد، وەک بڵێی ئەو شۆڕشە مەزنانە بۆ ئەوە هاتوون موحارەبەی قەبرو مردووەکان بکەن، نەک بنیاتنانی ژیانێکی نوێ و مەدەنی دوور لە وەسیەتە ڕەش و تاڵەکانی شێخەکانی سەلەفیەت. دەیانەوێت خەڵک لەپاش ئەو شۆڕشانە بۆ بەرژەوەندی وڵاتانێکی خەلیجی سەرقاڵ بکەن بەو کارە لاوەکیانە، مەسەلە سەرەکیەکان لەبیر خەڵک ببەنەوە، لە دادگەری کۆمەلایەتی و دەستەبەرکردنی ئازادیەکان و مافەکان. ئەو قسانەم بە بۆنەی ئەو مشتومڕە هات، کاتێک (ابو اسحاق

---

(٤٧) ٢٠١١/٠٧/٠٤. کوردستان پۆست

الحوینی) کۆڵەگەی هەرە گەورەی سەلەفیەت لە میسری تازە شۆڕش کاسێتێکی کۆنی ئاشکرا کرا تێیدا چارەسەرێکی سەیرو سەمەرەی کێشەی ئابووری دەخاتە بەردەم خەڵکی گشتی جیهانی ئیسلام، ئەو چارەسەرەش جیهادە، بەڵام چۆن جیهادێک، جیهادێک بمانگەڕێنێتەوە بۆ دواوە بۆ سەردەمی جەواری و کەنیشک و کۆیلایەتی، ئەوەیە دابڕانی ئیپیستمۆلۆژی مەعریفی سەلەفیەت لەگەڵ ئەو سەردەمە کە تەنها قسەکردن لەو بارەیەوە بە تاوان دەژمێردرێت، من بە خۆم گوێم لەو کاسێتەی ابو اسحاق الحوینی بوو لەسەر یوتیوب لەو ناونیشانە[٤٨].

بەڕاستی کە گوێی لێدەگریت، هەست دەکەیت ئەو کەسە تا چ ڕادەیەک مرۆڤایەتی خۆی لەدەست داوەو نزیک بۆتەوە لە سروشتی جانەوەرو دڕندەکان، کاتێک مەسیحیەکان و یەهودیەکان و هەموو غەیرە ئیسلامەکانیش لە هاتنی ئیسلام و گەڕانەوەی دەترسێن پێیان دەڵێین دوژمنانی دینی خوان. ئەخر چۆن نەترسن لە دینێک کەسانێکی تێدایە بەو جۆرە داوای تاڵانکردن و کۆیلایەتی کردنی خەڵکی غەیرە ئیسلام دەکەن، گوێگرە بە عەرەبی لەهجەی میسری ابو اسحاق الحوینی کە هەتا ناوەکەشی دەڵێی هیچ پەیوەندی بەو سەردەمەوە نییە، چی دەڵێت بۆ چارەسەری هەژاری:
"هو الفقر اللي إحنا فيه ده مش بسبب تركنا للجهاد؟، مش لو كنا كل سنة عمالين نغزو مرة ولا اتنين ولا تلاتة مش كان هيسلم ناس كتير في الأرض"، كل واحد كان هيرجع من الغزوة جايب معاه "يقصد أسرى" تلات أربع أشحطة وتلات أربع "نسوان" وتلات أربع ولاد، اضرب كل رأس فى ستميت درهم ولا ستميت دينار يطلع بمالية كويسة"

(مەگەر ئەو هەژارییەی ئێمە تێیدان بەهۆی وازهێنانمان لە جیهادکردن نییە؟ ئەگەر ئێمەساڵانە جارێک و دوو یان سێ جار غەزامان کردبا

---

(٤٨) http://www.youtube.com/watch?v=jBORwJAVLDU

خەڵکێکی زۆر موسڵمان دەبوون لەسەر زەوی، هەرکەسەی دەگەڕایەوە لەو غەزایە بە سێ چوار پیاو (ئەو وشەی اشحطة بەکار هێناوە کە سوکایەتی پێکردنە بە ئادەمیەتی مرۆڤی ناموسڵمان وەک علوجی کۆنی توراسمان) و سێ چوار ژن و سێ چوار منداڵ، هەر سەرێکی بدە لە شەش سەد درهەم یان دینار پارەیەکی چاکت لێی دەست دەکەوێت.

لەو جیهانەدا کە ئەمڕۆ کۆمپانیا هەیە بەقەد چەندین دەوڵەت بودجەو قازانجی دەست دەکەوێت، ئەو جانەوەرە فیکری کلۆڵی بۆ هیچ بازرگانیەک و پیشەسازیەک ئیش ناکات، تەنها ڕێگای تاڵان و برۆ و غەنیمەت نەبێت. ڕێگای کۆیلایەتی بەنیادەمەکان نەبێت، زۆر بەمتمانەوە دەڵێت: ولو رايح علشان تعمل صفقة عمرك ما هتعمل الأموال دي (ئەگەر بچیتە ئەوێ بۆ سەفقەی ژیانت هەرگیز ئەو پارەیەت دەست ناکەوێت) لە هەمووی مەترسیدارتر دەڵێت ئەوەشی بەو بانگەوازە ڕازی نەبێت (لەدژی دەجەنگێین، بەدیل دەیگرین و ماڵ و ژن و منداڵی دەبەین، ئەوەش هەمووی بریتین لە پارە وپول "واللی يرفض هذه الدعوة نقاتله، ونخدوا اسير وناخد اموالهم ونساءهم وكل دى عباره عن فلوس"

بێگومان پاش کاردانەوەی خەڵک لەدژی ئەو بیرە بۆگەنانە، ابو اسحاق الحوینی و سەلەفیەکانی میسرو دونیا هاواریان لێ هەستا گوایە ئەو قسانە کۆنن پێش ١٨ ساڵ گوتراون، لە سیاق دەرکراون و خراپ لێکدراونەتەوەو ئەو قەوانە کۆن و سواوەی کە لە پاش هەموو قسەیەکی قۆڕو لێدوانێکی نامەسولانە دەکرێت، سەیر لەوەدایە هەر ابو اسحاق لە کلیپێکی تردا شەرم دەکات قسەکەی وەک خۆی دووبارەکاتەوەو سەدان پینەو پەڕۆی بۆ دەکات، هەرچەندە سورە لەسەر ئەسڵی فیکرەکە[٤٩].

(٤٩) گوێبگرن لەو لینکە لە یوتیوب:

http://www.youtube.com/watch?v=I٩Bn٨Mmbz٢A&NR=١

هێشتا کاردانەوەی ئەو قسە دزێوانە تەواو نەبىو کاتى ئافرەتێکى عەقڵ کلۆلی جاریە ئاسا قسەی لەو خراپتری کرد، لە وڵاتی کوێتی عوزماوە کەسێک کە گوایە چالاکوانە دەیەوێت چارەسەری کێشەی زۆری زیناکردن بکات بۆ کوێتیەکان بە گەڕاندنەوەی سەردەم و عەسری جەواری و عەبید، تا دینیان لە دەست نەچێت، چۆن، سلوی موتەیری دەڵێت:پێویستە یاسایەک بە پەلە دابنرێت بۆ هێنانی کەنیشک لە ڕێگای نوسینگە تایبەتیەکان، چونکە بەپێی قسەکانی ئەو (کەنیشکەکان بۆ ڕابواردن کراون و ئایین مولکایەتی ئەوانی حەلال کردوە بە مەرجێک دیلی جەنگ و غەزاکانی دەوڵەتێکی ئیسلامی بن لەدژی دەوڵەتێکی نا ئیسلامی، دەکرێت دیلە ژنەکانی روسەکان لای شیشانیەکان بهێنین یان لە روسیا و وڵاتانی تر، ماشاڵلا وڵاتانی ئیسلامی چەندە بەهێزن تا منداڵ و پیاو و ژنی وڵاتانی تر وا بە ئاسانی وەک مەڕوماڵات بفرۆشرێن لەبازاڕی نەخاسەی کوێتی عوزما، ڕوسیا ئەگەر بیەوێت بە چەکەکانی هەموو جیهانی ئیسلامی لەوجوود تەفروتونا دەکات، چ جای شیشانێکی بەستەزمان، کە تەنها خەریکی کاری نامرۆیانەی، بارمتەکردنی قوتابخانەی سەرەتایی منداڵان و تەقاندنەوەی میترۆکان و کاریتر، هەرچەندە ڕوسەکان کاری لەوە قێزەونتر دەکەن.

ئێمە کە گوێمان لەو عەقڵیەتەی ژنێکی عەرەبی دەبێت، ئەوسا دەزانین چیان بە کچانی ئەنفالی کورد کردوە، ئەو ئومەتە هەرگیز بستێک پێش ناکەوێت تا خاوەنی ئەو عەقڵیەتە بێت، سەیر لەوەدایە ئەو ژنە دەڵێت پرسیاری پیاوانی ئاینیشی کردوە، هەموویان پێیان گوتوە کە ئەو کارە حەلال و زەلالە.

ئەگەر ئایین و دەوڵەتی ئایینی لەژێر ئەو لافیتانە بۆ بە کۆیلەکردنی خەڵک و بەمەڕوماڵاتکردنیان دەگەڕێتەوە، یاخوا هەر نەگەڕێتەوەو دەوڵەتی عەلمانی سەد هێندە چاکترو بەبەزەیی ترە..

# ابن العثیمین و ئافرەت

# کتێبی ئەوە شایەنی قەدەغە کردن نییە؟!

خۆزگە ئەو هەموو سەروەت و سامانە لە ژێردەستی ئەو وڵاتە دواکەوتوانەی کەنداو نەدەبوو، چونکە لە ڕێگای پارەوسامانەوە دەیان فکری پڕوپوچ و نامرۆیی بڵاودەکرێتەوە، جوانترین و مرۆییترین بیروباوەر و فیکریش لە چوارچیوەیەکی بچوك قەتیس دەمینێتەوە، باسی قەدەغە کردنی کتێبەکانی چەند باوکانێکی سەلەفیەت کرا، من زۆر حەز لە قەدەغەکردن ناکەم، هەرچەندە خۆیان سەلەفیەکان لەو جێییەی دەسەڵاتیان دەبێت ناهێڵن کتێبی کەسیتر هەبێت< بەڵام وەرن بزانن ئەو ابن العثیمین ە کە گەورە تیۆریستێکی سەلەفیەتە چۆن دەڕوانێتە ئافرەت بۆ نمونە.

ئەو کەسە کانالێکی تایبەتی هەیە بە ناوی کەناڵی (ابن العثیمین)، کە تایبەتە بە فیکری ابن العثیمین قوتابیە نەجیبەکەی ابن تیمیة بەهەموو توندرەوی و زمانزبری و نامەنتیقیەوە، راکانی دەربارەی ئافرەت ڕەنگدانەوەی کۆی عەقڵیەتیتی قسەیەکی خۆشیم خویندەوە لەسەر ئافرەت، کە گویت لێدەبێت دەزانیت چ بیرێکی کارەساتاوی لە میشکی ئەو پیاوە دایە، دەڵێ:"خەڵـکانیك فێربوون نازناوی (السیدة) لە ژن دەنێن، بۆ نمونە دەڵێن:"هذا خاص بالرجال، وهذا خاص بالسیدات"، ئەوە ئاوەژوو کردنەوەی هەقیقەتەکانە، چونکە (سەیدەکان)ـی سەردارەکان [السادة] پیاوانن، قال تعالی:[والفیا سیدها لدی الباب] وقال [الرجال قوامون علی النساء.] وقال رسول الله [النساء عوان عندکم] واتە لە پایەی دیلیدان... مجموع الرسائل والفتاوی ١٠-٩٢٨.

کەوابوو پیاوان سەردار و سادەن، ئافرەتان لە مەنزیلەی یا پایەی دیلەکانن. وەسف کردنی ئافرەتان بە [سیدات] ئاوەژوو کردنەوەی هەقیقەتەکانە، باشترە پییان بڵێین الاسیرة فلانة بنت فلان. تەسەورکە خاوەنی ئەو فیکرە یەک کەناڵی ئاسمانی بۆ تەرخان بکرێت.

ڕاکانی دەربارەی لێخوڕینی ئوتومبیل لەلایەن ئافرەتەوە تەواوی جیهانبینی دواکەوتوانەی دەردەخات، لەگەڵ کورتە کۆمێنتی من.

ابن العثئمین دەربارەی لێخوڕینی ئوتومبیل دەڵێت:" لە خراپیەکانی لێخوڕینی ئوتۆمبیل بۆ ئافرەت، داماڵینی حەیایە لێی، حەیا وشەرمیش لە ئیمانە وەك لە ڕێگای سەحیحەوە لە پێغەمبەرەوە هاتوە، حەیاش ڕەوشتێکی بەرزە و سروشتی ئافرەت پیی دەوێت، تا بیپارێزێت لە توشی بوونی فیتنە! ئەگەر حەیا لە ئافرەت نەما، لێی مەپرسە. [ خۆزگە دەمانزانی چ پەیوەندیەکی ئۆرگانیکی هەیە لە نێوان لێخوڕینی ئوتومبیل و حەیا وشەرم؟!] لە خراپەکانیتر: دەرچوونی زۆری ئافرەتە لە ماڵەوە، ماڵەوەش باشترین شوێنە بۆی وەك چاکترین کەس بە بەرژەوەندیەکانی خەڵك، کە پێغەمبەرە [د.خ] وادەڵێت! چونکە شەیدایانی لێخوڕین چێژی لی وەردەگرن! بۆیە دەیانبینیت لێرە ولەوێ دەخولێنەوە بە ئوتۆمبیلەکانیان هەر بۆ خۆشی!" [یانی ئافرەت چونکە لێخوڕینی ئوتومبیل نازانێ بۆیە لە ماڵەوەیە یان لەبەر زیندانیکردنی پیاوانی سەلەفیە بۆ ژنانیان؟! دیارە کە ژن لەگەل وەرگرتنی روخسەتی لێخوڕینی، هەموو ئازادیەکانیشی وەردەگرێت؟!]

لە خراپیەکانیشی ژن ئازاد دەبێت و دەچیتە کوێ و بۆ لای کێ وبە هەر ئامانجێك بیەوێت

چونکە سوکان لەدەستی خۆیەتی وبە هەر کاتێك لە شەو و ڕۆژدا دەتوانێت بڕۆ و بچێت، لەوانەیە تا درەنگانێکی شەویش بمێنێتەوە بە تەنها. ئەگەر خەڵك گازاندە لەدەست لاوانی کوڕ بکەن، کەوابوو چۆن بەرگەی دەرچوونی ئافرەتان دەگرن بە کەیفی خۆیان ڕاست وچۆب بڕۆن وبێن!؟ [یانی ژنان ئێستا بە ئەخلاقن چونکە نازانن ئۆتۆمبیل لێخوڕن؟! هەر بۆیەش وا دژی لێخوڕینی ئافرەتن بۆ ئوتومبیل!]

لە خراپییەکانیشی: لێخوڕینی هۆکارێکە بۆ یاخیبوون لە خێزانی ومیردی لەبەر بچوکترین هۆکار لە ماڵەوە دەردەچێت بۆ ئەوەی خۆی هێمن کاتەوە، وەك هەندێ لە پیاوان وادەکەن، کە لە ژن بەهێزتر و بەرگەگرترن! [گوناهە ژن خۆی هادی و هێمن کاتەوە، بچێتە لای دەستە خوشکێکی، بۆ دەبێت بە عەقڵیەتی پاسەوانی زیندان مامەلەیان بکەین؟!]

لە خراپییەکانیتری: دەبێتە هۆی فیتنە لە زۆر هەڵوێستدا، بۆ نمونە: ڕاوەستان لای ترافیك لایتی ڕێگاکان، یان وەستان لە بەنزینخانەکان، یان وەستان بۆ خالەکانی پشکنین، یان وەستان لەگەڵ پۆلیسی هاتوچۆ لە کاتی نووسینی سزای سەرپێچی یان ڕوداوێك! یان وەستان بۆ هەوا تێکردنە تایەکان و بۆ پەنچەربوون، یان وەستان لەبەر ڕوودانی عەیبێك لە ئوتۆمبیلەکەی، و پێویستی بە یارمەتی خەڵکیتر بوو، ئەو کاتە چ دەکات؟! لەوانەیە تووشی پیاوێکی بەدڕەوشت بێت سازشی لەگەڵ بکات لەسەر شەڕەفی بۆ ڕزگارکردنی لە کێشەکەی، بە تایبەت ئەگەر زۆر ناچار بوو؟! [هەردەم نیازخراپی پێش نیازپاکی دەخەن، وەك بڵێی ئەو کۆمەڵگایە پیاوەکانی گورگن و ژنەکانی مەڕ بن!]

لە خراپییەکانیتری لێخوڕینی ئافرەت: قەرەباڵغی زۆری ئۆتۆمبیلەکان لە سەر شەقامەکان، یان نەهێشتن و مەحرومکردنی لاوان[ نێر] لە لێخوڕینی ئۆتۆمبیل، ئەو لاوانە موستەهەقتر وشایەنترن لە ژنان ئۆتۆمبیل لێخوڕن! [بۆچی دەبنە مەحرومکردنی پیاوانلە لێخوڕین؟! بۆچی ئەو لاوانە موستەهەقتر وشایەنترن لە ژنان ئۆتۆمبیل لێخوڕن؟!]
لە خراپییەکانی: زۆری ڕووداو، چونکە ئافرەت بە سروشت لە پیاو بی هیمەت ترن و کورت بینترن و بێ تواناترن، کە تووشی مەترسیەك بوون نازانن چی بکەن. [ ئەوە ژنانی بەندکراوی کۆمەڵگای خۆی باس دەکات، هەرچەندە هەمووشیان وا نین، بەڵام ئەو تەوسیفە هەموو ژن ناگرێتەوە]

لە خراپییەکانی: لێخوڕینی ئۆتۆمبیل هۆکارێکە بۆ زیادەرەوی لە خەرجی ونەفەقەدا، چونکە ژن بە سروشت حەز دەکات خۆی تەواو بکات [چونکە

ناقیسە!] بە جلی جوان و شتی تر! نابینی چەند هۆگری جل وبەرگە، هەر کە جلێك دەردەچێت، کۆنەکەی فڕێ دەدات بۆ کڕینی نوێکە، هەتا کۆنەکەی باشتریش بێت! نابینیت لە ژوورەکەی چۆن شتی جوان هەڵدەواسێت؟ [ناڵێت ئەوە لە زەوقی جوانیەتی، بەڵکو لە نەقسی خودی ئافرەتە وبەو شتانە خۆی تەواو دەکات!] تەماشای هەر شتێکی بکە وایە، بەو پێوەرە ئەو ئۆتۆمبیلەی لیی دەخوڕێت لە پێشترە، هەر کە مۆدیلێکی نوێ دەرچوو، ئەوەی یەکەم جێ دەهێڵێت بۆ نوێترینیان!
ببینە لەو پاکانە لاوازانەی یەکێك لە هەرە گەورە تیۆریستەکانی سەلەفیەت، هەمووی لەسەر دڵ پیسی کۆمەڵگا دواکەوتوە بەدەویەکان دامەزراوە، کە لە کۆنەوە هەموو خەمێکیان تەنها شاردنەوەی ئافرەت بووە نەوەك لە کاتی غەزو و بەسەر یەکتردادانیدا ئافرەتانیان بکەونە ژێر دەستی هێرش کەران، ئەو نەفسیەتە بە ویراسەت ماوەتەوە لە ڕێگای داڕشتنی زۆر لەو بەرهەمە دینیانەی کە لەو ژینگەیە دەهاتنە ئاراوە، خاوەنی ئەو فیکرە یەك کەناڵی ئاسمانی گەورەی بخرێتە خزمەتی، خەڵکی خاوەن فیکری واش هەیە کتێبێکی بۆ چاپ ناکرێت! کەسێکی وا کتێبەکانی قەدەغە بکرێن باشتر نیە لەوەی هەزاران فریو بخۆن پێی!؟

.

## آمنة نصير بە شێخانی سەلەفیەت؛

### خوا جەزای خێرتان نەداتەوە لەبەر سوکایەتیتان بە ئافرەت[(٥٠)]

سوکایەتی شێخانی سەلەفیەت و فیکری سەلەفی هێندە قووڵە دەرهەق بە ئافرەت، ئەوەی یەك زەرە مرۆڤایەتی و دینداری میانڕەوی تێدا بێت لێیان دێتە وەڵام، خانمی دکتۆر ئامینە نەسیر، مامۆستای عەقیدەو فەلسەفە لە زانکۆی ئەزهەر، هێرشێکی توندی کردە سەر شێخەکانی سەلەفیەت بەشێوەیەکی گشتی و یاسر برهامی، جێگری سەرۆکی دەعوەی سەلەفیەت، بە شێوەیەکی تایبەتی، لەبەر ویاری دوژمنکارانەیان لە دژی ئافرەت. ئامینە نەسیر لە چەند لێدوانێکی بۆ بەرنامەی 'السادة المحترمون'، کە لە کەناڵی ئۆن تیڤی پەخش دەکرێت، گووتی:"هەست بە ڕشانەوە دەکەم کاتێ گوێم لە قسەی ئەو شێخە سەلەفیانە دەبێت دەربارەی ئافرەت، ئەوەی ئەوان پێی گەیشتوون لە بەدڕەوشتی و نزمی هیچ جاهیلیەتێکی بێ ئەرزش پێی نەگەیشتووە، ئەوانە خەڵکێکی سروشتی و ئاسایی نین، نازانم ئەو فەتوایانە لە کوێ دەهێنن دەربارەی ئافرەت".

هەروەها قسەکانی ئاراستەی شێخە سەلەفیەکان کردو گووتی:"خوا جەزای خێرتان نەداتەوە، خێرتان بەنسیب نەکات لە دنیا و ئاخیرەت، لەبەر سوکایەتیتان بە ئافرەت، بەپشت بەستن بە فەتواگەلێکی وا کە کەس نازانێت سەرچاوەکەی لە کوێیە".

ئەو ئافرەتە زانایە بەشێك لە بەرپرسیارەتی خستە ئەستۆی ئەزهەرو گووتی: لەگەل ڕیزم بۆ دەزگای ئەزهەر، بەڵام ئەو شێخە سەلەفیانە دەستیان بەسەر گۆڕەپانەکە گرت لەبەر نائامادەیی ئەزهەر بۆ نیو سەدە، کەموکورتی لە پێکهینانی عەقڵیەتی میسری میانڕەو و ڕوناک ئاسۆ". داواشی لە وەزیری ئەوقاف، دکتۆر محمد مختار کرد، کە ئەو شێخە سەلەفیانە نەهێڵن و قەدەغە بکەن لە چوونە سەر مینبەر. ئەگەر ئەوە هەڵوێستی وڵاتێکی تێکەڵ بەفەرهەنگی عەرەبی بێت، بەرگەی تەخەلوف و پاشکەوتوویی وتاری

---

(٥٠) ستاندەر ٢٠١٥/٠٤/١٥.

سەلەفیەت نەکەن، بۆ دەبێت لە کوردستان هەموو دەرگاکانیان بۆ واڵا بکرێت لەسەر پشت، سەدان و هەزاران گەنجمان لە خشتە بەرن[٥١].

(٥١) http://www.elaosboa.com/show.asp?id=١٤٨١٧٩#.VSxVYvBq١_c

**٢- نا بۆ بە سعودی کردنی ئافرەتانمان**

-خوشکانی کۆمەڵ و قوتابخانەی ((والله لنمنعهن))
-کەناڵی سپێدە و پەتای داعشیەت یەکگرتوو کەوتۆتە ژێر -کاریگەری سەلەفیەکان
-فرەژنی مۆدەی گەندەڵ و ئیسلامیەکان
-هێرشی تێزاب acid attack گەیشتە کورستانیش
-نا بۆ بە سعودی کردنی ئافرەتانمان
-هەولێر و دیـنداری مەلا سوسەیی وەک نـمونە
-مەلای خەتێ یان مەلای سوسێ
-ئیبن ڕوشد و ئازایەتی کورد
-شێخ مستەفا زەڵمی و چەند سەرنجێك

## خوشكانی كۆمەڵ و قوتابخانەی ((والله لنمنعهن))[٥٢]

لێدوانەكانی دڵشاد كەلاری دەربارەی پایەی ئافرەت لە ناو كۆمەڵ و بەڵكو لە ناو ئیسلام بەپێی لێكدانەوەی خۆی، هەموو كەسێكی میانڕەو و خاوەن زەوق و عەقڵێكی سەلیمی بێزار كرد. ئارەزووم جوڵا بۆ وەڵامدانەوەی، بەڵام لە دڵی خۆم گوتم تاكەی توندڕەوان ئەوەی خراپەو ناشایستەیە دەرهەق بە ئافرەتانی بكەن، كەچی ئافرەتەكانیش وەك ڕاهیباتە مێشك شۆردراوەكانی كڵێساكان بەو پەڕی لە خۆبوردەییەوە خزمەت بەپرۆژە سەقەتەكان و تێڕوانینە چەوتەكانیان بكەن، تاكەی وەك فەردە پیازێك موعامەلەی ئافرەت بكەن، كەچی خودی ئافرەتەكان نوقەیان لێ نێت. تاكەی بەدەنگەكانی خۆیان جەلادەكانی خۆیان بەرزكەنەوە بۆ ئەوەی زیاتر پەڕاوێزیان بخەن، زیاتر شەرعیەت بدەن بە چەوساندنەوەو زیندە بە چاڵ و زیندە بە ماڵ كردنیان.

ئاكاری بەرتەسک کردنەوەی ئازادیە شەرعیەکانی ئافرەتی موسڵمان زۆر کۆنە، هەر لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیسلام بەدیارکەوتن لە ژێر کاریگەری داب و نەرێتی کۆن و بێگانە بە ئیسلام و نەزعە دەروونیە تایبەتیەکانی تاکە کەسی. هەر لەسەردەمی پێغەمبەر [د.خ] کاتێ پێغەمبەر خەڵکی بانگ کرد بۆ کۆبوونەوە ووتی: [ایها الناس] "ئەی خەلکینە"، ئوم سەلەمە لە مافی بەشداری کردنی ئافرەتی موسلمان لەژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا تێدەگەیشت، بۆیە ئوم سەلەمە بەرەو پیری بانگەوازەکە چوو تا نزیک بیتەوە و گوێی لە پیغەمبەر بگرێت، کەسانێکی کە هێشتا بەعەقلیەتی نەزانی دەژیان پێیان گوت:" بانگی پیاوان دەکات" واتە مەبەستی پیغەمبەر لە ئەی خەڵکینە بانگی پیاوانە، بەلام ئوم سەلەمە وتەیە زێڕینە مەنهەجیەکەی گوت" منیش لە خەڵکم" (إني من الناس). ئەم هەڵویستە نیشانی دەدات، کە تا چ رادەیەک ئافرەت درکی بە لیپرسراوەتی دەکرد لەو کۆمەلگایەدا.

---

(٥٢) ٢٠١٢/١٠/٣٠ ئاوێنە.

بەداخێکی زۆرەوە، ئەو سەردەمە زێرینە زۆری نەخایاند، بیناغەیەکی پتەوی دانەمەزراند بۆ دوارۆژی ئافرەتی موسلمان، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەک بوو، گرنگترینیان: قوڵ داکوتانی رەگ و ریشەی ئەو داب و نەریتانەی کە بەسوک مامەڵە لەگەڵ ئافرەت دەکات لە کۆمەلگای عەرەب دا بەتایبەتی، لەو کۆمەلگایانەی ناوچەکە بەگشتی کە هاتنە ناو ئیسلامەوەو رۆلیکی سەرەکیان هەبوو لەدامەزراندنی زانستە ئیسلامیەکان دا بەتایبەتی تەفسیر و فیقە.

پاش زیاتر لە ١٤ سەدە، کە سێکیتر پەیدا بووە بە ئافرەتان دەڵێت نابێت بەشداری سیاسیان هەبێت، نابێت بێنە سەر تەلەفزیۆن، چۆن لە میوانداریەکانیان ژنان و منداڵان لە حەرەمخانەکە دادەنیشن و خەریکی خزمەتی منداڵەکان و سەریەشەکانیان دەبن، بەهەمان شێوەش خەریکی خزمەتکردنی پیاوەکان و میوانەکانیان دەبن، پیاوەکانیش لە چاکترین شوێنی ماڵەکە دادەنیشن و خزمەت دەکرێن، کاک دڵشاد دەڵێ دەبێت حزبیش وا بێت، ئافرەت نەیەتە سەدری مەجلسی شوراو مەکتەبی سیاسی، چونکە چۆن پیاوان نابنە ئەندام لە رێکخراوی خوشکان، با ژنانیش نەچنە ناو ئۆرگانەکانی پیاوانەوە، ئەوە چۆن پێوان و چۆن پێوەرێکە.

ئیمامی موسلیم شتێکی لەو بارەیەوە دەگێڕێتەوە لە عبدالله کوری عومەر، کە دەڵێت: گوێم لە پیغەمبەر [د.خ]  بوو وتی: [ئافرەتانتان لە مزگەوت قەدەغە مەکەن ئەگەر ئیزنیان لێ وەرگرتن] بیلالی کوڕی پێی وت" بەخوا قەسەم قەدەغەیان دەکەین" چونکە ئەو ئیزنە دەکەنە بیانویک یان فێڵێک بۆ دەرچون و گومان "والله لنمنعهن، إنهن يتخذنه دخلا" عبداللهی کوری عومەر رووی کردە کوڕی خۆی و، جوێنێکی وای پێدا کە هەرگیز جوینی وام لەوگوێ لێ نەبوو، ئینجا وتی؛ دەڵێم پیغەمبەر وای وتوە، دەڵێیت بەخوا قەدەغەیان دەکەین، بەوخوایە لەوەو بەدواوە قەت قسەت لەگەڵ ناکەم... بەو جۆرە مایەوە هەتا کۆچی دوایی کرد.

شێخ محەمەدی غەزالی پێی وایە کە دەستەواژەی (( والله لنمنعهن)) گوزارش دەکات لە تیروانینیک و ئاڕاستەیەک هەر لە سەردەمی یەکەمی

ئیسلامەوە بەدیار کەوت، ئەو تێڕوانینەی کەسڵ ناکاتەوە لەڕەت کردنەوەی فەرمایشتی خودی پیغەمبەریش، بەشێوەیەکی راستەوخۆ هەروەک بەدی دەکەین لەو فەرمودەیەی سەرەوە، یان بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ لەڕێگای تەئویلات و لێکدانەوەی چەوت، یان لەڕێی پەسەندکردنیی فەرمودە و دەق گەلێکی لاواز بەسەر فەرمودەو دەقی راست ترو پەسەندتردا. بەبیانوی فەسادی زەمان و قسەی گشتی بێ بنەمای وەک ئەو.

غەزالی ئەو هەڵگەرانەوە و پاشگەزبوونەوەیە لە دژی ئافرەتان بە تاوان و خیانەتێک دەانێت کە دەرهەق بە سەرەتاکانی ئیسلام کراوە، بۆیە سزایەکی قورسی خوای گەورەی بەدوادهات، لەوبارەیەوە دەفەرمویت: ((ویستی خوای گەورە وابوو کە موسلمانان تێکرا باجی ئەو خیانەت و ناپاکییە بدەن، کە دەرهەق بەئیسلامیان کرد، هەربۆیە خاک و هۆش و بیریان داگیر کرا، بەو جۆرە پاش ئەوەی پیشەنگی هیدایەت و جیهانی یەکەم بوون، بوون بە کاروانێکی پاشکۆ بەدوای کەسانیتر، یان بوون بە جیهانی سێیەمی شوێن کەوتە))[٥٣].

کەوا بوو موسلمانان پشتیان لە ریوایەتی باوکە سەحابیە زاناکە کرد، شوێنی ڕای کوڕە لاسارو نەزانەکەی کەوتنة وەك غەزالی دەفەرموێت.

سەیر لەوەدایە کەسانێکی وەك دڵشاد کەلاری و هاوشێوەکانی بەوپەڕی بەرتەسکی مامەڵە لەگەڵ ئافرەت دەکەن، دەنگیان عەورەیە، واتە لەبەردەم پیاوان نقەیان نێت، نابێت گفتوگۆ بکەن نەوەکو دەنگیان غەریزە برسیەکان بجوڵێنێ، نابێت بچنە ئۆرگانە باڵاکانی حزب، نابێت بچنە سەر تەلەفزیۆن، نابێیت کۆڕ ببەستن نەوەك بە تیری نەزەر هەراسان بکرێن و گوناهبار بن، نابێت و نابێت و نابێت..تادوا لیستی قەدەغەکراوەکان لە ئافرەت، کەچی لەولاوە کەسێکی سەر بە قوتابخانەی ((والله لنمنعهن)) پێی سەیرە " ئەو ڕێکخراوی خوشکانە کە خۆی سورکردۆتەوە بۆ قسەکانی حاجی دڵشاد" یان

---

(٥٣)محمد الغزالي ، الحق المر، دار الشروق.

"حزبێک ئەوەنە خۆی بچوک بکاتەوە بۆ لێدوانێکی شەخسی حاجی دڵشاد، چەندین ئەندامی مەکتەبی سیاسی بێنە سەرخەت و بڵێن ئەوە سیاسەتی ئێمە نیە "، ئەو برادەرە وادەزانێ قسەو سوکایەتی بە سەنەمێك کراوە، نەك بە نیوەی مرۆڤایەتی، ئەو کەسە ئافرەت هێندە کەمە لای، پێی سەیرە چۆن حزبێکی وا مەزن خۆی بۆ ئەو ئافرەتە زەعیفانە بچوک دەکاتەوە.

ئەو پێی "کارەساتە ڕێکخراوێکی ژنانەی بن دەستی ئەو حزبە دژ بە ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی بە یناننامە دەربکات، داوای لێبکەن داوای لێبوردن بکات، چونکە سەردەمی ئەو بۆچوونانە نەماوە" بڕوانە گوزارشی [ڕێکخراوێکی ژنانەی بن دەستی ئەو حزبە] چۆن سوکایەتیەکە بەو ئافرەتانە، مافی ئەوەشیان پێ نادا رەخنە لە دوڕ و گەوهەرەکانی دڵشاد کەلاری بگرن و داوای لێبکەن داوای لێبوردن بکات. وەك چۆن خەڵکی نەزان پێی کوفرە داوای لێبوردن لە منداڵێك بکات، ئافرەت و منداڵ دوو تای تەرازووی ئەو عەقڵێەتە سەقەتانەن، لە زۆر بۆنەش بەیەکەوە ناویان دەهێنن، دیارە دڵشاد کەلاری هێندە موقەدەسە بۆ ئافرەتی زەعیفە نییە داوای لێبوردنی و پەشیمان بونەوەی لێ بکات.

لە کاتێکدا توندڕەوانی قوتابخانەی ((والله لنمنعهن)) بە هەموو جۆرێك کەسایەتی ئافرەتان دەشکێنن و دەیپوکێننەوەو بەترساندن و تۆقاندنی ئاگری جەهەنەم ژیانیان لێ تاڵ دەکەن، وەك بەندەو کەنیزەك پەروەردەیان دەکەن، دەیانەوێت وەك مرۆڤێکی ئازادو ئاسایی و زیرەك و چالاکیش دەربچێت، لەکاتێکدا خەڵکان ژنانی خۆیان دەنێرنە بۆشایی ئاسمانەوە، کەچی ئەوان ڕێگای مزگەوتیشیان لێ دەبڕن، کاتێکیش ئەو ئافرەتانە لەئەنجامی ئەو پەروەردە سەقەتە کەسانێکی ناچالاک و نێگەتیڤ و بێ زمانی لێ دەردەچێت، کاکی بەدیهێنەری ئەو هەموو کارەساتانە دیسان ئافرەتان تاوانبار دەکات:

"کە کەسێکیان نیە کەمێک خوێنەوار بێت و قسەکانی ڕوی دواندن و سەر شاشەی هەبێت، ئەوەی لە دەزگایەکی ڕاگەیاندنی کۆمەڵدا کارنەکات نازانێت چەندە میحنەتی بەدەست نەبوونی ژنێکی خوێنەواری ناو ڕێکخراوی

خوشکانەوە هەیە کە بێت و لەسەر پرسێکی سیاسی یان کۆمەلایەتی قسەیەکی خوێنەوارانە بکات" لە خۆی ناپرسێت بۆ لە حزب و لایەنەکانیتر ئافرەتی زۆر بلیمەت و وشیار هەیە، رەخنە لەوان دەگرێت، سەبارەت بەکردەی دەستی خۆیان.

لەسەری دەڕوات:"ئەوە خۆتانن کە ئافرەتتان پێ کەمەو متمانەتان بەخۆتان نیە ، دڵنیاتان دەکەمەوە، ئەگەر لە کۆنگرەشدا بە تەعینات نەبێت تەنها یەک ئافرەت ناچێتە سەرکردایەتی خۆ ئەوە گرفتی سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی نیە بەڵکو کێشەکە نەبون و نەخوێنەواری و بێ ڕۆڵی خۆتانە خوشکانی بەڕێز .... "

یان دەڵێت:"ئەگەر ئەوان پێیانوایە کە زۆر بە توانا و لێهاتوون و شان بەشانی برایانیان کار و چالاکیان هەیە ، ئەی بۆ لە هەڵبژاردنەکاندا کەسێکیان نەیانتوانی چەند هەزار دەنگێک بە دەست بێنن و لەناو خۆشیاندا متمانەیان بە یەکتر نیە و دەنگیان داوە بە کاندیدێکی پیاوان بۆ ئەو پۆستە".

کاتێ پیاوانیان لێ دەکەن بە سوپەرمان، لەبەرامبەردا ژن دەشکێنن بەدەیەها دەقی ئاینی زۆر و بۆرو زەعیف و سەقیم کەلەپچەیان دەکەن و دەیانبەستنەوە، کەچی چاوەروانیان لێ دەکەن چالاك بن، متمانەیان بەخۆشیان بێت، خوێندەوارو زیرەکیش بن. کاتێ ڕۆڵی دەکوژێننەوە لە ژیاندا تەنها کاری بەرهەمهێنانی منداڵ و پیشکەش کردنی خواردن و موتعەی جینسی بێت، هیچ کارێك ناکەیت بۆ سوك کردنی باری و خۆ پێگەیاندنی لە ڕووی دەروونی و عەقڵیەوە، هەر تۆش دێیت تاوانباریان دەکەیت، کە کێشەکە ڕۆڵی ئێوە نییە لە پەڕاوێز خستنیان و دەبەنگاندنیان، بەڵکو پێت وایە:"کێشەکە نەبوون و نەخوێنەواری و بێ ڕۆڵێ خۆتانە خوشکانی بەڕێز .... "!! راست دەکەیت ژنێك بە مواسەفاتی ئێوە "بوونی لە پۆستێکی سەرکردایەتی بۆ ژن لەناو کۆمەڵی ئیسلامییدا چی مانایەکی هەیە کە شیاوی نەبێت..." واللە هیچ، ژنێك چیە لە لای ئێوە تا پیاوانی گەورەو بەرزی وەك ئێوە دەنگیان پێ بدەن، بۆیە دەنگ ناهێنن، ئێوە دەستە

خوشکەکانیشتان ڕاڕا کردوە لەسەر گرنگی پایەی خودی خۆی خستوتانە مێشکیانەوە، کە کاریان تەنها منداڵ بەخێو کردن و چێشت لێنان و سەرجێیە، کەوابوو ئەو ئافرەتە چۆن دەنگ بە هاوڕەگەزەکەی خۆی دەدات.

ئەو قسانەی دلشاد کەلاری و کەسانێکی عەریزە نووسی بەناو نووسەری وا شایەنی ئەوەیە دادگای بۆ بگێریت، نەک دڵە ئەستورەکانیان هێندە ناسك بێت، بەرگەی ڕەخنەیەکی دۆستانەی خوشکانی خۆیان نەگرێت، ئەو ڕەخنەیەی کە زیاتر لە لۆمە کردنەوە نزیکە نەك لە ڕەخنەیەکی جیدی و مەنهەجی، چونکە ئەو هەڵوێستەی دڵشاد و هاو هەڵوێستەکانی پێویستی بەزۆرتر هەیە، لەوەی لە بڵاوکراوەکەی خوشکاندا هاتوە، هەر بەو بۆنەیەوەش دەستخۆشی لە خوشکانی کۆمەڵ دەکەم بۆ ڕێچکەشکاندنیان و کۆتایی هێنان بە سەردەمی بێ دەنگی بەرامبەر بەو سوکایەتیەی کە دەرهەقیان دەکرێت، هەروەها دەستخۆشی لە د.ڕیواس دەکەم بۆ وەڵامە جوان و ناوەرۆکدارەی. پێویستە دەستخۆشی لە سەرکردایەتی کۆمەڵیش بکەین بۆ ڕەتکردنەوەی لێدوانەکانی کەلاری. وەڵامەکانی ئافرەتان سەلماندیان هیچیتر توندڕەوان ناتوانن بە کەیف و هەوەسی خۆیان هەر چیەك بڵێن بیڵێن دەربارەی ئافرەتان، نیوەی بەڕێز و شکۆمەندی مرۆڤایەتی.

# کەناڵی سپێدە و پەتای داعشیەت

## یەکگرتوو کەوتۆتە ژێر کاریگەری سەلەفیەکان(٥٤)

لە سەرچاوەیەکی ناو یەکگرتووی ئیسلامیەوە پێم گەیشتووە کە پاش فشارێکی لەفزی و دەروونی سەلەفیانەی زۆری بەرپرسانی یەکگرتوو و بەڕیوەبەرانی کەناڵی سپێدە، خانمە بێژەری ناودارو سەرکەوتوو (ڤیان محمود)یان ناچار بە دەست لەکار کێشانەوە کردوە، گوایە تەنها لەبەر ئەوەی ئەو خانمە ڕوخساری جوانەوگوناهە لەسەر تەلەفزیۆن بێت، ئەو سەرچاوەیە گووتی؛ (محمد فەرەج)ـی سکرتێری یەکگرتوو، کەوتۆتە ژێر فشاری عەقڵیەت سەلەفیەکانی "ئەو دەڵێت داعشیەکانی" ناو بەرپرسانی یەکگرتوو، کە ئەوانیش کەوتوونەتە ژێر فشاری دینداره سەلەفی مەشرەبەکان، کە لایان ژن نابێت بە پەچەو نیقابیشەوە لەسەر تەلەفزیۆن بێت.

کەناڵێکی میسری سەلەفی هەبوو ئافرەتەکان ڕەش ڕەش دەردەکەوتن هەتا دەموچاویشیان دادەپۆشی، بەڵام لەبەر ئەوەی ژن دەنگی عەورەیە، ناوەڵڵا هەر خۆی هەمووی عەورەیە، سەدان ڕەخنەیان بۆ هات سەبارەت بەو شتە ڕەشانەی سەر شاشە، کەناڵێک ناودارترین واعیزی مەلا شێرزاد بێت، لەنێو بەرنامە پێشکەشکارەکان لە سەری مەجلیسی ڕەسمی دابنێن، مەلا شێرزادێك بە تێڕوانینە شەعبی و بازاڕی، کە زۆربەی زانیاریەکانی لە سایتە سواوە سەلەفیەکان دەردەهێنێت، خەلك ئاڕاستە دەکات بۆ ئیسلامیکی داخراوی وەک ئەو ژنە مونەقەبەی لە ڕوسیا پاسپۆرتی بەبێ وێنە دەرکرد بە زەبری دوعاو شەونوێژان، دەبێت یەکگرتوو چ پڕۆژەیەکی کرانەوەی هەبێت بە پێچەوانەی ئەو هەموو توندرەوییەی وڵاتی داپۆشیوە.

هەر سەبارەت بەو کێشەیە ئەو وشانەم نووسی وامزانی کەسیك گوێی لێدەگرێت، بەڵام دیارە پەتای داعشیەت لە یەکگرتوو و محمد فەرەج و

---

(٥٤) میللەت پرێس ، ٢٠١٥/٠٢/٠١.

هەندێك لە قیاداتی یەکگرتووی داوە، گوێ بەس لە توندرەوان دەگرن، ئەوە ئەو بەشە وتارەیە کە ئەوکاتە نووسیم، هێشتا سەڵاحیەت پێنج ساڵیتری یەکگرتووی ماوە:"بێ هەڵوێستی حزبە ئیسلامیە میانڕەوەکان داعشیەت دروست دەکات، کە میانڕەو دامەزراو نەبوو ، تەژی بوو لە حزبایەتی و دەمارگیری دەستەگەری، بەڵگەی مەنهەجی میانرەوی پێ نەبوو، فێری توێژینەوەی زانستی نەکرا لە پوچەڵکردنەوەی بنەماکانی فکری توندڕەوی، زۆر ئاسانە لە نێوان شەو و ڕۆژێکدا ببێتە توندڕەوێکی تۆبەکار لە میانڕەوی.

داعشیەت بە لەرزەلەرزی ئیخوان و بەناو وەسەتیەکان دروست دەبێت، کاتێك شەو و ڕۆژ باس باسی میانڕەویی دەکەن، بێ ئەوەی چالاکیەکی کاریگەریان هەبێت بۆ پوچەڵکردنەوەی بنەماکانی سەلەفیەت، بێ ئەوەی بنەمای شەرعی هەقیقی دانابێت بۆ میانرەوی، نەك هێندە بەڵکو زۆرجار ژمارەیەکی زۆری ئەو وەسەتیانە لە ژێر کاریگەری مەنهەجی سەلەفیەتدان، و زۆرجار پێت جیا ناکرێنەوە.

نیوەی ئیخوانی عەرەب سەلەفین، لە کوردستانیش سەرەڕای ئەو ئازادیەی هەیانبوو بۆ لیکۆڵینەوە و دامەزراندنی بنەماکانی میانڕەوی، کەرتـێکی گەورەیان لە ژێر هەڕیشەو کاردانەوەی سەلەفیەکان هەنگاو بەرەو سەلەفیەت دەنێن، ئەوە نەبوو پاش ئەوەی دلشاد کەلاری دژی دەرکەوتنی ئافرەت بوو لە تەلەفزیۆن، زۆری نەبرد کەسانێکی پلەدار لەناو یەکگرتووش دۆڕاندنیان لە هەڵبژاردن گەڕاندەوە بۆ بوونی ئافرەت لەسەر تەلەفزیۆنەکەیاندا.

وەك ڕۆژنامەنووسێکی ناوداری یەکگرتوو کاك محمود یاسین لەپۆستێکدا، نووسیبووی:"لە چوارچێوەی ئیصلاحاتی فیکری و سیاسی و کرانەوە و تەجدید بە بیانووی دەنگ کەم کردن، چەند کەسێکی دەسترۆیشتووی بریاریانداوە لە ئایندەیەکی نزیك یان دوور (بێژەری خوشك) لە سەر شاشە قەدەغە بکەن، فەشەلی قیادەکردنی خۆیان دەخەنە سەر (رەگەزی مێ) و دەستی چەوری خۆیان بە لەچکی ئافرەتان دەسڕن".

دیارە یەکگرتوو لاسایی دڵشاد کەلاری سەلەفی دەکردەوە، کە ئەویش پێش ئەوان وتی حەڕامە کچی بێژەر لەسەر تەلەفزیۆنی کۆمەڵ بێت، لەجیاتی دانیشن و توێژینەوەیەکی وورد و زانستی هۆکاری فەشەلیان بکەن، ختووکەی هەستی دینداری سەلەفی دەکەن، ژن دەکەنە هۆکار وەك لاوازترین ئەڵقەی کۆمەڵی دواکەوتوو.

ئەوەش لە ترسی قسەی سەلەفیەکان کە دەڵێن یەکگرتوو کەوتوەتە ژێر کاریگەری هێزە عەلمانییەکان و خەریکە وەك ئەوانی لێدێت، بۆیە یەکگرتوەکان لەبەر غیابی وەعی و هۆشیاری میانڕەوی جگە لە دروشم و ئیدیعادا، بەئاسانی کەوتونەتە ژێر کاریگەری ئەو وتارە غەیبیە و غەبیەی سەلەفیەکان، داوا دەکەن یەکگرتووش بەرەو داخراوی ببەن تا خەڵك لێیان ڕازی بێت".

## فرەژنی مۆدەی گەندەڵ و ئیسلامیەکان[٥٥]

بۆ ئەوانەی کەڵکەڵەی فرەژنیان هەیە، یان هەر ژنیان کەمێک کاریگەری زەمەنی کەوتە سەر روخساری بیر لە هێنانی ژنێکی تر دەکەنەوە، وەک بڵێیت سەیارە بگوڕن، بەتایبەتی نێوەندی ئیسلامی ئەوەی دەگریت کەمێک خەڵک پێی سەرسام دەبن، دووسێ خوتبەی حەماسی، یەک دوو شەڕی دۆنکیشۆتی دەکەن، یەکسەر دەکەونە چاوگێڕان بۆ مثنی و ثلاث و رباع، لە کۆمێنتێکدا زۆر سەیرم پێهات بەڕێزێک لەسەر د.عبدالواحدی بانگخواز نوسیبووی:" دەستخۆش ....، کەس وەک من ئەم دکتۆرەو براکەی د.خالید کە ئەویش هەمان بانگخوازی ئیسلامیە نا ناسێت. ئەمانە هێندە جاهیلن، کێبەرکێیانە لەگەڵ یەکتریدا، کە کامیان زۆرترین ژن بهێنێت، ئەم دکتۆرە ئیسلامیە، ئێستا ٤ ژنی هەیەو براکەشی کردویەتی بە ٢ دوانو هەڕەشەی ئەوە دەکات کە پێش کاکی واتا عەبدول واحید بکەوێت". بەڕاستی لەوە ئاسانتر نییە، بۆ کەسێک کە کەمێک ناوبانگی دەرکرد، لە ناو ئەو جەماوەرە دینیە سادەیە، دوو و سێ و چوار ژن بهێنێت. نەک ئەوە زۆرجاران پاش دەماغشۆری ژنەکانی تری، خۆیان بۆی دەچنە داخوازی ژنی دووەم و سێیەم وچوارەم، لەوەش ئاسانتر نیە ژنێکی بەستەزمانی نیمچە خوێندەواری سەرسامبوو پێت دەماغشۆر کەیت، بەڵام ئەوە هونەر نیە، هونەر ئەوەیە ئەو ژنە هاندەیت لە ڕووی دەروونی و کەسایەتیەوە ئیرتیقا کات و بەرزبێتەوە، نەک نزمی کەیتەوە بۆ ئاستی بوون بە پاسەوانی ئارەزووەکانت بە زەبری هەڕەشەی ئایەت و حەدیسەکان.

هونەر ئەوەیە وەک چۆن ژنت بەتۆ ڕازیەو بیر لە کەسێکی جوانترو گەنجتر ناکاتەوە، تۆش بە هەمان شێوە ڕێزی هەست و وەفای ئەو بگریت، بیر لە کچێکی جوانترو بچوکتر نەکەیتەوە، تا ئەو هیچ نەنگیەکی نەبێت و بێ کەم و کورتی بێت، خۆشی بوێیت.

کە دەڵێم کەموکورتی، مەبەستم ئەوەیە بۆ نمونە منداڵی نەبێت، ئەگەر پێتکرا لەو حاڵەتەش بەشیوەیەکی پڕ وەفاو تقدیر رەفتاری لەگەڵ بکەیت،

---

(٥٥) پێنوسەکان و ستاندارد ، ٢٦ کانونی یەکەم ٢٠١٣ .

یان تووشی نەخۆشیەکی وا بوو هیچ ئەرکێکی مرۆیی پێ جێبەجێ نەکرا، ئەگەر نەخۆشیەکەی چاوەڕوانی مردنێکی نزیک خایەنی لێدەکرا، نابێت لە ژیانی ئەودا بەبەرچاوی ئەو ژنێکی تر بهێنیت، تانەیەکی کوشندەی لێدەیت، بەرلە چونە ناو قەبرەوە. ئەگەر نەخۆشیەکەش درێژ خایەن بوو، دەتوانی پاش تەمهیدێکی جوان و پڕ سۆز ئەو بابەتەی لا بوروژێنیت. من کە ژیانی فرەژنی پێغەمبەران دەخوێنمەوەو لەنێو ئەوانەش پێغەمبەری ئیسلام [د.خ]، دەبینم بەردەوام لە کێشەی هەوێیەکاندا خەریکی چارەسەرکردنی کێشەکانیان بوو، بەڕاستی سەیریشم بەوە دێت چۆن دەعوەی ئیسلامی ناجیح بوو سەرەڕای ئەو هەموو ژنەی پێغەمبەر، چۆن ئەو کێشانەی غیرەو لەیەکتر خوێندن و مونافەسەیە سێ چارەگی کاتی نەکوشت، ئەوە حاڵی پێغەمبەر بوو، بەو هەموو تایبەتمەندیە کەسایەتیەی کە هەیبوو وەک پێغەمبەرو مرۆڤ، ئەی دەبێت حاڵی ئەو بانگخوازو ڕۆشنیرە ئیسلامیانە چۆن بێت بەدەستی کێشەکانی فرە ژنییەوە. ئینجا ئەگەر فرەژنی بۆ کات و ژینگەی مێژوویی خۆی ئاسایی بوو، ئەوە بێگومان بە هیچ جۆرێک لەگەڵ ئیقاعی ئەو سەردەمە ناگونجێت، زۆرجار ئەو حاڵەتەی فرەژنیە دەبێتە هۆی بچوککردنەوەی ئافرەتەکان، لەجیاتی خەریک کردنیان بە بایەخە بەرزەکان و ئامانجە گەورەکان، هەرخەریکی داونانەوە دەبن بۆ یەکتر، پیلان دانان دەبێتە کاری ڕۆژانەیان، دەیان دەسیسەو ئاین و ئۆنی تر.

فرەژنی هەر نابێتە هۆی بچوک کردنەوەی ژنەکان، بەڵکو دەبێتە هۆی بچوک کردنەوەی پیاوەکانیش، کە هێرو گێژ دەبێت بە دەست ئەو زنجیرە پیلان و داونانەوەو بوهتان هەڵبەستن بۆ یەکتر، تا کۆتایی ئاین وئۆینەکان.

پێشان هەر نیمچە خێڵەکی و فول عەشایەریەکان خەریکی ئەو بەزمەی فرەژنیە بوون، لە هەشتاکان ببوە بەزمی سەرەک جاش و موستەشارەکان، ئەمڕۆ بەداخەوە فرەژنی بۆتە بەزمی مەسولە گەندەڵەکان و ئیسلامیە نیمچە بوژاوەکان لە گەندەڵیدا، بەڵکو رۆشنبیرەکانش تێی ئاڵاون، کاتێ بە قسە بریقەدارەکانیان کچانی هەرزەکارو بێ ئەزموون دەخەنە داویان.

## هێرشی تێزاب acid attack گەیشتە کوردستانیش[٥٦]

ئەو تێزاب بە ڕوخساری ئافرەت کردنە نەریتێکی قیزەونی جیهانی دواکەوتوی سێیەمە بە پلە یەك و لە جیهانی پێشکەوتووش جاروبار ڕودەدات. دیارترین وڵات کە گەورەترین ڕێژەی ئەو تاوانەی لی ڕوودەدات بەنگلادیشە و دوایی هیندستان و نیپال و کەمبۆدیا و لاوس و چین ومیسر و سودان و پاکستان و هیند وئەفغانستان و چەندین وڵاتی ئەفریقیا رەشە .هەرچەندە لە زۆر وڵاتی تریش ڕوویداوە، بەداخەوە ئەو دیاردە بۆگەنە نامرۆییە بگاتە کوردستان، لە ٢٠١٤/١٠/٣٠ لە شاری سلێمانی ئافرەتێك تێزابی بە ڕوخساردا کراوە.

کەسانێکی نەفس نزم هەن کە بەخۆیان دەڵێن پیاو، کە بەڕای من دەکرێت نێر بن، دەنا پیاو نین، چونکە هەموو پیاوێک نێرە، بەڵام هەموو نێرێک پیاو نیە، ئەو ناپیاوانە کاتێ ئافرەتێك ڕەتیان دەکەنەوە وەك خۆشەویستێك یان هاوسەرێك، لە تۆڵەی ئەو هەستە درندانەیەو جانەوەر ئاسایە، ژیانی ئافرەتەکە لەناودەبات و رووی جوانی ئافرەتەکە بە تێزاب دەسوتێنێت، تا هەتایی ژیانی لێ تێك دەدات و ڕوخساری دەشێوێنێت، هەتا لە ژیانی هاوسەریشی مەحروم دەکات.

فیلمێکی دۆکیومانتەریم دیت لەسەر ئەو ئافرەتانەی کە تێزاب سوتاندوونی، هەموویان ڕۆژانە ئاوات بە مردن دەخوازن، بەدیار وێنەی ڕوخساری پێش سوتانیان دادەنیشن و دەگرین. کەوابو مەرگێکی سەردنیا بەدەستی ئەو جانەوەرە نا پیاوانە بۆ ئافرەتان دیزاین دەکرێت، بۆیە پێویستە پەرلەمانی کوردستان و هەموو جیهانیش سزای کوشتن بۆ ئەو درندانە ببڕنەوە لە چوارچێوەی یاسایەك، دەنا پێشی پێ ناگیرێت، بۆی هەیە نەتەوە بێ ئاگاو لاسایکەرەوەکەمان بۆ کاری خراپ، هەزاران ئافرەت بەو دەردە ببەن. ئەو ئافرەتەی دوچاری ئەو هێرشە نامرۆییە دەبنەوە تامردن دەناڵێن

---

(٥٦) ئیسلام پەیك ٢٠١٤/٠٩/٣٠.

بەدەست ئازاری جەستە و لە دەستدانی هەلی ژیان و هەتا هەلی کاریش، چونکە زۆرجار شێوەیان هێندە ترسناکی لێدەردەچێت، دوچاری کاردانەوەی ڕەتکردنەوەی کۆمەڵگاش دەبنەوە، بۆیە بەڕای من لە سزای مەرگ کەمتر نەبرێتەوە بۆ بکەری ئەو کارە نامەرد و نا مرۆییە[٥٧].

(٥٧) http://knnc.net/Drejey-hawal.aspx?id=٣٣٩٠٧&LinkID=٤&video=False&leguaid#.VCqa٨xaKVnB

# نا بۆ بە سعودی کردنی ئافرەتانمان[٥٨]

یەکێك لە ماڵپەڕە سەلەفیەکان تەرخان کراوە بۆ بانگەشەکردن بۆ نیقاب بەستنی ئافرەتی کورد بەناوی: بەڵێ بۆ نیقاب لەکوردستان، دەیانەوێت وەك کۆمەڵگا سعودی ویخەلیجیەکان ژنان و کچانی کورد دەیان هەنگاو وەك میزی حوشتر بۆ دواوە بگەڕێنەوە، ئەوەش لە نێو موفرەداتی ئەو پڕۆژە نەگریسەی سەلەفیەکانە بۆ بە سعودی کردنی کۆمەڵگای کوردی.

بەهێزترین خاڵی ئەو پرۆژەیە، ئەو هەموو ماستاچیاتیەو خۆهەرزانفرۆشییەیە بۆ دەسەڵاتداران لە هەر شوێنێك بن. زۆر بە جیدی دیفاع لە دەسەڵتداران دەکەن و دەیان تۆقێنن بە چەندین دەق و فەهمی سەقەت، کە نابێت هیچ رەخنەیەکت هەبێت لە دەسەڵاتداران، حزبایەتی جائیز نیە، خۆپیشاندان جائیز نیە، گردبوونەوە جائیز نیە واعتصام جائیز نیە. ئەی دەسەڵاتداری گەندەڵ چی دەوێت زیاتر لەو کۆمەڵگا ملکەچ و گوێلەمستەی وەك کۆمەڵگای سعودی. من گومانم نیە کە هەموو دەسەڵاتدارانی دنیا هەتا بە ناموسڵمانەکانیشەوە هیوای کۆمەڵگایەکی سەلەفی مەدخەلی مەشرەب دەخوازن، لە پێناو مانەوەیان و حوکمکردن بەوپەڕی ئاسودەیی.

لەو پەیجەی کە بۆ بانگەشەی نیقابکردنی ئافرەتی کورد کراوە، دەیانەوێت بە بیری چڵکاوخۆریان ئافرەتی کورد تەنازول بکات لەو کەمە مافەی کە وەریگرتوەو بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پەچە و عەباو نیقاب، وەک ئافرەتە بەستەزمانەکانی سعودیە بۆیان نەبێت بەبێ پیاو هەتا موراجەعەی فەرمانگ حکومیەکانیش بکەن، بۆیان نەبێت ئۆتۆمبیل لێخوڕن، بۆیان نەبێت ئەگەر هەزار ستەمیانیش لێکرا دەنگیان هەڵبڕن، چونکە دەنگی ئافرەت عەورەیە، بۆیان نەبێت بەبێ موافقەی مێردو باوك و برایان، ئەگەر بچوکتریش بێت سەفەر بکەن یان هەرکارێکی تر. دەیانەوێت وەك ژنە

---

(٥٨) ستاندەر ، ٢٠١٤-١٢-٢٨.

سعودیە قەڵەو پڕ نەخۆشیەکانی سعودیە لەماڵەوە زیندانی بن. هەموو ئاوات و خەونیان بە گەڕانەوەی مێرد و منداڵەکانیان بێت. دەیانەوێت بەناوی غیرەت و پاراستنی شەڕەف و چەندین قسەی بێماناتر کۆتێکی زێڕینی لە دەست و پێی ئافرەتمان کەن. پەچەیەکی ڕەش و عەبایەکی ڕەش و نیقابێکی قەترانی بخەنە سەر ڕوخساری ئافرەتمان کە بە نوێژی نیوەڕۆ جیهانیان بۆ بەڕەش نیشاندا.

سەیرم بەو عەقڵیەتە گاڵتەجاریە دێت، لەکاتێکدا لەنێو سەلەفیەکان و زانایانیشیان نیقاب جێگەی ئیختیلافە، هەتا الالباني وەك یەکێك لە زانایایە هەرە توندەکانیان کتێبێکی نوسیوە بە ناونیشانی: الرد المفحم، على من خالف العلماء و تشدد و تعصب، و ألزم المرأة بستر وجهها و كفيها وأوجب، و لم يقتنع بقولهم: إنه سنة و مستحب. واتە: [وەڵامی دەمکوتکەر بۆ ئەونەی پێچەوانەی زانایان دەکەن وتوندرەوی و دەمارگرژی دەکات، ئافرەت پابەند دەکات بە داپۆشینی دەموچاوی و هەردوو دەستی و بە واجیبی دەزانێت، قەناعەتی بە قسەی زانایان نیە، کەوا سونەیە و موستەحەبە] ئەو کتێبە هەر ناونیشانەکەی ئینشایەکە بۆ خۆی، لە لەبارترین حاڵەتدا ئەلبانی دەڵێت سونەو موستەحەبەو بە هیچ جۆرێك واجیب نیە، باوەڕبکەن ئەو کتێبەی ئەلبانی لە زۆر لە سایتە زۆرو بۆرەکانی سەلەفیەت دەست ناکەوێت، چونکە من خۆم گوێم لە ڕەخنەی سەلەفیان بووە لەسەر ئەو کتێبەی ئەلبانی. ئەوە باسی بیروڕای زانانی دەرەوەی بازنەی سەلەفیەت هەر ناکەین کە زۆربەی هەر زۆریان پێیان سونەت و موستەحەبیش نیە، نەك واجیب. بۆیە پێویستە لەسەر خەمخۆرانی ئیسلامی میانڕەو ئەوانەی نایانەوێت مەملەکەتێکی سعودی بەدەوی دواکەوتوو و پیس و پەڵۆس، لە ڕووی فیکری و ڕوحیەوە ببینن لە کوردستان، گەنج و ئافرەتمان توشی داوی ئەو رەجعیەتە مەزهەبی نەکەن، پێویستە چالاکیەکی رۆشنفکری ووریاکردنەوەیەکی ئایینی میانڕەو هەبێت لە بەرامبەر ئەو هەوڵە نەبراوانەی بە سعودی کردنی کۆمەڵگای کوردی.

# هەولێر و دیـنداری[٥٩]

## مەلا سوسەیی وەک نـمونە

هەولێرو دینداری دوانەیەکی سیامین لێک جودابونەوەیان ئەستەمە، لەبەر ئەو رۆڵە مێژوویيەی هەولێر یاریکردوە لە دین پەروەریدا، بێگومان ئەو ئەدگارەشە زیاتر هەولێری جوانترو میهرەبانترو رێزدارتر کردوە لە سەرتاسەری کوردستاندا، ئەو شارەی وەک ئەشکەوتەکەی هەزارو یەک شەوە لێکردوە ئەوەی بێتە ناوی تیایدا ون دەبێت و دەبێتە خەڵـکی شارەکە. بەڵام زۆر بەداخەوە ئەو سروشتە دیندارەی هەولێر لەلایەن هەندێ مەلا زۆر بەخراپی ئیستغلال کراوە، دێن و دەیانەوێت هەموو بیرورا توندو خورافات و شازەکانی خۆیان بەسەر ئەو شارە بسەپێنن، برەوشیان بەزۆر بیروڕای توندو شاز بدەن، خەڵکیش لەبەر متمانەیان بە مەلا و دینداران بێ دڵ لە دڵدان لێیان وەردەگرن، هەر ئەوەش بەداخەوە وایکردوە ئەمرۆ جلەوی سیاسەتکردن و ئۆپۆزسیۆن بوون بکەوێتە دەستی چەند مەلایەک لە هەولێر، کە وانیشانی خەڵک دەدەن کە چینی ئینتیلجنسیای هەولێر کەسی تێدا نییە لە مەلا بەولاوە.

گومانی تێدا نییە کە مامۆستایانی هەولێر رۆلێکی خێرخوازی چاک دەبینن لە بەرگرتن لە گەندەڵی و پاراستنی بەها بەرزەکانی کۆمەڵی کوردەواری، بەڵام بەداخەوە ئەو مەلایانەشی کە وتاریان هێشتا لە ئاستی گەشەکردنی کۆمەلگاکە نین ژمارەیان کەم نییە.

دوای دەستگیرکردنی (مەلا ئیسماعیل سوسەیی)، کەمن لێرەدا تا سەر ئێسقان دژی دەستگیر کردنیم، بەڵام تا سەر ئێسقانیش دژی لێدوانەکانی بووم، لە وتارێکدا زۆر بە توندی بەرەنگاری هەردوو حزبەکەی دەسەڵات و پەرلەمان و خودی سەرۆک دەبێتەوە، گوایە لەسەر دین و شەرەف و ناموس بە شێوازێکی زۆر عاتیفیانە دەیەوێت وا نیشانی خەڵک بدات یاسای ژمارە

(٥٩) ٢٠١١/٨/٣٠کوردستان پۆست

٨ـی ساڵی ٢٠١١ بەناوی (یاسای بەرەنگاربوونەوەی خێزان لە توندو تیژی لە هەرێمی کوردستان)، دژە شەرەف و ناموس و دینەو هەتا یاساکانی بەشێوەیەکی تەمسیلی عەنتیکە نیشانی خەڵکی دەدا، نموونە هێنانەوەکانیشی هەموی لە دژی رەگەزی مێینە بوو، ئەو شێوازەش خۆی لەخۆیدا هاندانی خەڵکێکی سادەو ساویلکەی مزگەوتەکان بوو بۆ زیاتر بەکارهێنانی توندو تیژی لەگەڵ رەگەزی مێینە، بۆ نمونە دەیگوت ئەگەر کچەکەم سبەینێ لە پێش چاومان تەلەفۆنی عاشقایەتی کرد دەبێ هیچی لێنەکەم و لە حەیفان یان ئینتیحار کەم یان...یان ئەوەندە بەگەرمی دژی قەدەغە کردنی خەتەنەی مێینە بوو دەتگوت دیفاع لە ئایەتێکی ڕاشکاوی قورئان دەکات، لە هەمووشیان کارەساتتر بەرگری لە لێدانی ژن دەکرد، بەشێوەیەک هەتا زانا و موفەسیرانی بەراییش زاتی ئەوەیان نەکردوە.

لەڕاستیدا دەتوانین بڵێین ئەگەر پەرلەمانی کوردستان لە نێو هەموو کارەکانیدا بە چاک و خەراپییەوە چاکترین کارێک کردبێتی ئەوە یاسای ژمارە ٨ کە ئەگەر نیوەشی بێتە جێبەجێ کردن زۆر لەو کێشە کۆمەلایەتیانەی کە هەن چارەسەر دەبن. کێشەی وەک کوشتنی منداڵێکی وەک ئەیوبی پێنج بەهارە یان کێشەی ئەو کچە بێتاوانەی کە بەناوی شیرین چیرۆکی دڵتەزێنی خۆی لە سایتەکاندا بۆ گێرایەنەوە، یان رووداوی ئەو گەنجەی سلێمانی کە باوک و دایک و خوشکی خۆی کوشت، گرفتی مەلا سوسەیی و ئەمسالی ئەو ئەوەیە نازانن بەو ئاراستە کردنەی دژ بەئافرەتان زۆربەی زۆری ئافرەتان دەکەنە دوژمن و ناحەزی دین و پیاوگەلێکی دینداری فەرهەنگ سنورداریش زیاتر دەکەن. بەگژ ئافرەتان کە ئەساسەن دوچاری دزێوترین توندوتیژی جەستەیی و دەروونی دەبنەوە لە کۆمەڵگای کوردیدا. یاساکە زۆر خاڵی جوان و بەرزی تێدایە کە مەلا سوسەیی لەسەریان بازیدا و تەنها یەخەی خەتەنەو لێدانی ئافرەت و منداڵانی گرت وەک بڵێی ئیسلام تەنها لێدان و ئیهانەی پێیە بۆ ئافرەتان و منداڵان. گەورە موفەسیرێکی وەک تەبەری لە پێش نزیکەی هەزار ساڵدا کەباسی تەفسیری (وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ) لەو سەردەمەدا هێندە هەستیارانەو موراعات ئاسایانە باسی دەکات، دەیان ریوایەت دەهینێتەوە

بۆ بەلاوەکی کردنی لێدانەکە و سەد شەرت و شروتی بۆ دادەنێت ئینجا کە باسی لێدانەکەش دەکات دەیسەلمێنێت کە لێدانەکە بە مانای وشە لێدان نییە، بەڵکو رەفتارێکی دەرونییە دەنا چۆن لێدان بە سیواکێکی چەند گرامی مانای لێدان دەهێنێتە دی.

"حدثنا إبراهيم بن سعيد الجوهريّ، قال: ثنا ابن عيينة، عن ابن جريج، عن عطاء، قال: قلت لابن عباس: ما الضرب غير المبرّج؟ قال: بالسواك ونحوه."

لە عەتاوە گوتی پرسیارم لە ابن عباس کرد: لێدانی سوک چییە؟ گوتی: بە سیواک و هاوشێوەکانی..

دەربارەی خەتەنەکردنی مێینەش کە مەلا سوسەیی شەڕی مان و نەمانی لەسەر دەکرد، ئەوە لە قورئاندا هەر باسیشی لێنەکراوە و لە حەدیسیشدا ئەوەی هاتوە ئاراستەی دەمی لە نێرە، جگە لە چەندین حەدیسی لاوازداو لە سیرەشدا یەک بەڵگە نییە کە پێغەمبەر ﷺ هیچ یەکێک لە کچەکانی خەتەنە کردبێت، ئەوەشی دەڵێت پێغەمبەر لە رووی نەهاتوە باسی بکات، وەک چۆن بەرچاوم کەوتوە، ئەوە ئەو سەختگیرە نە لە ئیسلام و نە لە پێغەمبەر باش تینەگەیشتوە. لەوەش سەیرتر خەتەنەکردنی مێینە لە مەنزلگای وەحیشدا (دورگەی عەرەب و سعودیەش) بوونی نییە ئەو وڵاتەی کە فقهاکان عمل اهل المدينة (کاری خەڵکی مەدینە) بە سەرچاوەیەکی شەریعەت دادەنێن، ئەو هەموو هەقیقەتە پشتگوێ بخەین هەر لەبەر خاتری قەولیێک لە کتێبێکی مەزهەبێدا و هەموو ئافرەتانمان لە پێناویدا سەقەت بکەین، با ئەو قەولە نەک هی شوێن کەوتەکانی شافیعی بێت با هی خودی شافیعیش بێت.

بێگومان خەتەنەکردنی مێینە چەند جۆرێکی هەیە هەرە باشەکەی سەقەتکردنی جەستەی مێینەیە (Female *genital Mutilation*) بە مانای وشە و دەتوانین سەدان زیانی خەتەنەکردنی مێینە بژمێرین هەتا شێخ یوسفی قەرەزاوی لە سالی ٢٠٠٩ فەتوایەکی دەرکرد بە پشت بەستن بە ئەنجام گەلێکی چەندین توێژینەوەی زانستی کە کەسانی متمانەدار پێی

هەستا بوون کەوا خەتەنەکردنی مێینە نە فەرزێکە تا جێبەجێ بکرێت و سەرباری زیان بەخشیشە بە ئێستا و دوارۆژی ئافرەتان. شێخ قەرەزاوی لە فەتواکەیدا ئاماژەی بەوە کرد کە سکاڵا و دادی ئافرەتانی خەتەنەکراو زۆر بوە ،دەناڵێنن بە کاریگەری نێگەتیڤی ئەو خەتەنەکردنە بەسەر ژیانی هاوسەریان بۆیە شێخ یوسفی قەرەزاوی دەگاتە ئەو دەرەنجامەی" بۆیە منیش دەنگم دەخەمە پاڵ ئەوانەی دەڵێن هیچ پاکانەیەک لە گۆڕێدا نییە تا بەردەوام بین لەو عادەتە (واتە خەتەنەکردنی مێینە) لە ئیسلامیشدا هیچ بەلگەیەکمان نییە نە لە قورئان و نە لە سونە و نە لە ئیجماع و نە لە قیاس ونە لە مەسلەحەت کە وامان لێبکات دەستبگرین بەو عادەتەوە، بە پێچەوانەوە هەموو بەلگە شەرعی و واقیعیەکان هانمان دەدات ئەو عادەتە (واتە خەتەنەکردنی مێینە) قەدەغە بکەین، بۆیە من فەتوا دەدەم بە قەدەغە کردنی ئەو عادەتە لە پیناو سەلامەتی ژن و کچانی موسڵمان و مندالی موسلمان و پاراستنی لە هەر زیانیک.

"ولذلك أنضم إلى الذين يقولون بأنه ليس هناك أي مبرر لاستمرار هذه العادة ولايوجد عندنا من أدّلة في الإسلام: من القرآن ولا من السنة ولا من الإجماع ولا من القياس ولا من المصلحة، لا يوجد عندنا أي دليل يدعونا إلى أن نتمسك بهذه العادة، بل كل الأدلة الشرعية والواقعية تنادينا أن نمنع هذا الأمر... ولهذا أفتي بمنع هذه العادة حرصا على سلامة المرأة المسلمة والفتاة المسلمة، والطفلة المسلمة، وحمايتها من أي أذى"

کەوا بوو قەدەغە کردنەکە لەلایەن گەورەترین فەقیهی هاوچەرخدا هاتوە نەک لە کۆنگرەی جولەکەکان لە پەکین وەک مەلا سوسەیی ئاماژەی پێدەکرد.

خۆزگە ئەو خۆ شین و مۆرکردنەوەی مەلا سوسەیی لە پێناو بابەتێکی گەورەتر و گرنگتر بوایە نەک لە پێناو خەتەنەکردنی مێینەو لێدانی ئافرەت و مندالاندا، چونکە مردن بۆ مردنیش دەگۆڕێت وەک چۆن گیران بۆ گیرانیش دەگۆرێت. خۆزگە خەڵکی شارەکەشم دینداریەکی هوشیارانەتری مومارەسە کردبا نەک هەر رۆژەی مەلایەک فریویاندا.

# ئیبن ڕوشد و ئازایەتی کورد[٦٠]

گەورەیی ئیبن ڕوشد لەوەدا دەردەکەوێت کە زۆر پێش سەردەمی خۆی کەوتۆتەوە، لە هەندێك ڕووەوە پێش فەیلەسوف و زانایانی ڕێنیسانسی ئەوروپاش کەوتۆتەوە. بۆ نمونە لە هەڵوێستی بەرامبەر ئافرەتدا لەکاتی کۆمێنتدان و شرۆڤەی خۆی لەسەر کۆماری ئەفلاتوون، پشتگیری ڕاکانی دەکات لە یەکسانی لە نێوان پیاو و ئافرەت لەو بوارانەی کە باسی دەکات، بەڵکو پێش مامۆستاکانی خۆشی دەکەوێتەوە، کاتێك دەڵێت ئافرەت وەك پیاو هەموو ئامادەیەکی ئینسانی تێدایە، دەکرێت هەتا ببێتە سەرۆکی وڵاتیش، کە ئەو کاتە ئەو وتەیە ترسناک بوو لە لای پیاوانی دینی کلاسیکی. ئەوە لە کاتێکدا ژان ژاک ڕۆسۆ لە چەرخی حەڤدەدا دەڵێت:"سروشت ئافرەتی ناچارکردوە ملکەچ بن بۆ پیاو."، زۆر قسەی خراپتر کە ڕەنگە ئەوە باشترینیان بێت.

ئافرەت لای ئیبن ڕوشد پێویستی بە بابەتێکی سەربەخۆیە، بەڵام ئەوەی من دەمەوێ باسی بکەم لەو دەقە کورتەی ئیبن ڕوشد، کە دیسان پێش فەیلەسوفەکانی یۆنانی کۆن وەک ئەفلاتوون و چەندین فەیلەسوفی پاش سەدان ساڵی خۆی سەردەمی ڕێنیسانس کەوتۆتەوە، ئەوەیە کە وەڵامی ئەفلاتوون دەداتەوە لەسەر ئەو باوەڕەی کە تەنها ڕەگەزی یۆنان بۆ فەلسەفە دروستکراون، میللەتانی تر ئەو توانایایەیان نیە، مونسکیو و کانت و فیختە وچەندینی تریش خەڵکی پێست ڕەش و جولەکە و دەرەوەی ئەوروپایان جاروبار بە مرۆڤیش نەزانیوە و لەباشترین حاڵەت دا لە دواوەی پەیژەی مرۆڤایەتیان داناوە! بەڵام ئیبن ڕوشد لە ڕەخنە گرتنی لەو ئەفلاتوندا، بێگومان دوایش هەموو تێزە ڕەگەزپەرستەکانی تر لە کتێبی [تلخیص جمهورية افلاطون ] دەڵێت: " لەوە دەچێت ئەوە ڕای ئەفلاتون بێت لەسەر یۆنان بەڵام هەتا ئەگەر سەلماندیشمان کە یۆنانیەکان بە سروشت زیاتر ئامادەی فێربوونی فەلسەفە و وەرگرتنی حیکمەتیان تێدایە، بەڵام ناتوانین

---

(٦٠) ماڵپەڕی ستاندەر، ٢٠١٥/٤/٩ .

نکوڵی لەوە بکەین کە کەسانێکی تریش لە وڵاتانی تر وەك خەڵکی یۆنان ودەوروبەرەکەین، کە بە سروشت ئامادەیی بەدەستهێنانی حیکمەتن. بۆ نمونە وڵاتی خۆمان ئەندەلوس و سوریە و عێراق و میسر. فەزیلەتەکانی تریش وەک فەزیڵەتی حیکمەیە، تەنها یۆنانیەکان تیایاندا نیە." ئینجا لە پاشماوەی ئەو دەقەدا کورد بە نمونەی ئازایەتی دەهێنێتەوە، ودەیسەلمێنیت، کە شۆرەتی ئازایەتی کورد، لە هەموو جیهانی ئەوسادا بڵاوبۆتەوە هەتا گەیشتۆتە ئەندەلوسیش، ودەڵێت: " ئەگەر بەشی نەزەری لە دەروون [واتە عەقڵ و فەلسەفە کردن] لای یۆنانەکان بەهێزتر بوو وەك لای خەڵکی تر، بەڵام بەشی تورەیی واتە ئازایی لای کورد و جەلیقیەکان [خەڵکی باکوری خۆرئاوای دورگەی ئیبیریا، ئیسپانیا و پورتوگال] بەهێزترە لەلای خەڵکی تر... دەکرێت عوزر بۆ ئەفلاتون بهێنینەوە بەوەی کە خەڵکی لەو فەزیلەتانە بەهێز دەبن کاتێ لە منداڵیەوە لەسەری پەروەردە دەکرێن".

# شێخ مستەفا زەڵمی و چەند سەرنجێك[٦١]

من دانی پێدا دەنێم کە کەسایەتی شێخ مستەفا زەڵمی باش ناناسم، شتێکی زۆر کەمیشم لەسەری خوێندۆتەوە، هەرچەندە تێکرای کارەکانیم لەسەر ئینتەرنێت دۆزیەوە کە لەسەر ئەرکی (نێچیرڤان بارزانی) چاپ کراوە، کە ئەوە بەڕای من یەکێکە لە کارە هەرە بە سوود و جوانەکانیی ئەو بەڕێزە. بەڵام لە تێکرای چاو خشاندن بە ناوەرۆکی بابەتەکانی دەردەکەوێت کە کەسێکی ریفۆرمخواز و موجتەهیدێکی گەورەیە، لە بواری فیکری دینیدا. گرنگترین ئەو بابەتانەی کە وروژاندیەتی مەسەلەی کۆتایی هێنانە بەکۆیلایەتی و نەك تەشریع کردنی، هەروەها مەسەلەی هەڵگەڕانەوە و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا، لە هەمووشی گرنگتر مەسەلە گرنگەکانی ئافرەت لە شەریعەتدا کە بەڕاستی تەنها بایەخ دانی بەو بوارە خۆی لە خۆیدا جیاوازی عەقڵیەتی موجتەهیدی کوردی دەسەلمێنێت، کە چەندە ئافرەت و باسەکانی گرنگن و جێی بایەخن، لە بەراورد بە عەقڵیەتی فەقیهی عەرەبی کە کەمتر بە ڕوحیەتێکی ریفۆرمخوازیەوە دەڕواننە ئەو باسە گرنگانەی ئافرەت هەتا ئەگەر دەیان موجەلەداتی لەسەر بنوسێت.

ئەوەی من سەرنجم دا لەو چاوپێکەوتنەی دکتۆر شێخ مستەفا زەڵمی ئەوەیە کە لەوە دەچێت زیاتر بتوانێت گوزارش لە خۆی بدات لە ساتی نووسیندا، نەك لە چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنیدا، چونکە ئەو بیروڕایانەی دەریدەبڕین دەربارەی ئافرەت زۆر دوور بوون لەو ڕوحیەتەی کە ئەو پێی ناسراوە، بۆ نمونە ئەویش دەیگووت نابێت ئافرەت بەبێ مەحرەم سەفەر بکات، کە ئەوە لە سعودیە یاسایە و زۆر بەشێوەیەکی گوماناوی مامەڵە لەگەڵ سەفەرکردنی ئافرەت دەکەن، وەك منداڵێك لێی دەروانن کە ناتوانێت خۆی بپارێزێت. وەك شێخ مستەفا زەڵمی یش گووتی: ئافرەت غەریزەی زاڵە بەسەر عەقڵی بۆیە نابێت بە تەنیاو بێ مەحرەم سەفەر بکات. بەڕای من هەتا ئەو حەدیسانەی کە هاتوە دەربارەی سەفەرنەکردنی ئافرەت بەبێ

---

(٦١) ماڵپەڕی خەندان ، ٢٠١٥/٠١/٢٥ .

مەحرەم، زیاتر جەخت لەسەر پاراستنی ئافرەتەکە دەکات لە بەدکاران، نەك ڕێگا لە ئافرەتەکە بگرێت لە غەریزەی زاڵی بەدکاری بەسەر عەقڵیدا.

ئەوەش ئەو حەدیسانەیە کە لەو بارەیەوە هاتووە، کە گرنگترینیان دەڵێن:"قول النبي صلى الله عليه وسلم: "لا تسافر المرأة إلا مع ذي محرم, ولا يدخل عليها رجل إِلا ومعها محرم، ....ا" (البخاري ١٧٦٣).

[ئافرەت سەفەر ناکات بەبێ مەحرەم، پیاویش ناچێتە لای ئەگەر مەحرەمێکی لا نەبوو...]

عن أبي هريرة عن النبي صلى الله عليه وسلم قال: "لا يحل لامرأة تؤمن بالله واليوم الآخر أن تسافر مسيرة يوم إلا مع ذي محرم"(البخاري ١٠٣٨، مسلم ١٣٣٩).

[حەلال نیە بۆ ئافرەتێك کە ئیمانی بە خوا و ڕۆژی دوایی بێت، سەفەر بکات ڕۆژەڕێیەک تەنها بە مەحرەمەوە بێت]

ئەو حەدیسانە بۆ کاتی خۆی گرنگ بوو، لەبەر ئەو ڕێگاوبانە پڕ مەترسیەی کە بۆ پیاویش زۆر ترسناك بوو، دەگێڕنەوە بەر لە سەد ساڵ ئەو پیاوەی کە بۆ حەج دەچوو، بەتەمای خۆی نەبوو بەسەلامەتی بگەڕێتەوە، چ جای ئافرەت لەو بیابان و چۆڵەوانیە، بەڵام ئەمڕۆ وەزعەکە زۆڕ گۆڕاوە، ڕێگاوبانەکان زۆر ئەمینن، ئافرەت بۆی هەیە بە فڕۆکە بە چوار پێنج سەعات لە سعودیەوە سەفەر بکات بۆ بەریتانیا، کە ناکاتە یەک لە پێنجی ڕۆژەڕێیەك.

هەروەها شێخ مستەفا زەڵمی لە باسی تێکەڵاوی و ئیختیلاتیشدا، بەهەمان عەقڵیەتی سەلەفی تەحریمی تێکەڵاوبوونی بە ڕەهایی دەکرد. لە نێوان کورو کچ دا لە پاش بالق بوون، واتە هەر لە پاش قۆناغی سەرەتایی خوێندن.

نازانم دەبێت جیاوازیمان چی بێت لەگەڵ عەقڵیەتی سەلەفگەرای سعودیەو خەلیج کە بەهەمان پێوەری ئەوان مامەڵە لەگەڵ تەحریم و تەحلیلی مەسەلە پەیوەستەکانی بە ئافرەت بکەین، و لە هەموویش ناخۆشتر وەك ئەوانیش ئافرەت بە لاواز و مەخلوقێکی شەهوانی غەریزە زاڵ بەسەر عەقڵیدا بکەین، بەکورتی وەك منداڵێکی زل سەیری بکەین.

من دڵنیام شێخ مستەفا زەڵمی لە کتێبەکانیدا زۆر گەورەترە لە بیروڕاکانی لەو چاوپێکەوتنەدا، چونکە مەرج نیە من لە نووسین باش بووم، لە وتاردانیش یان چاوپێکەوتنی تەلەفزیۆنی یان لە سیمناریش باش بم، هیوای تەندروستی و تەمەن درێژی بۆ شێخ مستەفا زەڵمی دەخوازم.

| تەوەری سێیەم: حیجاب |
| --- |
| ١- حیجاب یەکەمینی یەکەمەکانە |
| - حیجاب یەکەمینی یەکەمەکانە<br>- ئەردۆگان و هیستریای حیجاب لە نێوان سیاسی و ئایینیدا<br>- کەس بەبێ حیجابی کافر نابێت، مەلا شارستێنی<br>- ئەگەر مەلا شارستێنی وتاربێژی میانڕەو بێت باشترە وتاردان قەدەغە بکرێت<br>- مەلاکانی کوردستان و چیرۆکە سەرەڕۆکانی نیقاب و حیجاب<br>- گفتوگۆی دوو مونەقەبە لەبازاڕێکی شەعبیدا<br>- نامیلکەی چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ کەنیزەکانی داعش |

# حیجاب یەکەمینی یەکەمەکانە[٦٢]

لە کۆمەڵگا ژەهراوی بووەکان بە فەرهەنگی توندرەوی دینی، ئافرەت ئاسانترین نێچیرو ئاسانترین ئامانجی ئەو کۆمەڵگا پیاوسالارەیە، کە هەموو توڕەیی و خەشم و قینی لە دەرنجامی نوشوستی و بێ دەسەڵاتی و کەموکورتی ژیان و بێ کاری و جەوروستەمی دەسەڵات، کە لێی دەکرێت لە ئافرەتدا خاڵی دەکاتەوە، هەتا چەورەو بێ دینی کۆمەڵگاش پەیڕەو لەو ئەتوارەی دژی ئافرەت دەکەن.

لە فیکری دینی بەگشتی و سەلەفی بەتایبەتی، سفور بوون لە نیشانە بچووکەکانی ڕۆژی قیامەتە، لەو ڕێگایەوە پشت بە چەندین قالەو قیلە دەبەستن، کە زادەی عەقڵیەتی بەدەوی دژە ئافرەتی عەرەبن، بەجۆرێک باسی ئافرەت دەکەن، وەك بڵێی سێ چارەگی کێشەو دەردەکانی ئومەتی ئیسلام لەبەر سفوری ئافرەتانە.

ئەو عەقڵیەتە تەهویلیەو زیادەڕەویە خورافە ئامێزە هێندە ناسەنگە کێشەکانی لێ تێکەڵاو دەبێت، نازانێت چۆن ریزبەندی و ئەولەویەتی بۆ دابنێت. لای ئەو هەموو کێشەکانی بێکاری و تەندروستی و خۆشگوزەرانی و گەندەڵی و تاڵانی سەروەتی کۆمەڵگا دەگەڕێتەوە بۆ سفووری ئافرەت.

لە ئێران تیزاب بەو کچانە دادەکرێت، کە حیجابەکەیان باش نابەستن بەهاندانی دەزگا ئاسایشەکانی ئێران.

لە شیشان قەدیرۆفی بەکرێ گیراوی ڕووس، کە لەلایەك شەڕی توندرەوانی دینی شیشان دەکات، کەچی پشتگیری لە هێرش کردنە سەر بێ حیجابەکان دەکات بە تۆپەڵە بۆیاغ.

---

(٦٢) ماڵپەڕی میللەت پرێس ، ٢٠١٥/٠٣/١٥ .

لەکوردستان مەلا شارستینی و غەیری ئەو وا ئافرەتی بێ حیجاب دەتۆقینن، بە سەدان تۆمەتی کوفرو نیفاق و هاوتای داوێن پیسی و لەعنەت لێکراو لە لایەن خواوە تۆمەتبار دەکەن.

مەلا شارستێنی لە جیاتی جەنگ لە دژی گەندەڵی و ناعەدالەتی و کەمووکورتیەکانی تر بکات، کەچی بڕیاری جەنگی داوە دژی ئافرەتی کوردی بێ سەرپۆش.

مەلا شارستێنی دەبوایە خۆی وتارێکی دابا لەسەر ئەو جاش و مستەشارانەی کە کاتی خۆی ئەنفالیان کردوە دژی ژن و منداڵ و پیری کورد، لە جیاتی ئەوە خۆی لە مزگەوتی یەکێك لە گەورە جاشانی ئەنفالچی وتارەکانی دەدات.

بەس بەئافرەت دەوێرن، چونکە کۆمەڵگا سەقەتەکەمان نا مرۆڤانە دەڕواننە ئافرەت کە نیوەی تەواوکەری مرۆڤایەتین.

شارستێنی دەڵێت ئەو ئافرەتەی خۆی دانەپۆشێت و نەبێتە موحەجەبە ئیعلانی حەربی لەگەڵ خوا کردوە، چونکە خوا دەڵێت خۆت داپۆشە ئەو دەڵێت خۆم داناپۆشم، ئەو مەلا لادێیە هەتا ئاگادار نیە بە غەریزەی حەزکردنی ئافرەت لە جوانی، هەتا نازانێت چەندە بریارێکی قورسە بۆ ئافرەتێکی خاوەن کەسایەتی بەهێز، نەك مەڕومالاتەکان، بریاری حیجابکردنی بدات.

ئەوە عەقڵی مرۆڤێکی خوایی و ژیر نییە، کە بازبدات بەسەر هەموو کارەساتە گەورەوکانی کۆمەڵگا لە تالانی و دژی و گەندەڵی و ناعەدالەت بەڵام دنیا لەو حیجابە کۆبکاتەوە. ئەوە هەستی پیاوسالارانەیە هانی دەدات چاوپۆشی لەو هەموو خەراپەکاری و گەندەڵی و خیانەت و داوێن پیسی و دزی و تالان و برۆ بکات ئاوڕداتەوە بۆ لاوازترین ئەڵقەی کۆمەڵگای داپلۆسێنەر، کە ئافرەتە، من نازانم ئەگەر خۆداپۆشینی ئافرەت هێندە گرنگ با، بۆ ئافرەتە کۆیلەکان قەدەغە دەکران لە خۆداپۆشین لە سەردەمی

پەیامدا، نەوەك خەڵك حیسابی ئافرەتی ئازادیان بۆ بکات، بۆ پیاو حەزی بۆ ئافرەتی کۆیلە ناجوڵێت؟ بۆ کۆیلەکانی کچانی فارس و کورد و ڕۆم و چەرکس و قیبت و گورجستان چما زۆر لە کچانی جەزیرەی عەرەبی جوانتر نەبوون.

مەسەلەی نەهێشتنی سەرداپۆشینی ئافرەتی کۆیلە زۆر کۆنە، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشوریەکان، کە ئەو ئافرەتە کۆیلەیەی حیجابی کردبا جەڵدەی لێدەدرا، لەوێوەش پەڕیەوە ناو فقهی ئیسلام، هەتا ڕیوایاتێکی زۆر هەیە دەڵێن حەزرەتی عومەر توڕە دەبوو لەو ئافرەتە کۆیلانەی سەرپۆشیان دەکرد، چونکە خۆیان بە ئافرەتی ئازاد دەچواند.

کەی ئەوە شیوازو ئەتواری مەلایەکە خۆی پێ میانڕەوبێت، کە وەك ڕوکنێکی ئیمان و ئیسلام باسی سەرپۆش بکات. چۆن دەتوانیت بڵێیت ئەو ئافرەتەی خۆی دانەپۆشێت ئیعلانی حەربی کردوە لەگەڵ خوا و پێغەمبەر.

چۆن هەتا باڵاپۆشی بەراورد دەکرێت لەگەڵ نوێژو ڕۆژوو کە ئەوانە لە ئەرکانەکانی ئیسلامن، بەڵام حیجاب چەند ئایەتێکی ناموحکەمی لەسەر هاتووە، هەتا تەفسیری جۆراوجۆریش هەڵدەگرێت.

سەیر لەوەدایە هەندێك سفوری دەبەنگیش توشی ستۆکهۆڵم سیندرۆم بوون، بەرگری لەو پیاوە دەکەن کە کافرو مەلعون و مونافیقیان دەکات.

لە کۆمەڵگای دواکەوتوو کێشەکانی هەژاری، بێکاری ویگەندەڵی، پەروەردەو فێرکردن، بیمەی تەندروستی، مافەکانی مرۆڤ، نیشتەجێ و ژێرخانی وڵات هەمووی پشتگوێ دەخرێت، حیجاب و هیستریای حیجاب دەبێتە یەکەمی یەکەمەکان[٦٣].

---

(٦٣) ئەوە لینکی ڤیدیۆکەیەتی:

&set=vb.٧٩٦٦٠٥٣٩٣٧٦٤٢٩٦https://www.facebook.com/video.php?v=

&theater٢&type=٣٠٣٧٠٢٤٢٩٧٢١٢٦٤

## ئەردۆگان و هیستریای حیجاب لە نێوان سیاسی و ئاینیدا[٦٤].

بێگومان توركیا كێشەو تەنگژەی تا بڵێی زۆرە، ئەو میراتە ئایدیۆلۆژیەی كە كەمالیزم بۆ ئەو وڵاتەی بە جێهێشتوە، لە هزری مرۆڤەكانی ئەو وڵاتەی چاندوە باجێكی زۆری بۆ دراوە و هێشتاش دەدرێ. گومانی تێدا نیە كە كێشەی حیجابیش لە توركیا كێشەیەكی گرنگە، بەڵام قەبارەیەكی گەورەتریشی بەخۆوە گرتوە لە سۆنگەی ڕەفتاری كورت بین و ئاسۆ تەسكانەی نوخبەی عەلـمـانیەتی توندڕۆ لە توركیادا، ئەگینا ئەو كێشەیە هێندە گەورە نیە لە چاو كێشەكانی وەك كێشەی كورد (كە پەیوەستە بە مافی نزیكەی ١٥ ملیۆن موسڵمانی كورد)، كێشەی دەستور ( كە پڕاوپڕە لە بابەتی شۆڤێنی و نا مرۆیانەو پێویستە پێداچوونەوەی بۆ بكرێت)، كێشەی دیموكراسی (كە تەنها لە بەشێكی وڵات پیادە دەكرێت، لە بەشەكەی تر حوكمی عەسكەرو موخابەراتە)، كێشەی قوبرس و كێشەی چونە ناو یەكێتی ئەوروپا (كە خەریكە لەبەر نا ئۆمێدی كەیسەكە ئەردۆگان و گول وع ەلی باباجان بەدرۆی سەوز و پەمەیی خەڵكی توركیا تەخدیر دەكەن، گوایە هێندەی نەماوە ببنە ئەندام و ساڵی ٢٠٠٨ ساڵی چوونە ناو یەكێتی ئەوروپایە)، كێشەی پڕۆژەی گاپ (كە ئەنفالێكی سپییە بۆ خۆی: كە هەزاران گوندی وێران كردوەو سەدەها شوێنەواری كۆنی مێژوویی لەناو بردوەو ملیۆنەها كەسی ئاوارەو دەربەدەر كردوەو ڕەوانەی گەڕەكە ڕەمەكیەكان یان گوێ مەدێیەكان - بە زاراوەی هەولێری-كردون)، بەڵام سایكۆلۆژیەتی بەشێكی زۆری مرۆڤی ئیسلامی لە هەر تەیارو تەوژمێك بەشێوەیەكی نەخۆشانە تەركیز كردنە سەر حیجابی ئافرەتە لەسەر حیسابی هەموو شتەكانی تر، بەڵكو زۆر جار ئافرەتی موسڵمان لای ئەو واتە ئافرەتی حیجاب پۆش، ئافرەتی سفوریش بە چاوێكی پڕ گومان و زەنی خراپەوە سەیر دەكرێت، یان تەنها وەك پڕۆژەیەكی بە حیجاب كردنی ئایندە سەیر دەكرێت. ئەو تەركیز كردنە سەر حیجابە بەو خەستییە زۆربەی جار لەسەر حیسابی ناواخن و ژێر حیجابەكەوەیە واتە ئەو بەهایانەی مرۆڤ دەخەنە بازنەی مرۆڤایەتیەوە.

---

(٦٤) رۆژنامەی ستاندەر ، ٢٠٠٨/٢/١٧ .

فەلسەفەی ئەردۆگان و حزبەکەی لە بنەڕەتدا لەسەر بنچینەی پێشخستنی سیاسی بەسەر ئاینی دامەزراوە، بە مانایەکی تر هەردەم لەسەر دوو ڕەهەنددا یاری سیاسی خۆیان دەکەن کە ڕەهەندی سیاسی و ئاینییە، هەرچەندە تا ئەمڕۆش بێت ئەردۆگان و هاوەڵانی پرایەرەتیان (ئەولەویەتیان) بە ڕەهەندی سیاسی داوە، ڕەهەندی ئایینی زۆر بەکاڵی لەکردەی سیاسیان بەدەردەکەوێت، جا لە قەناعەتەوە بێت یان لە توقیەوە بێت، یان لە فیقهی سەردەمی لاوازی و ئیستیزعاف (فقه الاستضعاف) و فیقهی تەمکین (فقه التمکین) بێت.

بەپێی عەقڵیەتی حەرەکی سیاسی ئیسلامی، کەمن پێموایە دژی پرنسیپەکانی دیموکراسین، ئەوەی بچێتە ناو یاری دیموکراسییەت نابێت پەنا بۆ ئەو جۆرە چەمکە ببات. دەبوایە کێشە سیاسیەکانی تورکیا بە تایبەتی کێشە کورد کە گەورەترینیانە پرایەریتی (ئەولەویەتی) هەبوایە لە ئەژێندای حزبی (AKP) ڕاستە زۆربەی خەڵکی تورکیا دژی قەدەغەکردنی حیجابن لە زانکۆکاندا، جا لەبەر هۆی ئاینی بێت، یان لەسەر بنچینەی ئازادی تاکەکان و دیموکراسی بێت، بەڵام بە ناوەندی کردنی کێشەکە لەلایەن حزبی (AKP) و خستنە گەڕی هەموو بارستایی سیاسی خۆی بۆ هەڵگرتنی قەدەغە لەسەر حیجاب لە زانکۆکان، وەک ململانەیەکی سەرەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی، نیشانەیەکە بۆ بە دوا هاتنی کێشەکان.

بەڕاستی ئەگەر ئەردۆگان لە جیاتی ئەو هەنگاوە هەوڵی دابا چەند تابۆیەکی سیاسی نا مرۆیانەی کەمالیەکانی بشکاندبا هەم چاکتر دەبوو، هەمیش پشتگیریەکی زۆرتری لە ناوەوەو دەرەوەی تورکیا وەدەست دەهێنا. بۆ نمونە هەوڵی چارەسەر کردنێکی عادیلانەی کێشەی کورد کە لەلایەن یەکێتی ئەوروپاش پێشوازی و پشتگیری لێ دەکرێت، نەک ئەوە بەڵکو هەتا ئیدارەی ئەمریکی و لەسەر زمانی خودی بۆش ئارەزوو ویستی ئەمریکای بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کوردو (پ.ک.ک) دەربڕیوە لەکاتی دوا سەردانەکەی گول بۆ کۆشکی سپی بە پێی هەواڵەکانی خودی میدیای تورکی.

بە پێوەری ئیسلامیش چارەسەرکردنی کێشەی ملیۆنەها موسڵمانی کورد، گەڕاندنەوەی هەموو مافە سیاسی و فەرهەنگییەکانیان، مامەڵە کردنیان وەک هەر مرۆڤێکی تورکی پلە یەک، زۆر گەورەترە لای خوا لە خۆ خەریک کردن بە قەدەغە کردنی حیجاب لە زانکۆکان، هەرچەندە ئەو قەدەغە کردنەش بە هەموو پێوەرێکی ئەرزی وئاسمانی قابیلی قبوڵ کردن نیە.

بێگومان پرایەرەتی دان بە کێشەیەکی سیاسی و مێژوویی و مرۆیی وەک کێشەی کورد پایەی حکومەتەکەی ئەردۆگانی لە ناوەوەو دەرەوە قایمتر دەکرد. چونکە ئەو کێشەیە زەنگێکی مەترسی بوو بۆ سەرتاسەری تورکیا، ئێستا هەڵمەتێکی میدیایی گەورە بەڕێوە دەچێت لە دژی ئەردۆگان و حزبەکەی. هەتا نووسەری تورکی بەناوبانگ محمد علی بیراند لە وتارێکیدا بە ناوی: ( ئامادە بن بۆ تورکیایەکی سەرتاسەر گۆڕاو) " Get ready for a completely transformed Turkey " کە لە ٢٠٠٨/٢/١٢ لە رۆژنامەی Turkish Daily News بڵاوی کردۆتەوە، تێیدا ترس و دڵەڕاوکێی نێوەندی سیاسی و دەزگای سەربازی تورکیا دەردەبڕێت بەرامبەر ئەو هەنگاوەی ئەو دوایەی حزبی (AKP) دەربارەی حیجاب، کە بە پێی قسەکانی بیراند ئەو جارەیان :"هیچ بایەخێکیان بە سوپا و میدیای سێکیولاریست و ئۆپۆزسیۆن نەدا، بە تەواوی پشت گوێیان خستن... چونکە رێژەی ٤٦.٦% ئەو بوێریەی بەو پارتە بەخشی، لە هەمان کاتدا ترسی خستە دڵی نەیارانی...بە پاڵنەری ئەو ڕێژەیەو بەپاڵپشتی حزبی بزوتنەوەی نەتەوەیی (توندڕەو) MHP، حزبی (AKP) داری خستە نێو شانەی زەردەواڵە، کاتێ بە هۆشیاریەوە دەستی کرد بە ئەنجامدانی گۆڕان لە نێو ئەو دامەزراوانەی کە تورکیا بەڕێوە دەبەن، ئەویش لە ڕێگای دامەزراندنی ئەو فەرمانبەرو کارمەندانەی هەڵگری هەمان بیروڕای خۆیانن لە پۆستە ئیداریە گرنگەکان، گۆڕان بەرکارە لە دادگای دەستوری وله بۆردی خوێندنی باڵا YÖK Board Higher Education و سەرۆک وڕاگری زانکۆکانیش دەگۆڕدرێن، هیچی تر زمانەی ئەمان لە شوێنی خۆیدا نەماوە. ئەو گۆڕانانە تەنها لە سنوری کارمەندەکان ناوەستێ، بەڵکو عەقلیەتێکی نوێ A new mentality هاتۆتە نێو بواری خوێندن و پەروەردەوە..."

لەڕووی ئابووریشەوە وەک بەزمەکەی دوو حزبەکەی خۆمان، دەڵێت:"پارە دەستاو دەست دەکات. ئەندامانی حزبی AKP بە بەردەوامی دەوڵەمەند دەبن. ئێستا لە هەموو شوێنێکن، هەموو تەندەرەکان (موقاوەلاتەکان) دەبەنەوە...هەروەها کارمەندانی کاروباری دراویش گۆڕاون، لە بانکی سێنتراڵەوە دەستیان پێکردوە".

دەربارەی میدیای حزبیشەوە دەڵێت:"هەروەها میدیای AKP بەردەوام لە گەشەسەندنە، لەکاتێکدا میدیای عەلمانیەکان (سێکیولارەکان) گەشەی کەمتر بەخۆوە دەبینن. میدیای ئاینی لە بڵاوبونەوەو پەرەسەندن دایە".

"لە کۆتاییدا حزبی AKP کاریگەریەکی زۆرتر دەکاتە سەر ژیانمان لە ڕێگای فەرمانڕەوایی شارەوانیەکان. جلی تایبەتیان، شێوازی قسەکردنیان، بۆن وبەرامەیان هەموو دامودەزگاکانی تورکیای داگیر کردوە. پێویست خۆمان ئامادە کەین بۆ ژیان لە نێو تورکیایەکی سەرتاسەر گۆڕاو لە سنوری ٥ تا ١٠ ساڵی داهاتودا". هەر لەو بوارەوە نووسەرێکی تری تورکی شوشانا بیکەرمان لە هەمان ڕۆژنامەی ناوبراودا لە ٢٠٠٨/٢/١٦ دەڵێت:"زۆربەی عەلمانی و چاوەدێرە بیانیە سیاسیەکان، هەڵگرتنی قەدەغە لەسەر حیجاب وەک هەنگاوی یەکەم دەبینن بۆ دزەکردنی فەندەمێنتاڵیزم بۆ ناو هەموو کەرتەکانی سیاسی وکۆمەڵگادا، لەمەودا نۆرەی چی دێت کە لێی دەترسن.

## کەس بەبێ حیجابی کافر نابێت[٦٥]

ئەو پیاوە زۆر کەس وەك کەسێکی میانڕەو و مەلایەکی شلڕەو باسی دەکەن، من دەمێکە تاقەتی گوێگرتنم لەو مەلایانەی کوردستان نەماوە، کە ئاستی وتاریان لە خوارووی ئاستی کۆمەڵگایەکی ئەفریقایی وەسەنی نا شارستانییە، ئەو مەلایە میانرەوە، بزانە چی دەڵێت بە ئافرەتان: ئەو مەلایە فاتیح ناشارستانی لە جیاتی گەیاندنی مەبەستەکەی بە شێوازێکی جوان و لۆجیکیانە، دیسان وەك هەر مەلایەکیتری ئەو کۆمەڵگایە، خەڵکی پێ منداڵە بە هەڕەشە دەیانترسێنێت، ئای چەند شوورەییە مرۆڤ بەس بە هەڕەشە گوێ بۆ وەکیلەکانی خوا ڕاگرێت، جاروبار دەڵێم:دەبێت ئەو ڕوحیەتە هەڕەشە ئامێزەیان هەر لە خودی دەقەکانی دینەکە وەرگرتوە، یان لە کلتوری دینیەوە.

لە سەرەتا باسی ئەو حیساباتەی قورئان دەکات ئەوەندە جارە وای گووتوە و ئەوەندە جارەش وایگووتوە، کە زۆربەی ڕاست و ورد ودەقیق نین، دەیان وتاری ڕەخنەیی لەسەر نووسراوە، من مەبەستم دوا وتەکانی بابەتەکەیە کە بە ڕاشکاوی ئافرەتان تەکفیر دەکات لەسەر بێ حیجابی! هەر لەو وتارە مەلا فاتیح دەڵێت ئەگەر ئافرەت هەموو قورئان جێبەجێ بکات تەنها سەرپۆش وحیجاب نەکات کافرە !گیان لەو میانرەوییە نزیکەی نیوەی زیاتری ئافرەتانی کورد کافر بکەیت؟! ئێمە زانیومانە قورئان دەڵێت: ((إِنَّ اللَّهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا))[النساء:٤٨][النساو:٤٨] خودا تەنها لەوە خۆش نابێت هاوبەشی بۆ بڕیار بدەیت، و لەوە بەرەو ژوورتر خۆش دەبیت ئەگەر بیەوێت...چونکە شیرك سەرتۆپی تاوان و گوناهەکانە، ئەوانی تر وەك دزی، و بوختان هەڵبەستن، و درۆ، و شایەدی دان بە درۆ، و زینا، و هەتا کوشتنیش، هەموو مایەی خۆشبوونە بە پێی قورئان.

---

(٦٥) خەندان، ٢٠١٥/٠٣/١٤.

من باوەڕ ناکەم نەپۆشینی حیجاب لە هیچ لەو کام گوناهانە گەورەتر بێت، بەڵکو هەر هیچ نییە لە چاو ئەواندا. چۆن؟ بی حیجاب بیت باشتر نییە لەوەی درۆزن بیت. بێ حیجاب بێت باشتر نییە لەوەی دز بێت. بێ حیجاب بێت باشتر نییە لەوەی بوختان هەڵبەستیت بۆ خەڵك، بێ حیجاب بێت باشتر نییە لەوەی شایەدی بە درۆ بدەیت، بێ حیجاب بێت باشتر نییە لەوەی گەندەڵ بێت سەروەت و سامانی ئەو وڵاتە هەژارە بدزێت، بێ حیجاب بێت باشتر نییە لەوەی مووچەی بندیوار وەرگریت، بەبێ کارو ماندووبوون. بێ حیجاب بێت باشتر نییە لەوەی لەگەڵ داعش سەوداو مامەڵە بکەیت و چەکیان بۆ بنیرێت بۆ کوشتنی ڕۆڵەکانی خۆمان، بێگومان بێ حیجاب بێت باشترە لە هەموو ئەو تاوانانەی کە باسمان کردن.

ئەوە ئەگەر بێ حیجابی لە بنەڕەتدا تاوان بێت، بەڕای ئێمە بێ حیجابی ئەگەر گوناهیش بێت تەنها گوناهێکی نێوان خوا و ئەو ئافرەتەیە، نە بەوە کافر دەبێت وەك جەنابی مەلای میانڕەو باسی دەکات، نە دەبێتە دوژمنی خواش وەك لە بەشی دووەمی خوتبەکەی باسی دەکات. ئەگەر ئافرەت بەس بەبێ حیجابی کافر ببێت، ئەوە خاوەن ئەو تاوانانەی کە باسکراون لەسەرەوە کە زۆربەیان بە دەستی پیاو دەکرێت،لە کوشتن ودزی وگەندەڵی وداوێن پیسی و ناپاکی وخیانەت ....هتد، هەر هەموویان کافرن، بەخوا زۆربەی مەلاکانیش بەر ئەو کافر کردنە دەکەون.

# ئەگەر مەلا شارستێنی وتاربێژی میانڕەو بێت[٦٦] باشترە وتاردان قەدەغە بکرێت

لەو گرتە ڤیدیۆیەش کە تەواوکەری خوتبە توندوتیژەکەی تریەتی، مەلا فاتیحی زۆر میانرەو هەر لەسەرەتاوە دەڵێت سفوری دە ١٠ بەڵاو کارەساتی لێدەکەوێتەوە [ڕاستیەکەی دە هێندە بەڵا لە عەقڵیەتی تۆدایە]، ئەوەی گوێی لە هەڕەشەکانم بێت جارێکی تر بە سەر ڕووتی ناچێتە دەرەوە [قسەکە ئاراستەکراوە بۆ ئافرەتان] یان ڕێگا نادات کچەکەی یان ژنی و خوشکی بە سفوری بچێتە دەرەوە [قسەکە هاندانی پیاوە، ئەو پیاوەی لە سایەی داب ونەریتی دواکەوتوو، ئەگەر بە هیچ نەوێرێت، بە ئاسانی بە ئافرەت دەوێرێت] بزانە ئەو وتارە تەحریزیە چ توندوتیژیەکی لێ دەکەوێتەوە.

مەلا فاتیح شارستێنی ئەوەی سووکایەتیەی بە ئافرەتی دەکات، بێ ئەوەی مفتەخۆرانی دەسەڵات و وەزارەتی ئەوقاف و ئەنجوومەنی باڵای خانمان و ڕێکخراوەکانی ئافرەتان لیی بە وەڵام بێن! ئەو تۆمەتە ترسناکانەی مەلا فاتیح شارستێنی دەیداتە پاڵ ئافرەتی سفور، هاندەرێکی ئاشکرای توند وتیژیە بە دژی ئافرەتانی سفور، بۆ داپلۆساندنیان لەلایەن برا وباوک و مێردەکانیان وتەواوی کۆمەڵگای دواکەوتووی کورد، کە زۆربەیان فەرهەنگیان لە دەمی مەلا داعشیەکانی ئەمسالی مەلا فاتیح شارستێنی و سوسەیی و عەبدولسەمەد و دکتۆر عبدالواحید محمد ومەلا هاوڕێی دەجال شانامەیی و باقی مەلاکانیتر وەردەگرن. ئەو وتارە لە هەر وڵاتێک بوترێت خاوەنەکەی تووشی لێپرسینەوەی دادگا دەبێت. نازانم وەزیری ئەوقاف چەند کەسی پسپۆری هەیە چاودێری ئەو وتارە توندوتیژ ونا شارستانیانە بکات؟! یان وەزارەت بەس پشکی حزبە وکەس پرسینەوەی لێ ناکات هەرچەندە کلۆڵ بێت.

---

(٦٦) ماڵپەڕی پێنوسەکان ، ١٩ ئازار ٢٠١٥ .

ئێمە چۆن لەو کۆمەڵگایانەی دژایەتی حیجاب دەکرێت رازی نین مافی تاکەکەسیان پێشێل بکرێت بە هەمان جۆر دژی ئەو جەنگەین، کە مەلا فاتیح شارستێنی جاڕی داوە لە دژی ئافرەتی سفور و تۆقاندنیان و هاندانی کەس وکاریان لە دژیاندا. سەیر لەوەدایە لە کوردستان بە جیا لە زۆربەی وڵاتانی تر جیاکاری ناکرێت دژی ئافرەتی حیجاب پۆش، کەچی مەلا بێ کۆنترۆلەکان هێشتا ڕازی نین بەو لێبوردەییەی دەسەڵات وکۆمەڵگا، ئەوان هێرش دەکەنە سەر ئافرەتی بێ حیجاب وکافر ومەلعون وموونافیقیان دەکەن، لە پاش ئەو حوکمانە کوشتنی هەر ئافرەتێکی سفور بە دەستی گەوجێکی ئیماندار فریوخۆر بە دەستی ئەو تەرزە مەلایانە، دەبێتە کارێکی پاڵەوانانە، چونکە تۆ کەسێك دەکوژی کافرە، مەلعونە مونافیقە، جاڕی جەنگی داوە لە دژی خودا! وەك لە وتارەکانی مەلا فاتیح شارستێنی هاتوە.

مەلا فاتیح شارستێنی بە عەقڵیەتێکی گوندنشینی کوردی و بیابانشینی عەرەبی وەهابی ئەوەی خراپە دژی ئافرەتی دەڵێت وخەڵك وکۆمەڵگایان لێ هان دەدات. لەلای ئەو ئافرەتانی سفور بەپێی دەق و ئەحادیسەکان:

- خراپترینی ئافرەتانی ناو کۆمەڵگاکەمانن " شر نسائكم المتبرجات!"
- دوژمنایەتی خوا دەکەن وئیعلانی جەنگیان کردوە لەگەڵ خوا و پێغەمبەر!
- کافرن، و مەلعونن! العنوهن فانهن ملعونات!
- سفورەکان هەمووی مونافیقن! " شر نسائكم المتبرجات المتخيلات وهن المنافقات"
- سفوربوون یەکسانە بە دزی و داوێن پیسی و هاوبەشی بڕیاردان بۆ خوا! چونکە لەدوای یەك لە حەدیسێکی بێ بنەما هاتوون!
- جیاکاریان لە دژدا دەکات و دەڵێت: کوڕان ئامان خۆت بپارێزە لە ئافرەتێك کە لەعنەتی لێکرابێت! ئافرەتێك کە مونافیقە بێت. ئەگەر ژنت هێنا توخوا ئافرەتی سەر رووت و قاچ ڕووت نەهێنیتە ماڵەوە!
- سفووربوونی ئافرەتان هۆی سەرەکی زیادبوونی ڕێژەی تەڵاقە، ئەوانەی تەڵاق دراون هەمووی مونافیقاتە! دەڵێت: "الحمدلله ٩٩% بە شاهێدی

دادگاکان سفورن! " نازانم دادگاش ئاماری بڵاوکردۆتەوە، یان مەلا چۆنی زانی ڕێژەی سفور وموحەجەکان چەند بووە؟!

- ئەوەی خۆداپۆشە کوردێکی ڕەسەنە، ئەوەشی سفورە لە کوردایەتی ومیللەتی خۆمان لایداوە.

ئەو مەلایە میانڕەوە هێندە ساویلکانە دەڵێت:"ئەوەی حیجابی لەبەردا نیە هیچ عوزرێکی نییە، چونکە هیچ ماندوو بونێکی تێدا نییە، چونکە هیچ نەخۆشیەك مانعی نییە".

ئەخر مەلاو قسەکردنیان نەوتوە، لەسەر ئەو بابەتە کۆمەڵایەتیە هەستیارانە، دەڵێی لە گوێی گای مێژوو دەژیت، نازانی ئافرەتیش مرۆڤەو هەقی ئازادی هەڵبژاردنی هەیە، دەیەوێت ببێتە حیجاب یان نا. نازانێت بەو هاندانەی پیاوە بێ فەرهەنگەکانماڵەکان دووچاری گەورەترین توندوتیژی و زۆرەملێی دەکاتەوە، نازانێت هەزاران کچ لە ئەساسدا کێشەیان هەیە لەگەل کەسوکاریان کە نایانەوێت حیجاب بە زۆرەملێی بپۆشن! نازانن هەزاران کچ هەن تەمەنای مردنی باوك وبرای خۆ سەپێنەریان دەکەن، کە بەزۆر لەچکیان کردونەتە سەر، دەچێت نمونەی بەر لە سەد ساڵی لادێکانی کوردستانم بۆ دەهێنێتەوە! کورد لەو سەردەمە وا جاهیل ونەزانانە دوای دەیان مەلای وەك تۆ و لە تۆش توندرەو وتەکفیریتر کەوتوون، دەبیت ئەو سەردەمە چۆن بووبن؟ دەشڵێت ڕێژەی تەڵاق بۆ زۆر بووە؟! ڕێژەکە لەبەر هاندانی مەلای وەك ئێوە زۆر بووە بۆ پیاوان لە دژی ئافرەتان و ڕیزنەگرتنی هەڵبژاردەیان! تەڵاق لەبەر ئەوە زیادی کردوە تۆ ئافرەتی بێ حیجاب بە شەیتان دەکەیت و کافر ومەلعون و مونافیقیان دەکەیت، کە ئەو حوکمە کوێرانەت لە توندڕەوترین مەزهەبی ئیسلامدا نەهاتووە، هەتا لە سعودیەی وەهابی سەلەفیشدا[٦٧].

---

( ٦٧ ) ئەوە لینکی ڤیدیۆکەیەتی:

https://www.facebook.com/video.php?v=٧٩٦٦٠٥٣٩٣٧٦٤٢٩٦&set=vb.٣٠٣٧٠٢٤٢٩٧٢١٢٦٤&type=٢&theater

## مەلاکانی کوردستان

# چیرۆکە سەرەڕۆکانی نیقاب و حیجاب(٦٨)

مەلا واعیزەکان چیرۆکگەلێکی پڕاوپڕ لە هەڵوێستی توندڕەوی و بێ مانای کۆمەڵگای لادێیی کوردستانی پێش پەنجاو سەد ساڵ دەگێرنەوە، یان چیرۆکی لادێ نشینەکانی بەنگلادیش و سعودیەو پاکستان. هەمووشی باسی ڕەوشت و ئاکاری ئەو سەردەمە دەکەن، کە خەڵک چەند باش و بەدین و بەڕەوشت بوون، هەموو چیرۆکەکانیس هاندانی سەختگیریەکی سەلەفی بێ مانا دەکات، لە دەوری لینگی ئافرەت و حیجاب و نیقابەوە دەسوڕێتەوە.

مەلایەک دەڵێت: ژنێکی ڕوسی چونکە بوە موسڵمان بۆ نوێکردنەوەی پاسپۆرتی، رەسمی بە نیقابەوە گرت، واتە یەك پارچە ڕەش، بۆشی چوە سەرو بەزەبری شەونوێژان، چونکە جائیز نیە دەموچاوی دەرخات، ئەو مەلایە قارەمانی تەلەفزیۆنی یەکگرتووی میانڕەویشە.

مەلا فاتیح شارستێنی، لە ڕاگەیاندنی جەنگی لەدژی ئافرەتی بێ حیجابدا، چەند چیرۆکی حیجابی دەگێڕێتەوە، لە یەکێکیان باسی ژنێك دەکات کە لە لادێیەك لە کاتی گەرانەوەی لە کانی، سەرشانی جلەکەی دڕاوە وپێستی شانی بەدەرەوە بووە، پیاوێك توڕە بووەو بانگی کردوە بۆ شانت ڕووت کردوە. کوا دین، کوا ڕەوشت، ئەویش دەڵێت پارچە کوتاڵێکم دەست نەکەوت پینەی بکەم، دیارە سەردەمی پێش دۆزینەوەی کاغەز بووە، کابراش کەوا نوێکەی دەبڕێت بە چەقۆ و دەڵێت برۆ بەوە پینەی بکە، نەك حەیامان بچێت.

ئایا پیاوێك، جوانە گایەك لە خۆی نەزر دەکات، کاتێ لەناو مەجلیسی میوانان دانیشتوە، با هەڵیکردوە نەوەك با کراسی بووکەکەی هەڵدات و قاچ و لینگی بەدەرکەوێت. چیرۆکەکانیان هەمووی لەسەر ئافرەت دەسوڕێتەوە،

---

(٦٨)میللەت پرێس ، ٢٠١٥/٠٣/١٧.

وەك بڵێی پیاو کاملوموکەمەل بن. یان وەک بڵێی لە ژندا هیچ سیفەتێك و بەهایەك گرنگ نییە بە قەد حیجاب و خۆداپۆشین. بۆیە لەناو هەزاران ئافرەتی حیجاب، بەدەگمەن نەبێت کەسێکی نمونەیی و عاقڵ وهوشیاری وا نابینیتەوە کە کەمێك دڵت پێی خۆش بێت، چونکە ئەو دەزانێت وتاری دینی تەقلیدی سەقەت بەس چاوەڕێی ئەو پارچە قوماشە لەو دەکات، پاش ئەوە گرنگ نییە، درۆزن دەبێت، دڵ ڕەق دەبیت، بێ زەوق دەبێت، نامرۆڤ دەبێت.

هەر بۆ بەراورد، بۆ نمونە دەیان گرتەی ڤیدیۆیی هەیە، کە ئافرەتی سفوری خۆرئاوا بەرگری لە ئافرەتی موحەجەبە و مونەقەبە دەکەن، لەبەرامبەر کەسانێك کە سوکایەتیان پێ دەکات. کەچی ببینە لەو کوردستانە، مەلا بەڵاکان باسی ئافرەتی سفور دەکەن وەك شەیتان، وەك جولەکەکانی سەردەمی نازیەکان، هەزار سوکایەتیان پێ دەکەن، ببینە ئەو هەموو ئافرەتە زۆر و بۆرە موحەجەبەیەی حزبە ئیسلامیەکان و سەربەخۆکانیش، یەکێکیان هەڵوێستێکی ئینسانی وەردەگرن، یان بەرگریەك لەو دەستە خوشکانەیان دەکەن؟ !ئەوە لە کاتێکدا هەیانە خوشکیان، یان کچی مامیان، یان ڕەفیقیان، یان هاوپۆڵیان سفورن، کە ناشی کەن چونکە عەقڵیان پەك خستووە و مێشکیان لە مستی مەلا توڕەهاتەکانە.

با چیرۆکێکی عاتیفی وەک فیلمی "هیندی"تان بۆ بگێرمەوە کە خوێندمەوە، لە سایتێکی ئیسلامی، ئەویش لەسەر حیجاب و نیقابە، چیرۆکەکە شێخ ئەحمەد الصویان دەگێڕێتەوە کە لە بەنگلادشی پێشکەوتووەوە، دەڵێت چومە بەنگلادش لەگەڵ تیمێك بانگخوازی ئیسلامی پزیشکی، بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانی چاو، پیرە پیاوێك هات لەگەڵ ژنەکەی کە بە دوو دڵی هەنگاوی دەهاوێشت، کە دکتۆر لە ژنەکەی نزیك کەوتەوە بۆ پشکنینی، ژنەکە دەگریا و وەک شۆڕەبی دەلەرزی، دکتۆرەکە وایزانی لەبەر ئازاری نەخۆشیەکە وا دەلەرزێ و دەگری. بە مێردەکەی گووت بۆ دەگری؟ گووتی: لەبەر ئەوە دەگریت کە ناچار دەبێت دەموچاوی نیشانی پیاوێکی بێگانە بدات. لە دوێنێوە لەبەر نیگەرانی ئەو گوناهە نەخەوتووە

گلەیی لەمن دەکات کە چۆن ڕازی دەبیم و غیرەتم قبول دەکات دەموچاوی دەرخات.

دوایی پاش ئەوەی دنیایەك بەڵگەیان بۆ هێناوەتەوە کە گوناە نییە دەموچاوی خۆی دەرخات بۆ چارەسەری، خوا ڕێی پێداوە، ئینجا ڕێگای دا، و پاش نەشتەرگەری چاویشی هەردوو کرایەوە! بەڵام مێشکی هەرداخراو مایەوە، چونکە بە مێردەکەی دەگووت: ئەگەر لەبەر خوێندنەوەی قورئان و خزمەت کردنی تۆ و منداڵەکانت نەبا پێم باشتر بوو بە کوێری بمێنمەوە و نەك پیاوێکی بێگانە دەموچاوم ببینێ. ئەوە ژنی پیرەمێردێک بووە، لەوانەیە خۆشی پیرەژنێك بوو بێت! کابرای چیرۆك خوان دەڵێت: دەبروانن خوشکان بۆ عیفەت و ڕەوشتبەرزی لە جوانترین شێوەیدا، تەماشا عیزەت بکە بە ڕووە گەشەکەی، ئەوە لە کاتێکدا دەموچاو داپۆشین لە دینیشدا نەك واجیب نییە، بەلکو سونەتیش نییە.

# گفتوگۆی دوو مونەقەبە لەبازاڕێکی شەعبیدا[٦٩]

## زنجیرەی یەکەم

بازاڕێکی قەرەباڵغ بوو، تەنها کچ و ژنی مونەقەبەی ڕووپۆشی لێبوو، هەندێکیان دەستی منداڵی بچوکیان گرتبوو، ئەگەر منداڵێك لەدەستی دایکی دەرچوو، کاتێکی تۆقێنەر و ترسناکی زۆری پێ دەچێت تا جارێکی تر دایکی بیدۆزیتەوە و هاواری ببیستێت.

مونەقەبەیەك خێرا لە دوکانێکی زێڕینگەری وەدەرکەوت، زێڕینگرە داماوەکەش بە هاوار دوای کەوتبوو، دەنگی بە ئاسماندا دەچوو، بەڵام هەر زوو لەناو قەرەباڵغیەکە ون بوو، کابرای خاوەن دوکان ئەگەر خەبەری پۆلیسیش بدات لە وەسفکردنی دەنگی و وەسفێکی وردی کلی چاوەکانی زیاتر نازانێت.

پاش چەند خولەکێك لەبەر قەرەباڵغی خۆی کێشا بە ئافرەتێکی مونەقەبەی تر، ئافرەتەکە زۆر بە ئەدەبەوە داوای لێبوردنی کرد، ئینجا ئەو گفتوگۆیە لە نێوانیان ڕوویدا:

مونەقەبەی یەکەم: [ژنەکە] ئەمڕۆ بازاڕ زۆر قەرەبالغە، گەرمایی وتیشکی خۆر جلە ڕەشەکانمان دەبڕێت و ئاگر لە جەستەمان بەردەدا، ئەرەق وەك بارانی هاوینێکی بە تینی سوتێنەر دەبارێت.

مونەقەبەی دووەم: [کچەکە] حەمد وسوپاس بۆ خوا لە هەر حاڵێکدا. لە دەوروبەری ئەو بازاڕە دەژیت؟

---

(٦٩) (حوار بين منقبتين في أحد الأسواق الشعبية) نوسینی: محمد عبد المجيد ، وەرگێڕانی: محەمەد هەریری ، ماڵپەڕی ستاندەر ، ١٠ی نیسانی ٢٠١٥ .

**مونەقەبەی یەکەم: نەخێر، بەڵام شۆفێرە هیندیەکە چاوەڕێم دەکات لە لای ڕاستی گۆڕەپانە گەورەکە، ئەو وەك دەزانیت من ناناسێتەوە لەناو ئەو هەموو ئافرەتە مونەقەبەیە، هەندێکیان خیماریش دەپۆشن، تەنها پسپۆڕی بۆنکرن و جۆری قوماش و چۆنیەتی ڕەوکردن مەگەر یەکێك بناسێتەوە!**

**مونەقەبەی دووەم: ئا، ڕاستە، ئەو نیقاب و ئەو خیمارە چەند جوانن، دەبەنگی پیاوان لە پێناو زیاتر پاسەوانیکردنی ڕەوشت وداوێن پاکیمان، هەلێکی هێندە زۆری پێداوین کە سفورەکانیش ئەو هەلانەیان نیە لە ئازادترین کۆمەڵگادا! من دەتوانم دزی بکەم بێ ئەوەی کەس بتوانێت بمناسێتەوە، پاش ئەوەی جەستەی داپۆشراوم بە ڕەنگی ڕەش ون دەبێت لەناو ئەو هەموو جەستە ڕەشپۆشانە.**

**مونەقەبەی یەکەم:من جیاوازم لەگەڵ ئەو ڕایەی تۆ خوشکی بەڕێزم، من نیقاب دەپۆشم لەبەر حەز وویستی مێردم، ئەوەشی گوێڕایەڵی مێردی بکات، گوێڕایەڵی خوای کردوە!**

**مونەقەبەی دووەم:بەڵام من بۆیە دەیپۆشم چونکە ئازادی کردنی ئەوەی دەمەوێتم بۆ دەستەبەر دەکات، پیاوانیش وادەزانن نیقابەکەم پشتێنی داوێن پاکییە.**

**مونەقەبەی یەکەم: من ڕەوشتم بەرزە، دزی ناکەم، سنوری حەڕام پێشێل ناکەم، بەڵام ڕۆڵم بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە لە کۆمەڵگادا یاری دەکەم چونکە پاشەکشێم کردوە لە کۆمەڵگا، کەس نامبینێت، وەك ئەو کەسەی لە پەنجەرەی ماڵەکەیدا دەڕوانێتە هاتوچۆکەران و نایەوێت خەڵکانیتر ببینن نەوەك بە ڕوانینیان بۆی توشی فیتنە بن لە دینەکەیاندا!**

**مونەقەبەی دووەم: تۆ زۆر چاك وفەقیر حاڵی، موسڵمانێکی ساویلکەی گوێڕایەڵی نێرینەکانی میللەتەکەی خۆتی، وەك چۆن گەجەروگوجەر**

لەبەردەم قامچی جەلاد، و سەرکردە و خاوەن ماڵدا دەچەمێنەوە، هەرچەندە پێچەوانەی کیتابی خواش بوون!

تۆ تەوقە لەگەڵ کوڕی مامت دەکەیت، ئەگەر بە ڕێکەوت گەیشتنە یەك لە ڕێگادا، یان ستێکت بەسەر هات ناچار بوویت داوای یارمەتی بکەیت؟

مونەقەبەی یەکەم چاوەکانی بریسکانەوە بە پێکەنینێکی جوان و بەریئانە کە هیچ نێرینەیەك لە قەومەکەی نەیان دیوە باوك وبرا و مێردی نەبێت، وەك گاڵتەکردن بە خۆی گووتی: کوڕی مامم دەموچاوی نەدیوم لەوەتەی کە دوو منداڵ بووین لە هەیوانی ماڵە کۆنەکەماندا یاریمان دەکرد. ئێستا لە ئەمریکا گەڕایەوە پاش ئەوەی چەند ساڵێک لەوێ بوو، لە ڕۆژی سێیەمی گەڕانەوەی دوچاری ڕوداوێکی ئوتۆمبیل هات، و لە عاڵەتێکی مەترسیدار بوو کە بردیان بۆ نەخۆشخانە، لەگەڵ دایکی خۆیدا چومە سەردانی، بەڵام دەموچاوی نەدیتم.

دووەم: بەڵام ئەو کوڕی مامی خۆتە، ولەسەر جێی مەرگە، چۆن گفتوگۆیەکی ساغ ودروست لە نێوانتان ڕوودەدات لەکاتێکدا تۆ ناناسێت، هەتا دەنگیشت گۆڕاوە لەوەی سەردەمی منداڵی؟

یەکەم: نێرەکانی قەومەکەمان لە زانا وفەقیهەکان دەڵێن دەموچاو دەرخستن حەڕامە، خوای پەروەردگار لێم تورە دەبێت، ئەگەر کوڕی مامم دەموچاوم ببینێت.

دووەم: جاتۆ باوەڕ بەو قسە قۆڕ وپڕ خوڕافاتانە هەیە؟ ئەو خوایەی کە گەل و هۆزەکانی دروست کردووین بۆ ئەوە [لتعارفوا] بۆ یەکتر ناسین، تورە دەبێت لەوەی بە گوێی بکرێت ویەکتر بناسین؟

یەکەم: نێرەکانی قەومەکەمان دەڵین دەموچاو عەورەیە و فیتنەیە، منیش جوانم هەرچەند جەند ساڵێکیش بەسەر هاوسەرگیریم تێپەڕیوە،

ئەگەر کوری مامم دەموچاوم ببینێت لەڕووی سێکسیەوە دەوروژێت، هەتا ئەگەر جەستەشی وردوخاش بووبێت و لە جوڵەش کەوتبێت.

دووەم:لە ڕاستیدا ئەو نەخۆشیەی کە نێرەکانی قەومەکەمان دوچاری بوون، وادەزانن پاسەوانی داوێنمانن، ئازادی تەواوی پێ داوم بۆ کردنی ئەوەی دەمەوێ و هەر کاتێکی بمەوێ! پێرێ لەگەڵ برادەری برا گەورەکەم چومەوەماڵیان، کەس لە ماڵیان نەبوو، بەبەردەم خەڵکی گەڕەکەکە تێپەڕین بەناو پیاوە ڕیشدارەکانی کە پاسەوانی ئەخلاق و فەزیڵەت دەکەن لە خەو و ئاگایشیاندا، بەوپەڕی ڕیزەوە سڵاویان لێ دەکرد، لەوانەیە وایانزانیبیت من خوشکی بچوکی ئەوم! کاتێکی خۆشمان بەسەر برد، شەیتان سێیەم و چوارەم و دەیەممان بوو.

یەکەم: تۆ داهیە وبەڵای لە شێوەی کچێکدا، و فیتنەیەکی لەناو کوتاڵی ڕەشدا، نامەوێ وەسفێکی وردترت بکەم، نەبادا تورە بیت، چونکە لایق نییە بەتۆ.

دووەم: من زیاترم نەکردوە لە وەڵامدانەوەی داخوازی زانا وفەقیهەکان و دەسەڵات و دەبەنگ و ساویلکە وگێل و موزایدەکەران و بێدەنگ و نەزانەکانی کە داوامان لێدەکەن خۆمان سەرتاسەر داپۆشین، و بشارینەوە بە دووڕوویی، وچاویش بپۆشین لەو تاوانانەی کە لە ژمار نایەن، مادامەکێ دوور لە چاوی بینەران روو دەدەن!

نهێنیەکەت پێ دەڵێم کە بە کەسێکم نەوتوە، دەستەخوشکێکی خۆشەویستی خۆم کە زۆر سەربزیوە دەتوانێت خودی شەیتان لە خشتە بەرێت، توانی سێ شەو و سێ ڕۆژ لە باوەشی لاوێك بخەوێت لە ماڵی خۆیان، ژورێکی هەبوو لە نهۆمی دووەمی ماڵەوە، باوکی قەناعەت پێکرد، کە دەستەخوشکەکەی پێویستی بەوە بۆ دەرچوون لە کێشە خێزانیەکانی، چونکە زۆر شەریفە قسەش لەگەڵ پیاو ناکات، پێیوایە دەنگی ئافرەت عەورەتە وحەڕامە! خانمی بەڕێزم ئێمە دووڕووین تا سەرئێسقان، ساویلکەین

تا دەبەنگی، گێلین تا پلەی شێتی. پاسەوانانی ڕەوشت وفەزیلەت کە هەموو ساتێکی ڕۆژ وشەو بۆمانی دووپات دەکەنەوە کە ئافرەت لە پەراسوێکی خوار دروست کراوە، و شەیتانێکە لە ماڵدا، زۆرترین بەشی خەڵکی دۆزەخ پێ دەهێنن، سەرتاپایان عەورەیە، هەر خۆیان پاسەوانی گوناهەکان و تاوانەکانمان دەکەن، لە بەردەرگای بەدڕەوشتی دەوەستن تا لێی دەبینەوە.

یەکەم: بەڵام من تەقوای خوا لە دڵمدایە، خیانەت لە مێردم ناکەم بۆ چەند چرکەیەکیش هەتا لە خەیاڵمدا، پەرۆشی ماڵەکەمم وەك پەرۆشی ئیمانم، بەڵام وەك باسم کرد، ڕێی گوێڕایەڵی کوێرانەم هەڵبژارد، بە تەواوی خۆم کێشایەوە لە رۆڵی نیوەی دووەمی کۆمەڵگا، خۆم لەناو ئەو پارچە کوتاڵە ڕەشەدا شاردەوە، بەپێی ئارەزووی ئەوانیتر دەڕۆم بەڕیوە، لە ترسی ئەوەی نێرەکانی قەومەکەمان ڕاست بن، ئەگەر بە گوێیان نەکەم دەموچاوم لە دۆزەخدا بسوتێت لەو ڕۆژەی هیچ بە هانات نایەت نە ماڵ و نە ئەولاد!

دووەم: هەمووومان قوربانی ئەو تێگەیشتنە نەخۆشە و ئەو هەوەسە سێکسیەی نێرەکانی قەومەکەمانین.

یەکەم: هاوڕاتم بە تەواوی، هەردەم هیواخواز بووم کە مافی پیادەکردنی ژیانێکی ئازاد و سروشتیم هەبێت، هەستەکانم لەسەر روومدا دەرکەوێت، خەڵکی تر توڕەیی و ئارامگرتن و سورهەڵگەڕانی شەرم، وزەرد هەڵگەڕانی نەخۆشی، هەستی ڕق، وئاماژەی خۆشەویستی، هێمای ڕازیبوون، و گوزارشی قیزاندن ببینن.

تەنها هەقی خۆم نییە دەموچاوم دەرخەم یان بیشارمەوە، بەڵکو هەقی خەلکیتریشە بزانن لەگەڵ کێ قسە دەکەن، بگەنە قەناعاتەکانیان لە ڕوخساری تەواوکەری قسەدا، لە کڕین و فرۆشتن، و قوتابخانە و نەخۆشخانە و شەقام و بازاڕ، لە هەمووشیان گرنگتر پەیوەندیەکانی خێزانی گەورە، تا ژیان بە ڕاست ودروستی بڕوات بەڕێوە، دوور لە نەخۆشی گومان و وەسوەسە. داوێن پاکی من بەردەوام دەبوو ئەگەر دەموچاویشم دەرکەوتبا،

ئەتوش لەوانەیە ئەگەر دەموچاوت دیاربا یەکیک ڕێگری کردبایت لە گوناهەکانت.

دووەم: جاروبار گومانەکانم دەگەنە یەقین کە پیاو هەوڵ و کۆششێکی زۆری داوە بۆ قەناعەت هێنان بە ئافرەت دەموچاوی داپۆشێت بۆ داپۆشێنی تاوان و گوناهەکانی خۆی! بەر لە ماوەیەکی کورت، پیاوێکم دیت لە تەك دوو ئافرەتی مونەقەبە دەڕۆیشت، لە نزیك ئەوانیش پیاوێك لە پشتیانەوە هەنگاوی دەنا، یەکسەر زانیم ئەو برادەری پیاوەکەی یەکەمە، دەشمزانی ژنی پیاوەکەی دواوە بەر لە هەفتەیەك سەفەری کردوە بۆ ماڵی باوانی لەبەر هۆکاری خێزانی. دوو دەقە زیاترم پێویست نەبوو لە هەموو سیناریۆی ئەو دوو پیاو و دوو ژنە تێبگەم!

پۆشینی دەموچاوی ژن هاڤدژە لەگەڵ ڕوحی ئیسلام، دژی تەعالیمەکانیەتی، بەر تێگەیشتنی باڵاو دروست و عەقڵانی وێنەی تەقوا و ئیمان دەکەوێت، کە دەڵێت خوا زۆر لەوە گەرەترە وبەرزترە کە نێر ومێ دروست بکات، و لە گەل وهۆزی جیا دروستمان بکات بۆ ئەوەی تەعاروف بکەین ویەکتر بناسین، دوایی یەکتر نەناسینمان بەسەردا بسەپێنێت!

یەکەم:بەراستی تۆ سەیری، دەبینم کچێکی هەڵبەز ودابەز دەکەیت لە نێوان ئیمانێکی قایم و گوناهی بێ شەرمدا.

من ناکۆك نیم لەوەی کە خوای باڵادەست موعجیزەکانی بەدەنی لە دەموچاودا کۆ کردۆتەوە، ئەگەر زمانیش بەهانات نەیەت، ڕوخسار و دەموچاو دەتوانن مەبەستت بنوێنن، لەبەردەم دادوەر و پارێزەر و پیاوی ئاسایش و هاوپۆلت لە خوێندن و هاوڕێت لە کار، هەروەها لەگەڵ فرۆشیاری گزیکەر و لەگەڵ شوفێری مەحرۆم لە سێکس، کە نازانێت چەندە خۆڕاگری و تووندی لە پاراستنی ڕەوشت وداوێنت تا دەموچاوت نەبینێت.

من کۆکم لەگەڵتدا کە داپۆشینی دەموچاو خەریکە بگاتە ئاستی تاوان لەبەر ملکەچیمان بۆ فیکری هەوەسبازی سێکسی کە عەقڵی نیرینەی میللەتەکەمانی داگیرکردوە، زۆرجار بە خەیاڵم دادێت پەچەکە لەسەر دەموچاوم لادەم تا ئەوەیتر گوزارشەکانی دەموچاوم ببینێت کە بەزمان نەمتوانیوە دەریببڕم.

دوێنی نیگاکانی پیاوێك خەریك بوو ڕوپۆشەکەمی دەدڕی، خەیالی نەخۆشیم دەدیت چۆن دەجوڵا وەك جولەی شەیتان، هیوام دەخواست بتوانم پەچەکەم لادەم تا نیگا تورە و پڕ بە سوک روانینی من بۆ خۆی ببینیت لە ڕوخسارمدا، چونکە من ئافرەتێکی میردار و خاوەن شەڕەفم، لە خوا دەترسم لە نهێنی و ئاشکرادا.

# گفتوگۆی دوو مونەقەبە لەبازاڕێکی شەعبیدا

## زنجیرەی دووەم

مونەقەبەی دووەم: بۆ وادەزانیت من ڕازیم بەوەی دەیکەم؟ بەر لە ساتێك خۆم کێشا بە تۆ، چونکە ڕامکرد لە دوکانی زێڕینگەرێك، پارچە زێڕکی بەنرخم دزیبوو، بەخێرایی ڕامکرد بۆ ناو ئەو دەریا ڕەشە قەرەباڵغە، کە دەڵێیت دیمەنێکی تازیەباریە، وەك بڵێیت ئافرەت کچی حەوا نەبێت، بەڵکو کچێکی نازداری ئەهریمەن بێت.

من هەست بە خۆشیەکی لە ڕادەبەدەر دەکەم کاتێ گوناهەکانم لە دژی پاسەوانانی ڕەوشت تۆمار دەکەم. ئەگەر وڵات وگەلی خۆم خۆشنەویستبا، بە تووندی داوای گواستنەوەی جانتایەکم رەت نەدەکردەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، چونکە دەمزانی سەرەتای کارێکی تیرۆرستیە. من بەو شێوەیەش شەیتانێک نیم لە ژێر نیقابدا.

کاتێ یەکێ تاوانێك ئەنجام دەدات، دەزگای ئاسایش یەکەم شت بەدوای بگەڕێت، ئەگەر لە ئەلف وبێی سیاسەتی ئاسایش بزانن، بریتیە لە وەسفی تاوانبارەکە، ودۆزینەوەی پەنجەمۆریەتی، کە خودا وای دورست کردوە قەت دوو کەس وەك یەك نەبن لەسەر ئەو زەویە. ئەو دوو موعجیزەیە، هەر یەکێکیان بەسە بزانین کە ئەو بونەوەرە جوانە دروستکەرێکی داهێنەری مەزنی هەیە. دەموچاو و دوو دەست ئەگەر بیانشارینەوە، مانای ئەوەیە خۆڵمان کردوە بەسەر دوو مەزنترین موعجیزەی خوا!

کۆمەڵگای دەبەنگ کە دەسەڵاتی ساویلکە پاڵپشتی دەکات، مۆری تێپەڕاندنی دەبەنگیەکانیشی لەلایەن پیاوانیکی دینی لیدەدری کە پییان وایە لە دین و دنیاش دەگەن، ئەوانە باوەشیان کردۆتەوە بۆ تیرۆریزم و داوێن پیسی.

منیش وەک تۆ هیوا دەخوازم بچمە ناو خەڵك، قسەیان لەگەڵ بکەم، دەموچاوم ببینن، هەست وسۆزم ئاشکرا بکەم، پیاو ڕیزم لی بگرێت وەك مرۆڤیك جیاوازی نەبێت لەگەڵ ئەو، نەك بەڵگە لە کۆنە کتێبەکان بهینیت بۆ ئەوەی بڵێت بەدیارکەوتنی دەموچاوم خوا تورە دەکات.

مونەقەبەی یەکەم: ئەوە مانای ئەوەیە تۆ تۆڵە لە پیاوان دەکەیتەوە، یان هۆکاری تر هەیە لە دوای ڕەفتارە سەربزێوەکانت؟

مونەقەبەی دووەم: من دەمەوێ بۆ پیاوی بسەلمێنم کە ئەوەی لیی دەترسێت پیاوانێکن وەك خۆی، لەوانەیە برای یان باوکی یان مامی یان برادەری خۆشەویستی خۆی بیت. تورەییەکی زۆر لە ناخمدا پەنگ دەخواتەوە لەبەر ئەو دووالیزمەی نیرەکانی میللەت تیایدا دەژین، زۆربەیان بیر لە نیوەی خوارەوەی پیاو و ئافرەت دەکەنەوە بە یەکسانی.

جارێکیان هەر بە ڕێکەوت نیقابەکەم هەڵدایەوە بۆ دوو خولەك، چونکە هەستم بە ئازارێك دەکرد لە دەموچاوم لەبەر بەریەک کەوتنی لەگەڵ پارچە قوماشێکی زبر وسەرەڕای گەرمای هاوین، ئاوێنەکەم دەرهێنا لییم دەروانی، لە ناکاو پیاوێکی پاسەوانی ڕەوشت وفەزیلەت پیم هەڵشاخا لەبەر چاوی خەڵك، وەك بڵێی من لەسەر شۆستەکە زینا بکەم.

سورپرایسەکە لیرەدا نیە، پاش کەمتر لە نیو سەعات هەمان پیاوم دیت گێچەڵی بە ژنان دەکرد لە شوێنێکی قەرەباڵغ.

چاکی وفەزیلەتی ئافرەت لە چاکی و فەزیلەتی پیاو دەست پێدەکات، پیاوانمان بەندەی سەردارەکانیانن، پیاوە هەر خەڵکیتر دەتۆقێنێت، و بازرگانی چەك دەکات، وخاوەنی سۆزانیخانە و مەیخانە و تیاترۆخانەکانە، هەر ئەو نەخۆشی ئایدزی بۆ هێناین بەدیاری لە سەفەرە گوماناویەکانیدا. پیاوە ماستاو بۆ دەسەڵات دەکات، تەجاوز بە ئافرەت دەکات، حورمەتی پیاوانیش هەتك دەکات لە زیندانیەکاندا، گۆڕی بە کۆمەڵ هەڵدەکەنێ بۆ

هاونیشتینمانانی بە ناوی سەرکردەی وڵات، مێژوو ساختە دەکات، دۆکیومێنتی نیشتیمانی ساختە دەکات، ناچارمان دەکات لەسەر تێگەیشتنیکی نەخۆشانە بۆ ئیسلامی پاکمان.

پیاوە لە ئافرەت دەدات وسوکایەتی پێ دەکات، دوایش لە نوێژیدا خەون بە حۆریەکان دەبینێت، کە پاش هەر هەر جووت بونیك کچێنی دەگەڕیتەوە دۆخی جاران. پیاو نەخۆشە بە ئافرەت، بە دەسەڵاتێکەوە رەفتار لەگەل ئافرەت دەکات، وەک قەرەبوویەك بۆ بێ دەسەڵاتی لەبەردەمی سەرۆکی لە کاردا، یان لە پۆلیسخانە لە ژێر قامچی ئۆفیسەرەکانی پۆلیسدا، یان لەپێش زانا وفەقیهەکان کە باسی چۆنیەتی مامەڵەی ئافرەتی بۆ دەکەن لەسەر جێگا و جووت بوون و حەیز و نشوز و یاخی بوون، بەڵام فێری ئادابی ڕەفتارکردن و ڕەتکردنەوەی کۆیلایەتی ناکەن، بەرلەوەش فێری پاراستنی کەرامەتی ناکەن وەك هاوڵاتیەکی ئازاد و سەربەخۆ.

یەکەم:هەست بە غەزەبیکی گەورە دەکەم کە قەوارەیەکی بچوك ولاواز دەهەژێنێت، خوشکی بچوکم تۆ پێویستیت زۆر بە پیاوێکە بتپارێزێت، پێویستیت بە سینەیەکە سەرت بخەیتە سەری، پێویستیت بە خێزانێکە کە نوتفەی پیاو دروستی دەکات تا ببیتە دایکی مندالان.

دووەم: من بەدوای قەوارە و پێناسەی خۆم دەگەڕێم وەك ئافرەتێکی موسڵمان، تێگەیشتنی پیاوانە هەموو جوڵەیەك و ئاماژەیەکی بۆ دیاری نەکات، یان بە تاوانبار و بەڕەڵلام بزانێت، چونکە من بە گوێی خوام کردوە و دەموچاوی خۆم دەرخستوە.

یەکەم: بیرت لە خشتەت نەبات وابزانیت من لە بەرەی دژی تۆ و کارەساتەکانی تۆم، کە ملیۆنەها ئافرەت بە دەستیەوە دەناڵێنێت، منیش خەون بە ئازادیەکی پابەند دەبینم، خەون بە بەژداریەکی سەنگین دەبینم، و خەون بە تێکەڵاوبوون لەگەڵ ئەندامی ئەو خێزانانە دەبینم کە دەیان

ناسین، و تەوقە لەگەڵ برادەری کوڕەکەم بکەم، وڕیزی لێ بگرم و ڕیزم لێ بگرێت.

من لەو باوەڕەدام کە خوای گەورە توڕەیە لە پیاوانی ئەو ئومەتە، ئەوانەی لە دینە مەزنەکەی شتانێکی وا بچووك و بێ ئەرزشیان گەورە کردوە و دەرهێناوە، ئیمە ئیسلام بە دوور دەزانین لەو شتە بی ئەرزشانە.

پیاوی گورگ ڕەفتار هەموو پیاوێکی تر وەك گورگێك دەبینێت کە هاڤڕکێی لەگەڵ بکات لەسەر نێچیرەکەی، بەڵام خۆی وەك یەکێك لەو پیاوانە نابینێت، کە لە خەیاڵیاندا پەلاماری ئافرەت دەدەن!

کێشەکە لەوەدایە پیاو تەفسیری دین و دەسەڵات و جەنگ و لاقەکردن و بازرگانی تلیاك و بنیاتنانی زیندان و سۆزانیخانەکان و پاڵپشتی سەرکردە ملهوڕەکان و یارمەتیدانی دیکتاتۆرەکانی بۆ خۆی مۆنۆپۆڵ کردوە.

من لە ناوەوە باوەڕم وایە کە داپۆشینی دەموچاو تاوانیکە دەرهەق بە پەروەردگار، ژیانیش دروست نییە وسەرناگرێت بەبی یەکتر ناسین، بەڵام لەبەردەم دەبەنگی پیاودا و نەقسی عەقڵیدا ناتوانین ناڕەزایی دەربرین، چونکە یەکسەر تەکفیرمان دەکات، شتێکی تری لی دەرەنجام دەکات، بە درۆ و بە بوهتان دەڵێت کەوا ئێمە داوای ئازادی خۆرهەڵاتی دەکەین، وداوای بەڕەڵایی و دەرخستنی دەموچاو دەکەین، هەتا ڕاوکردنمان ئاسان بێت.

پێم نەگووتی پێشتر کە پیاوان ناقیسی عەقڵ و دینن.

دەستەخوشکێکم پیاوەکەی نەیهێشت بە هیچ شێوەیەك ئوتۆمبیل لێ بخوڕێت بۆ گەیاندنی مناڵەکانی بۆ قوتابخانە. ئافرەتەکە دەیویست منداڵی خۆی بپارێزێت، بەڵام مێردەکەی خۆی دەپاراست، وایدەزانی لەگەڵ دەرخستنی دەموچاوی و لێخوڕینی ئوتۆمبیل ژنەکەی خۆی دەهاوێژێتە

باوەشی یەکەم پیاو چاوی پێ بکەوێت. پیاویش بە عادەتی خۆی گومان لە ژن ناکات بەرلەوەی گومان لە خۆی نەکات، هەموو پیاوانی تریش وەك چڕنوکدار نابینێت، بەرلەوەی هەست بە چڕنکوکەکانی خۆی نەکات.

پیاوی وا دەبەنگن ئەگەر کێشەکە پەیوەندی هەبوو بە پاراستنی منداڵەکان، چونکە ئەو گورگەی بۆیان لە کەمینە وەک ئەو پیاوە، فڕوفێڵ و تەکنیکەکانی دەستدرێژی و لاقەکردن و گێچەڵ باش دەزانێت.

کارەسات ئەوەیە پاش سێ ساڵ باوك و دایك بۆیان دەرکەوت کە سایەقی زگورتی و مەحروم لە سێکس، گێچەڵی سێکسی بە بە منداڵەکانیان دەکات لە ماوەی ئەو چەند خولەکەی کە منداڵەکان سواری ئوتۆمبیل دەکات و یان کاتێ دادەبەزن. بە بیانووی بەستنی پشتێنی خۆبەستنەوە دەستی لە هەموو جەستەی بەریئی منداڵەکان دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا ملیۆنەها نیرینەی پاسەوانی رەوشت چاوپۆشی دەکەن لەو تاوانەی کە ڕۆژانە ڕوو دەدەن، تەقوای خوا ناکەن لە منداله لاوازەکانیان.

پێم نە گووتی پیاو دەبەنگە؟

دووەم: تۆ خانمێکی ڕەوشت بەرزی میرد و شەڕەف و عەرز و دینت دەپارێزیت، بەقەد من پیاو ناناسیت، هەرچەندە تەمەنیشم بچوکە. من لە هەموو شوێنێك دەیان بینم، لەگەڵیان دەچمە ژووری داخراوەوە، سەرم بەرز دەکەمەوە پاش داپۆشینی دەموچاوم و هەنگاونان بەرەو ئەنجامدانی کارێك کە بە مێشکی هیچ کەسێك داناجێت لەوانەی سەیرمان دەکەن! ئەوان ژنێك یان کچێك یان هەتا پیاوێکی شاراوە لە ناو بەرگێکی ڕەشدا دەبینن، ئیتر بڕایەوە.

من بەشێکم لە کۆمەڵگایەکی دەبەنگ، دوو ڕوو، پیاوانی سەرقاڵن بە قەدەغە کردنی خەلوەت، بەڵام ڕێگای ئاسانتر دادەهێنن بۆ ئەنجامدانی خەڵوەتە پڕ حەڕامەکان.

دەستەخوشکێکم هەیە هێندە جوانە ئەگەر ژنخوازان ببینن شەڕی لەسەر دەکەن، ئەویش دەتوانێت یەکێکیان بە دڵی خۆی هەڵبژێرێت، ئێستا نزیکەی سی ساڵی تەمەنە هێشتا شووی نەکردوە، ئەو یەکێکە لە ملیۆنەها قەیرە لە جیهانی عەرەبی مونافیقدا.

بە کوڵ لای من گریا منیشی خستە گریان، کاتێ باسی ئەو داخوازیکەرانەی دەکرد کە هاتبوونە خوازبینی بەپێی وەسفکردنی ژنانی تر یان هەندێ لەوانەی دەیناسن. ئەنجامەکەی ڕەت کردنەوەی کچەکە بوو بۆ هەموو ئەوانەی دەیانویست هاوسەرگیری بکەن لەگەل کچێك کە نەشیان دیوە، ودڵیشیان بۆی لی نەداوە، یان هەتا هەستیشیان بۆی نەبزواوە!

ئەو ئافرەتە لە جیهانی حورمەکان ژیان دەباتە سەر، ساڵ تێدەپەڕن، تەمەن جوانی هەڵیدەبزرکینێ، چاوەڕیی نەناسراوێك دەکات لە دەرگای ماڵەوە بدات، بۆ کرینی ئەو کەلوپەلەی، کە ماوەی بەسەرچوونی نزیك بۆتەوە، بەپیی تێگەیشتنی کۆمەڵگاکەمان.

یەکەم: بەڵام ئافرەتی قەیرە لە کۆمەڵگا تێکەڵاوەکانیش هەن، و سفوریشن، وانیە؟

دووەم: لەو حالەتەدا هەل ومەرجی تر لە گۆڕێ دایە، دەتوانین باسی ئەوە بکەین کە زەواج قیسمەت ونسیبە، خودا چاکەی خۆی دەبەخشێتە داوێن پاکان.

بەڵام ئەوەی لای ئێمە ڕوودەدات شێوەیەکە لە شێوەکانی کۆیلایەتی، باوکان کوتاڵەکانیان [کچەکانیان] دەشارنەوە تا ڕۆژی فرۆشتنی کابرا نابینێت، زواج ودیتن لەیەك ساتدا ڕوو دەدەن.

ئیسلام کۆتا ئایینی ئاسمانیە، پێویستە موسڵمانان لەگەڵ سەردەمدا ئاشت بنەوە، چونکە ئەوان وشەکانی خوایان پێیە کە بۆ هەموو کات وسەردەمێك گونجاوە.

**دەزانیت بۆ ئیسلام داوا دەکات زەواج ئاشکرا بکرێت؟**

هەتا خەڵك یەکتر بناسن، ڕێگای داوێن پیسی ببڕێت، تا هاوسێ و خەڵکی گەڕەك و دۆست و ناسیاو و برادەران و هاوڕێی کارکردن هەمووی بزانن کە ئەو ئافرەتە ژنی ئەو پیاوەیە.

# گفتوگۆی دوو مونەقەبە لەبازاڕێکی شەعبیدا

## زنجیرەی سێیەم

یەکەم: لە دواوەی گوناهە قێزەوکانت، من حیکمەتێکی عاریفانە، و باوەڕێکی بەهێزت تیادا دەبینم، هەروەها حەزی تەوبەیەکت تێدا دەبینم کە لەڕێگای ئەو چەمک وتێگەیشتنە ڕۆشنانەتەوە خۆی بەیان دەکات، لەسەر زمانی کچێك کە بەداخەوە تۆڵە لە هەموو شتێك دەکاتەوە لە دەوروبەری خۆی. بەڵام من بەدوای ئاشتی لەناو ماڵەکەمدا دەگەڕێم، گوێڕایەڵی مێردم دەکەم، ڕۆڵی خۆم لەو کۆمەڵگایەدا تەنها لە ناو ئەو جلە ڕەشانەوە دەگێڕم، کوتاڵەکەی بۆن دەکەم، تاڵەکانی هەڵدەمژم، تیشکی خۆریش ناتوانێت دیودەر بێت بۆ سەر پێستم تا تەندروستی و جالاکی وجوانی سروشتی پێ ببەخشێت.

من هێزی ململانێی پیاوم نییە، ئەو دەتوانێت قسەی چەندین پیاوی وەك خۆیم بۆ بهێنێتەوە کە بەر لە سەدان ساڵ ژیاون، ئینجا دەیانکاتیش بە داوەر و حاکم بەسەرم.

من دژی بەگژداچوونی ئەوم، ئەو هەقی لێدانمی پێیە، هەقی کۆچ کردنم، هەقی منداڵ گلدانەوەی هەیە لەبەر یاخی بوون و نشوزم، ئەو دەتوانێت پشت بە دەسەڵات و پاسەوانانی فەزیلەت و دادگا ببەستێت بۆ ڕاستکردنەوەی منی پەراسووی خوار! من لە ژێر ئەمروئامازەی پەنجەی ئەوم، کەچی بە خەڵك دەڵێت من شاژنم لە ماڵەوە.

چەند ئاواتەخوازم ئەو خەڵکی خوایە بناسم، وزانیاری بەدەست بێنم. پیاوانی تر ڕاستەوخۆ قسەیان ئاراستەی من بکەن، نەك لە ڕێگای ناوەندکارێك، خۆم زاڵبم بەسەر قسە و کردارم، جیاوازیش بزانم لە نێوان مەڕ وگورگ بەبێ یارمەتی پیاوێکی تر. من پێویستیم بە شاردنەوەی دەموچاوم نییە بۆ سەلماندنی باوەڕم بۆ خەڵکانی تر، چونکە ترس وتەقوای خوا لە

دڵمدایە، ئەو شەیتانەشی بە چرپەیەك بەسەر پیاو سەردەکەوێت، ئافرەت بە بەهێزتر و شەریفتر لە زۆربەی پاسەوانانی ڕەوشت لە پیاوان دەبینێت.

دووەم:بەڵام من هاوپەیەیمانیەکی کاتیم بەستوە لەگەل شەیتان، منیش گوێرایەڵی دەبەنگی پیاو و دەسەڵاتم، دەستەوان لەدەست دەکەم کاتێ دزی دەکەم، تا پسپۆڕان پەنجە مۆرم نەناسنەوە.

دەموچاویشم دەشارمەوە کاتێ کارێکی حەڕام دەکەم، هەمووشی لەگەڵ پیاودا دەیکەم، بەڵکو دەترسم بڵێم زۆربەیان پاسەوانانی فەزیلەت و ڕەوشتن لە شەقامەکان وماڵ و کاردا.

ئەگەر هەر پیاوێك لە کۆی پیاوەکانی تر دەترسێت و وادەزانێت خۆیان مەڵاس داوە بۆ ژن وکچ و خوشکانیان، کەوابوو چی دەمێنێتەوە لە بەهای خێر و خۆشەویستی و لێبوردەیی و باوەڕ ومتمانە؟

من بە چاوی خۆم کچانی وام دیوە هەموو جۆرە داوێن پیسیەك ئەنجام دەدەن، بەڵام لە کۆمەڵیشدا زۆر ڕیزیان لێ دەگیرێت، چونکە گیلەپیاوان وادەزانن شاردنەوەی دەموچاو گورزێکی کوشندەیە بۆ وەسوەسەی شەیتان و هەموو تاوگیریەکانی [اغراء].

لەناکاو گریانی منداڵێکی بچوك قسەکانی پێ بڕین لەوە دەچوو دایکی ون کردبێت لە قەرەباڵغی بازاڕ. بە دوو چاوی ترسڕژاودا دەیڕوانی بەدوای ئەو کەسەی کە سۆز وخۆشەویستی دەداتێ.

گریانی منداڵەکە بەرز دەبێتەوە هەرچەندە چاویشی دەگێڕا بەو کچ وژنانەی سەرتاپایان لە رەش دا نقووم ببوو، لە دیمەنێکی نامۆی ئەوتۆدا دەتوت لە هۆڵی تازیەدان و ماڵئاوایی لە ژیان دەکەن، پاش ئەوەی خۆیان لێی کشاندۆتەوە بەر لە ماوەیەکی درێژ. دوایی هێدی هێدی دەنگی گریانی

منداڵەکە نزم دەبووەوە بە دەم سەرسوڕمانی لەو هەموو ڕەشپۆشە کە وەک یاری خێوی لە یەك چوو لە یەکیان دەکرد.

یەکەم: هەست دەکەم چاوپۆشینی دەسەڵات لە نیقاب وپەچە داوەتێکی ڕاشکاوە بۆ هێزە تیرۆریستەکان کە خۆیان بشارنەوە لە وێنەی ئافرەتدا. وەك دەزانی دەیان ڕوداوی تیرۆرستی لە وڵاتەکانمان لەژێر ئەو پەردەیە ڕوویانداوە، بەڵام لەوە دەچێت جۆرێك لە تەواوکاری هەبێت لە نێوان دەبەنگی دەسەڵات و دەبەنگی پیاودا، پاش ئەوەی پیاوانی دینی پاکانە وبەڵگەگەلێکی لاوازیان بۆ نیقاب دۆزیەوە، کردیانن بە بەڵگەی حاشالێنەکراو، بەو شێوەیە بانگەوازی کردن بۆ تیرۆریزم و شاردنەوەی داوێنپیسی پیرۆزکران.

من ئێستا وتارێکی درێژی دکتۆر محمد شوقي الفنجري و وەڵامی گفتوگۆکەرانەیم لە بیرە [ ڕۆژنامەی القبس ی کوێتی لە ١٩٨٦/١٠/١٧] تیایدا بە بەڵگەی ئیسلامیەوە دەیسەلمێنێت، کە قابیلی ڕەتکردنەوەو لێکدانەوەی تر نین، کە نیقاب زۆر بە توندی مەکروهە. وەك زانراوە ئافرەتان لە دوای پێغەمبەر [د.خ] نویژیان دەکرد بە ڕوو دەرخستنەوە، وەحیش دانەبەزی داوای لێبکات دەموچاوی داپۆشی، سەرەرای ئەوەی پیاوان لە دەوروبەر و پێشیان هەبوون، هەبوو زوو دەهات و هەبوو دوا دەکەوت لە نوێژ. [بەڵکو لە یەک حەوزی ئاو ژن وپیاو دەستنوێژیان دەشوست بەبێ نیقاب- وەرگێڕ]

دووەم: هەست بە سوکایەتیەکی زۆر دەکەم کاتێ دەموچاوم دادەپۆشم ولەگەڵیشیدا ناسنامە و کەسایەتی و مرۆڤایەتیم زیندەبەچاڵ دەکەم، تەنها لەبەر ئەوەی پیاو نایەوێت کەس مولکی تایبەتی خۆی ببینیت.

باوەڕ دەکەیت کە هەندێ مونەقەبە کاتێ بڕوانامەی دەرچوونیان لە سەرانی دەوڵەت وەردەگرن رەتی دەکەنەوە تەوقەیان لەگەڵدا بکەن؟ باشە بۆ لە ماڵەوە دەردەچن، وبەژداری ئاهەنگی دەرچوون دەکەن لە بنەڕەتدا؟

هەتا زەردەخەنەی شادی یان پێکەنینی خۆشیان لێ قەدەغە کراوە، نەوەك پیاو توشی فیتنە بن، موچرکی سێکسی لەناو نێرینەکانی ئاهەنگەکە بڵاوبێتەوە، دواجار ئەرز وئاسمان بهەژێت لە گەورەیی ئەو تاوانە.

یەکەم: لە گرفتی پیاودا سەرم سوڕدەمێنێت، کە ڕۆژانە گوێی لە پێنج بانگ دەبێت، بەرەبەیان وبەیانیان و ئێواران بۆ خوا لەسەرپی ڕادەوەستن، قورئان دەخوێنیتەوە و دەبیستێت، فێری زاڵبوون بەسەر خۆیدا دەکرێت، داب ونەرێتی کۆمەڵایەتیش ڕێی پێ دەگرێت، ترس لە خوا و لە ویژدانیش پەروەردەی دەکات، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا وادەزانێت ژێرەوەی بەستراوەتەوە بە سەرەوەی، و شەهوەی سێکسی لە خەیاڵیدایە، چاوەکانیشی لە ژندا بەدوای هاوبەشیە مرۆییەکان ناگەڕێت، بەڵکو یەکسەر بازدەداتە سەر چوارپایە هەر کە زانی پیاوێك لە ئافرەتێك دەڕوانێت. ئێمەی قوربانی نەخۆشی پیاو و لاوازی ئەو و بێ متمانەیی ئەو بە پیاوانیترین، هەندێ جار دەبینە قوربانی سەرشێتانەی شاردنەوەی پیاو بۆ تاوانەکان و ئارەزووەکانی ئەوین، دەموچاوی ئێمە دەشارێتەوە تا خۆی ئاشکرا نەبێت لەناو کۆمەڵدا.

پیاو زۆربەی جار داوای شاردنەوەی ڕوخساری ژن دەکات بۆئەوەی خۆی بشارێتەوە، نەك ئەو بشارێتەوە.

چاو دەنوقێنێت لە زیانەکانی شاردنەوەی دەموچاوی ئافرەت لەسەر خێزان و بەهای شەڕەف وکەرامەتی ئافرەت. کاتێ پیاو قسەی دێرینەکان لێکدەداتەوە، و نوسینی کەسانێك دەخوێنێتەوە کە بەر لە هەزار ساڵ ئێسک وپروسکیان نەماوە، هەر بە ئەنقەست عەقڵی دەخاتە لاوە، و کرنۆش بۆ پیاوگەلێك دەبات کە لە ژیانیدا نەیدیون وەك چۆن کرنۆش بۆ خاوەنشکۆی وڵات دەبات.

تۆ سەیرت نایەت بە شەڕە بێ کۆتاییەکانی پیاوان لەسەر ڕوداوگەلیك کە زۆر دەمێکە ڕویان داوە وبەسەرچوون، یان گفتوگۆ و ناکۆکی سیاسی و عەشایەری کە چەندین سەدەی بەسەردا چووە؟!

دەست لە دەست نادەیت و خەم لە نا جوامێری و بێ عەقڵی پیاوان ناخۆیت کاتێ کردەی کوشتن و سەربڕین و تایفیەت دەکەن، وئێمەی ئافرەتی لاوازیش نرخی هەڵەشیی پیاوان و لێکدانەوە دەبەنگەکان و دەق پەرستی دێرینەکانی پیاوان دەدەینەوە؟

دووەم: ئەگەر دەقی یەکلاکەرەوە [قاتیع] و پیرۆز نەبا، دەمگووت کەوا دایکە حەوا بنچینەی دروستکراوانە، و و پیاو لە پەراسوێکی چەماوەی ئافرەت دروست بووە.

من لەتۆ زیاتر توڕەم لەو لێکدانەوە نیرسالاریانە بۆ جیهانی ئافرەت، ڕەتی دەکەمەوە دانیشم فەتوانامەکانی ئافرەتان بخوێنمەوە کە پراوپڕن لە کتێبە کۆن ونوێکان، وڕۆژنامە وگۆڤارەکان وکەناڵە ئاسمانیەکان، وەك بڵێیت پیاو کێشەی کۆتایی هاتوە لەگەڵ دەسەڵات، و دەسەڵاتی مرۆیی وخێرخوایی سەپاندوە، وستەمی لە کۆڵ ستەملێکراو و گیراوان کردۆتەوە، یاساگەلیکی دەرکردوە لە دژی لاقەکردنی ئافرەتان، یان گێچەڵی سێکسی بە منداڵان.

پیاو ملی شۆڕ دەکات بۆ هەموو نوێنەرێکی دەسەڵات، کاتێکی دەگەڕێتەوە ماڵەوە بە زەبری مۆڵەتی ئاسمان هەژموون وکەڵەگایەتی خۆی دەسەپێنێتە سەر ئافرەت.

یەکەم: گرتەیەکی ڤیدیۆیی پیاوانم دیت کاتێ ئافرەتێکی زیناکەریان [لەگەل پیاوێك هەڵبەتە] بەردباران دەکرد، خۆزگە نەمدیبا.

قەسوەت وبێ بەزەیی ڕوون وئاشکرا بوو لە ڕوخساریان وەك بڵێی ویژدان و سۆزی دەبەنگانەی خۆیان رەجم بکەن، یان وەك بڵێی بیانەوێت پەلە بکەن لە شاردنەوەی تاوانەکانیان لە لاشەی ئەوە ئافرەتەی کە لەگەڵ بەرکەوتنی هەر بەردیك ئاهوناڵەی بەرز دەبووەوە.

دووەم: بەڵکو رەجمکردن بە وشە و نیگای گوماناوی و ئەوامر و نەواهی زۆر دڵ رەقانەترن لەوەی بۆ منی باس دەکەیت. ئێمەی ئافرەتان لەبەردەم بەرپرسیاریەتێکی گەورە داین بۆ ڕزگار کردنی پیاو لە هەوەسی سێکسی، و کۆیلایەتی بۆ دەسەڵات، وڕقلێبوونەوەی لە خۆی، و ڕزگارکردنی لە جیهانی موزایەداتی دینی، کە دینی پیرۆز لە جوانی و کەمالی و ناوەرۆکی دادەماڵیت بۆ توێکڵ و دەبەنگی و بێ عەقڵی.

یەکەم: بەڵکو پیاو پیویستە بەر لە هەر شتێك فێر بیت کە خوای بەدیهێنەری ئەرز وئاسمان لەوە گەورەترە ستەمی بخەینە پاڵی، کە ستەمی لە خۆشی حەڕام کردوە.

پیاو پێویستی بە چارەسەرێکی خێرا هەیە بەرلەوەی بونەوەر وێران بکات، وخۆشی وێران بکات و پەرستگاکە بسەر هەمووواندا بروخێنێت.

تا ئێستا شۆك بەری نەداوم کاتێ قسەی لاوێکم خوێندەوە، کە دەڵیت کاتێ کچێك یان ئافرەتێك دەبینێت بە دڵی بێت، لە خەیاڵیدا وێنای دەکات کە ئەوە حۆریە، هەر لە خەیاڵیدا سێکسی لەگەڵدا دەکات، وادەزانێ، و لەو باوەڕە دایە کە هەردوکیانی چنگ دەکەوێت: چێژ وخۆشی شەهوەتی خەیاڵی، و پاداشتی باوەڕی کە بەو زوانە دەکەوێتە باوەشی حەفتا وسێ حۆری، بەڵکو یەکێ لە فەقیهەکان گووتی، پیاو لە حاڵەتی ڕەپبوونی بەردەوام دەبێت لە بە هەشتی نەمردا.

دووەم: ئێستا دەبێت بەجێت بێڵم چونکە مەوعیدێکم هەیە لەگەڵ یەکێك لە پاسەوانانی فەزیڵەت و رەوشت، فەرمانی پێکردم دەموجاوم بە

**خیمار داپۆشم هەتا خەیالی جاویشم دەرنەکەوێت، چونکە ئەو ژندارە، وترسی ماڵ وخێزانەکەی هەیە، ونازانێت ئەوەی ئەو دەیکات، برام و لەوانەیە باوکیشم بیکەن! ئەوە بازنەیەکە لە نیفاقی کۆمەڵایەتی و مل و سەر خستنە قوڕە نەك تەنها خۆڵ.**

**یەکەم: خوشکی بچوکم من بانگت دەکەم بۆ پابەندبوون بە بەها وپرنسیپەکان و خێر و شەرەف، ئەو کاتە پیاو نێچیری وا بە ئاسانی دەست ناکەوێت.**

**دووەم: لەو حالەتەدا من نیقابەکەم هەڵدەگرم و دەموجاوم دەردەخەم، چونکە منیش خوا خولقاندوومی، ڕوحی خۆیمی تی خستوە. تەنها نیگایەك بۆ دیمەنی زەوی داماو کە لێوان لێوە لە شەڕ وتایفەگەری و هەژاری دەمانگەیەنێتە ئەو بروایەی کە زۆرترین ئەهلی دۆزەخ لە پیاوانن.**

## ناميلكەی چۆنيەتی ڕەفتاركردن لەگەڵ كەنيزەكانی داعش[٧٠]

بەپێی ڕۆژنامەی ئیندیپێندت لە ٢٠١٤/١٢/١٠، داعش لەو مانگەی ٣ دیسەمبەری ٢٠١٤ نامیلکەیەکی دەرکردوە بە ناونیشانی: (سؤال و جواب في السبي و الرقاب(، کە لە دیوان البحوث و الافتاء لە محرم ١٤٣٦ هـ دەرچووە، هەرچەندە مێژووەکە دەکاتە نۆڤەمبەری ٢٠١٤، ئەوە کیشە نیە، ئەو نامیلکە یە گرنگە دەرچوە بۆ ڕێگا نیشاندانی داعشیەکان و چۆنیەتی رەفتارکردنی سێکسی بە پلە یەك لەگەڵ کەنیزە دیلەکان.

نامیلکەکە لە ٣٢ پرسیار پێك هاتووە لە لایەن [زانایانی] سەلەفیەتی داعش دەرچووە، وهەموو پرسیارەکانیش بە پێی ئایەت وحەدیس و فەهمی سەلەفی سالح وەڵام دەدرێتەوە، ئەوە چەند نمونەیەکە لە پرسیار و وەڵامەکان، لەگەڵ کورتە کۆمێنتێکی خۆم:

### پ ١: سەبی [دیلی کەنیزەك] چیە؟

**و**: ئەو ئافرەتانەیە موسڵمانان بە دیلیان دەبەن لە ئەهلی جەنگ. [یەزیدیە قوڕبەسەرەکان ئەهلی جەنگ بوون، یان ئێوەی درندە لەناکاو بەسەریانتان دا دا.

### پ ٢: چی کەنیزەك حەڵاڵ دەکات؟

**و**: کافر بوونیان حەڵاڵ یان دەکات، ئەو ئافرەتە کافرانە دەبنە حەڵاڵمان، پاش دابەشکردنی ئیمام، وپاش گرتنیان وهێنانیان بۆ ناو دار الاسلام! [ئەی بۆ موسڵمان بوونیان ئازادیان ناکات.

### پ٣: ئایە سەبیکردنی [بە کۆیلەگرتنی] هەموو ئافرەتە کافرەکان جائیزە؟

---

(٧٠) ئیسلام پەیك ، ١٢/١٦/٢٠١٤.

**و**: هیچ ناکۆکیەك یە لە نێوان زانایان لەسەر ڕەوایەتی سەبیکردنی [بە کۆیلەگرتنی] هەموو ئافرەتە کافرەکان، کوفری ڕەسەن وەك کیتابیەکان [مەسیحی و جولەکە] و وەسەنی [بێ دینەکان ] ، بەڵام ناکۆکیان هەیە لەسەر سەبیکردنی ئافرەتی هەڵگەڕاوە، جمهور دەڵێن جائیز نیە، و بەڵام هەندێ ئەهلی عیلم سەبیکردنی ئافرەتی هەڵگەڕاوەیان جائیزیان کردوە، ئێمە رای جمهورمان لا پەسندە، خواش باشتر دەزانێت [یاعيني، بەڵام سوپای وەهابی بەدەوی ئافرەتی موسڵمانەکانی لادێکانی دەوروبەری خۆشیان بە کۆیلە دەگرت.

## پ٤: جائیزە سێکس کردن لەگەڵ کەنیزەك؟

**و**: بەڵێ جائیزە، خودا دەفەرموێت: ( والذين هم لفروجهم حافظون، إلا على أزواجهم أو ما ملكت أيمانهم فإنهم غير ملومين ، فمن ابتغى وراء ذلك فأولئك هم العادون ( سورة المؤمنون، [ما ملكت أيمانهم] یانی کەنیزەك! (بەڵێ دەزانین یا شێخ بەو مانایە دێت).

## پ٦: ئایە فرۆشتنی کەنیزەك جائیزە؟

**و**: جائیزە فرۆشتنی و کڕینی و بە دیاری دانی کەنیزەك وسەبایا، چونکە ئەوان مولکی ڕووتن، دەتوانیت مامەڵەی پیبکەیت بەبێ مەفسەدە و زیان پێ گەیاندن زیان لەوە زیاتر دەبێت چی بێت، مرۆڤ بکەیتە مولکی ڕووت وڕەهای خۆت وەك تەسبیحێك بیکڕی وبیفرۆشی وبەدیاریش بیبەخشی.

## پ١٣: جائیزە لەگەڵ کەنیزەکیك بخەویت کە بالغ نەبوویێت؟

**و**: سیکس کردن لەگەڵ کەنیزەکی نابالغ جائیزە ئەگەر گونجاو بوو بۆ سەرجێی (چۆن گونجاو بوو مەولانا) ئەگەر ناگونجاو بوو، دەشێت چێژی لی وەرگریت جگە لە سێکس کردن. (قوربەسەر منالانی ژێردەستیان! ئەوە چ

نامرۆییەک وگەوادیەکە بەناوی دین؟! گوو بە شەڕەفی خۆتان و ئەو فیقهە و ئەو فەقیهانەشی کە شتی وا لە مێشکی گواویان دەرچووە).

## پ٢٠: حوکمی کەنیزەکی ڕاکردوو لە سەرداری چیە؟

**و**: ڕاکردنی کۆیلەی پیاو و کەنیزەکی ئافرەت لە گوناهە گەورەکانە یانی کەبائیرە [چاوی منی، گوناهە ڕاشبکات؟!] لە منصوری کوڕی عبدالرحمن ەوە لە الشعبي لە جریرەوە گوێی لێبوە دەڵێت: هەر بەندەیەك رایکرد لە خاوەنەکانی ، ئەوە کافر دەبێت تا دەگەڕێتەوە!! [ئەی ئەگەر کافر نەبوو، کوفرەکەی دوجا وسێجا دەبێت؟! کە کافر بوو کەبائیر چیە؟! ئەگەریش کافر نەبێت بۆ کراوەتە کۆیلە؟! ئەو حەدیسە هاتوە بۆ جەختکردنەوە لەسەر کۆیلایەتی و پاراستنی مافی کۆیلەداران، دەشڵێن ئیسلام هاتوە خەڵك دەربهێنێت لە عیبادەتی عیباد بۆ عیبادەتی خوا).

## پ٣٢: ئایە مەرجە بۆ ئازادکردنی کەفارەت، ئەو کەنیزەکە ئیماندار بێت؟

**و**: فەقیهەکان یەك ڕان لەسەر ئەوەی کەفارەتی کوشتن دەبێت کەنیزەکە ئیماندار بێت، ناکۆکن لە کەفارەتی سوێند خواردن و ظیهار و جیماع لە ڕۆژی ڕەمەزان، جمهور پێیانوایە ئەو ئازادکردنە بەهیچ ناچی بۆ کەفارەت، تەنها ئەگەر ئەو ملەی ئازاد دەکرێت ئیماندار بێت، حەنەفیەکان پێیانوایە وەك کەفارەت شیاوە ئەگەر ئەو ملە ئیمانداریش نەبێت تەنها لە کەفارەتی کوشتن نەبێت، دیارترین وبەسندترینی ئەو دوو قەولە، قەولی جمهورە.

ئەوە کورتەیەک بوو لە زانستێکی نیمچە ونکراو لە بابەکانی فیقهی هاوچەرخ [هەی خوا ئێوە و ئەو زانستەش وون کات] خواش زاناتر وداناترە.

خۆزگە هەموو موسڵمانێك بە ڕاشکاوانە و بێ پێچ وپەنا دەیگووت: توخوا شەرم لە ختان ناکەنەوە ئەو پۆخلەواتانە لەناو دینتان دابێت؟!! من بەش بە حاڵی خۆم شەرمم پێ دێتەوە، و بەهیچ شێوەیەکیش ئەو نامرۆییەم قبوڵ

نییە بە ناوی خوا و دین، پێموایە ئەو دەقانە گوزارش لە قۆناغێکی مێژوویی دەکات و بەسەرچوو، خوا ئەوانە بکوژێت کە هەوڵی زیندووکردنەوەی دەدەن، ئەوە ڕای منە، ئێوەش کەیفی خۆتانە.

## سەرچاوە:

http://www.independent.co.uk/news/world/middle-east/isis-releases-abhorrent-sex-slaves-pamphlet-with-٢٧-tips-for-militants-on-taking-punishing-and-raping-female-captives-٩٩١٥٩١٣.html

## ٢- وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان

- وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان ١-٣
- وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان ٢-٣
- وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان ٣-٣
- ئەرستۆ وەك دامەزرێنەری فەلسەفەی چەوسانەوە و نزمێتی ئافرەتان

## وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان[٧١]

## ١-٣

هەمووومان دەزانین کە بزاڤتی رەخنەیی لەناو چوارچێوەی مەزهەبی شیعیدا زۆر لاوازە، زۆر جاران وا هەست دەکەیت دەڵێیت هاوپەیمانیەتێك هەیە لە نێوان هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگا شیعییەکان بۆ بەرز راگرتنی بەڵگەنەویست و ڕاستییە مەزهەبییەکان و، دەرنەچوون لێی بەهەر نرخێک، بۆیە دەبینین زۆر لە رۆشنبیرانی شیعە حەزێکی نیمچە نەخۆشیان هەیە بە ڕەخنەگرتن لە خەڵکانی تر، لە وەهابیەکان بە تایبەتی وئەهلی سونە بە گشتی، ئەو حەزە میزاجیە مەزهەبیە لە ژێر کاریگەری فەرهەنگی و مادی زۆر لە ڕۆشنبیر و موتەشەیعەکانی بەناو سونەش پیادەی دەکەن، من خۆم کە هەزاران ڕەخنە دەگرم لە سەلەفیەت، کەسانێکی کوردی موتەشەیع پێیان خۆشە و دەستخۆشیم لێدەکەن، بەڵام کە ڕۆژێك رەخنەیەکم دەگرت لە شتێکی شیعە، چەندین موتەشەیعی کورد لیم تووڕە دەبوون، نەیاندەزانی چۆن وەڵامم بدەنەوە! سەیر لەوەدایە ئەوەی ئەوان پێی دلخۆش دەبن و رەخنەی لێدەگرن لە دژی سونە، هەمان ئەو شتانە زۆرجار بە زیادەوەش لەناو دەقە بێ شومارەکانی سەرچاوە شیعیەکان هەیە، بەزیادەوەش، بەڵکو گومانم نیە ئەگەر چەند دەقێك لە سەرچاوە شیعیەکان وەرگرین وبڵێین ئەو دەقانە لە بوخاری هاتوە یان موسلیم، تا ماندوو دەبێت پێی دڵخۆش دەبیت وگالتەی پێ دێت، بەڵام هەر کە وتت سەرچاوەی ئەو دەقانە شیعین، بزانە چۆن لە جەڵتە نزیك دەکەوێتەوە.

هۆی سەرەکی نەبوونی بزاڤتی ڕەخنەی ناوەکی باڵادەستی عەقلیەتی دەقگەرایە لە کۆمەڵگای شیعیدا کە دژی رەخنە دەجەنگێت، وادەزانێت بەو شێوەیە دەتوانێت بوونی خۆی بپارێزێت، کەچی لە ڕاستیدا تەنها پارێزگاری

---

(٧١) ئەو بابەتە لە ماڵپەڕی ستاندەر بەزنجیرە بەسێ جار بڵاوکرایەوە ، ستاندەر ، ٢٠١٥/٠٥/١٤.

لە دواکەوتوویی خۆی دەکات. تلانەوەی ئافرەتیش بەدەست کۆمەڵگایەک تێیدا عەقڵیەتی دەقگەرا باڵا دەست بیت، تەنها رووێکە لە رووەکانی کێشە وئازارەکانی کۆمەڵگا دینی بەرێوە چوو بەو عەقڵیەتە دەقگەرایە.

هۆیەکی تری نەبوونی ڕەخنەی ناوخۆیی جیدی ئەوەیە کە ڕەخنەی ناوخۆیی پێویستی بە ژینگەیەکی هێمن ودوور لە کێشمەکێش هەیە، کە رەخنەگر هیچ مەترسیەك نەبینێت لە پڕۆسێسی رەخنەگرتن ببێتە هۆی هەڕەشەی بوونی وجودی، ئەو ژینگەیەش بوونی نیە لە کۆمەڵگا شیعیەکان، لەبەر بەردەوامی خەریك بوون بە شەڕی شیعە وسونەدا.

من هیچ جیاوازیەك نابینم لە نێوان تێڕوانین و کۆی جیهانبینی شیعە و سوونە بۆ ئافرەت، کە لە هەردوو ترادیسیۆن مەحکومی دەقن، سەرەڕای داب ونەریتێکی دێرینی نادۆست بە ئافرەت. ئافرەت لەلایەن ئەو جۆرە عەقڵیەتە دەقگەرایانە بە سونە و شیعەوە هەردەم دەڵێن ئیسلام ڕیزی لە ئافرەت ناوە وزۆری بەرز ڕاگرتوە، بەڵام ئەوە ناڵێن بۆ بەرگری کردن لە مافی ئافرەتان، بەلکو بۆ بەرگری کردن لە دەقەکانیان، ئەو شتانەیان تەنها کردۆتە دروشم، بەڵام کاتێك دەروانیتە واقیعی حاڵی ئافرەت لەو کۆمەڵگایە دینیانە، دەبینیت واقعێکی دواکەوتوو مەحکومە بە تێڕوانێکی نێگەتیڤ بۆ ئافرەت، بۆیە دەبێت ڕەخنە لەو عەقڵیەتە دەقگەرایە بگیرێت کە ئەو بارە نیگەتیڤەی بەرهەم هیناوە، پێویستە هەوڵدەین ئافرەت داماڵین لە هەندێك لەو کۆت وبەندانە.

وەك دەزانین شیعە چ تێڕوانینێکی هەیە بۆ حەزرەتی عەلی، وەك ئیمامی یەکەمی مەعسوم لە هەڵە و گوناهـ و وەك دامەزرێنەری یەکەمی شیعەگەرایی، زۆرجار ئەو خەملاندنە دەگاتە ئاستی نەك بە پێغەمبەرکردنی، بەڵکو تەئلیهو خوادەوەند کردن! کەوابوو ڕای حەزرەتی عەلی دەربارەی ئافرەت یانی ڕای تێکڕای مەزهەبی شیعی لەو بارەیەوە.

چونکە عەلی یش کوڕی هەمان ئەو ژینگەیە بووە کە حەزرەتی عومەر وئەبوبەکر و ابو هريرة و عەبدوڵلای کوڕی عومەری لێ پەروەردە بوە،

هەمان تێڕوانینی باوی هەبووە بە ئافرەت، ئەگەر دەقەکان بەڕاستی لەوەوە دەرچووبن. هەموومان دەزانین کە مەنزیلە وپایەی کتێبی نهج البلاغة لای شیعەکان، وەك پایەی تەلمودە لای جولەکەکان، تا ئێستا ٣٧٠ کتێبی لەسەر نووسراوە لە نێوان شرۆڤە و لێکدانەوە و تەفسیر و وەرگێڕان.

بەڵام هێشتا زاناگەلێکی ئەهلی سونە بە هەڵبەستراوی دەزانن وەك ئبن تەیمیە و زەهەبی وزۆرانی تریش، بەڵام بە دیوەکەی ترەوە زانایانی شیعە تەقدیسی دەکەن و دەڵێن لە پاش قورئان و حەدیسی پێغەمبەر دێت! هەر بۆیە سەرەڕای بوونی فەرمودەگەلێکی زۆری حەزرەتی عەلی کە هەڵگری نێگەتیڤترین تێروانین وبۆچوونە دەربارەی ئافرەت، گوێت لە زانایەکی دینی شیعی نابێت نکوڵی لە هەقیقەتی ئەو قسانە بکەن بە نسبەت دەرچوونی لە حەزرەتی عەلیەوە. بەڵکو پینە وپەڕۆ و تەئویلاتی سەیر سەیری بۆ دەکەن بەشێوازی هەر دەقگەرایەك، کە زۆرجار ئافرەتان قەرزاریش دەبنەوە، گوایە ئەو قسە نێگەتیڤانە هەمووی پۆزەتیڤن، بەڵام ئەوان لێی ناگەن! بۆیە شێخ عەلی کورانی شیعی دەڵێت ئەو هەموو رەخنە و زەمەی ئافرەت کە لە نهج البلاغەدا هاتوە دژی ئافرەت، مەبەست لە عائشەیە، نەك هەموو ئافرەتێك؟!

١U&hd=٨https://www.youtube.com/watch?v=p_NcYOPfL

بەڵام ئەو قسەیە خۆی ناگرێت لەبەرامبەر ئەو فەرمودانەی کە هاتوون و گشتگیریەکی ڕەهای تێدایە دەربارەی سەرکۆنەکردنی ئافرەت وسوکایەتی پێکردنی و بە نزم سەیر کردنی. زانایەکیتر کە لێی دەپرسن بۆ حەزرەتی عەلی وا زەمی ئافرەتی کردوە، سەد شێر وڕێوی دەهێنێتەوە بۆ پاکانە هێنانەوە بۆ قسەکانی حەزرەتی عەلی بەڵام بێ سوودە، چونکە دەقەکان لە توانای کەسدا نییە تەئویلی بۆ بکرێت یان بیشارێتەوە، ئینجا کەسانیتر لە زانایانی شیعە بە ئاشکرا دەڵێن مەبەستی هەموو ژنێکە کە زۆربەیان زەمکراون.

خوئی دەڵێت: " ئەو هەواڵانەی هاتوە لە بارەی زەمکردنی ئافرەتان بە ڕەهایی، لەسەر زۆربەی هەرە زۆریان جێبەجێ دەبێت، دەنا ئافرەتانێک هەن کە لە ناو پیاوانیش وەك ئەوان زاهید و پڕهێزکار وبەتەقوا کەمن."

الشيخ الميرزا حبيب الهاشمي الخوئي: منهاج البراعة في شرح نهج البلاغة، ج ٥. ص ٣١٣.

کەوابوو ئەوان پێیان وایە ئەو قسانەی حەزرەتی عەلی دەربارەی ئافرەت فەرموویەتی لەبەر ئەوە نیە کە ڕوویدا لە نێوان ئیمام و حەزرەتی عائیشە، تایبەت نیە بە عائیشە، بەڵکو شمولی هەموو ئافرەت دەکات.

موسەوی دەڵێت: " ئەو قسە وهەڵوێستانە لەسەر [عائیشە] جێبەجێ دەبن و لەسەر غەیری ئەویش، هەرچەندە ئەو هۆکاری وتنیانە!" ص٤٧ صورة المرأة في التراث الشيعي، عن عباس علي الموسوي، شرح نهج البلاغة، ج١، ص ٤٥١

ڕاستیەکەی قسەکانیش جۆرێك لە گشتگیری و هەموواندنی تێدایە کە ناکرێت بەرامبەر تاقە ژنێك گووترا بێت، هەرچەندە دەکرێت کاریگەری شەڕی عائیشە لە دژی عەلی بەسەر هەندێ لەو بیروڕایانەوە هەبێت.

الكوراني ذم النساء في نهج البلاغة المقصود به عائشة.

## وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان[٧٢]
## ٢-٣

کێشەی عائیشە و عەلی یش هەرچەندە بابەتی ئێمە نییە لێرەدا باسی بکەین، بەڵام بەپێی ئەو هەواڵانەی سەرچاوە شیعیەکان و ئەو هەواڵە بێت کە لە سەحیحی بوخاریدا هاتووە، چەند ڕەهەندێکی ئەو بابەتە ئاشکرا دەکات: یەکەم: لەوە دەچێت جۆرێك لە حەساسیەت و کێشەی پەنهانی هەبوو بێت لە نێوان حەزرەتی عەلی و حەزرەتی عائیشە، دەنا ئەو هەڵوێستەی عەلی هیچ پاساویکی بۆ ناکرێت، دووەم: ئەگەر ئەو کێشە پەنهانیە نەبوو بێت، کەوابوو ئەو زیادەڕۆییەی کە شیعە و بەشێکیش لە سونەش دەیکەن دەربارەی حیکمەتی بێ سنووری حەزرەتی عەلی، لەوە ناچێت واقیعی بوو بێت، سەرەڕای ڕیزی بێ پایانمان بۆی، بەڵام من نامەوێ بە شێوازی عاتیفی مێژوو بخوێنمەوە، چونکە ئەو هەڵوێستەی هیچ حیکمەتێکی تێدا نییە. سێیەم: ئەو هەواڵانە دەیسەلمێنێت کە تێڕوانینەکانی حەزرەتی عەلی دەربارەی ئافرەت کە لە نهج البلاغەدا هاتوون زۆر ڕێی تێدەچێت ڕاست بن! چونکە وەك لە حەدیسەکەدا هاتووە، پاش بڵاوبوونەوەی ڕووداوی الافك، عائیشە دەگێڕێتەوە کە چۆن شەو و ڕۆژ گریاوە لە پای ئەو بوهتانەی کە پییان کردبوو، ئینجا پێغەمبەر [د.خ] بانگی حەزرەتی عەلی و ئوسامەی کوڕی زەید دەکات، کاتێ وەحی خاو بووبوەوە و پرس وڕایان پێ دەکات بۆ جیابوونەوە لە عائیشە، ئوسامە وەڵامی دایەوە بەوەی دەیزانێت لە بێ گوناهی عائیشە وپاکی ئەو، و هەروەها بەو خۆشەویستیەی پێغەمبەر [د.خ] هەیەتی بۆ عائیشە، گووتی: ژنی خۆتە و لە چاکە وخێری زیاتر نازانین [بڕوانە حیکمەتی ئوسامە] بەڵام عەلی کوڕی تاڵیب گووتی: ئەی پێغەمبەر [د.خ] ی خوا، خودا دەرووی لی تەنگ نەکردوویت، غەیری ئەو ژن زۆرن، ئەگەر پرسیار لە کەنیزەکەی بکەی ڕاستت پێ دەڵێت[....

---

(٧٢) ستاندەر، ٢٠١٥/٠٥/١٧ .

[قالت: فبكيت تلك الليلة حتى أصبحت لا يرقأ لي دمع، ولا أكتحل بنوم حتى أصبحت أبكي، فدعا رسول الله - صلى الله عليه وسلم - علي بن أبي طالب وأسامة بن زيد - رضي الله عنهما - حين استلبث الوحي يستأمرهما في فراق أهله، قالت: فأما أسامة بن زيد فأشار على رسول الله - صلى الله عليه وسلم - بالذي يعلم من براءة أهله وبالذي يعلم لهم في نفسه من الود، فقال: يا رسول الله، أهلك ولا نعلم إلا خيرا.

وأما علي بن أبي طالب فقال: يا رسول الله، لم يضيق الله عليك، والنساء سواها كثير، وإن تسأل الجارية تصدقك[....

ئەو وەڵامەی حەزرەتی عەلی لەوانەیە بۆ پێغەمبەریش ناخۆش بوو بێت، چونکە دەیزانی کە چۆن پێغەمبەر [د.خ] عائیشەی پەسند دەدا بەسەر هەموو ژنەکانیتری! تۆ تەسەور کە خێزانێکی نزیك لە تۆ کە هاتوو چۆت هەبیت لەگەڵیان، و باش دەیانناسیت، لە ڕووی مرۆیی و ڕەوشتیەوە. رۆژێك ئەو خێزانە تووشی تەنگژەیەکی خێزانی بوون، گەیشتە سەر تەڵاق، تۆ وەك کەسێکی نزیک لەو خێزانە، هەوڵ دەدەیت نەگاتە تەڵاق، کە دەزانیت هەردوولا یەکتریان دەوێت، یان هانی تەڵاقدانی ژنەکە دەدەیت؟! دووەمیش ئەو هەڵوێستە جۆرێک لە سوك سەیرکردنی ئافرەتی تیدایە هەتا لە ئاستی عائیشەش بێت، کاتێ دەڵیت: چ زۆرە ژن زۆرە! عائیشە ئەگەر تا دوا ڕۆژیشی ئەوەی لەبیر نەکردبێت ناهەقی ناگیرێت وەك ئافرەتێك کە عەلی وەك کەسێکی ماڵەوە بوو دەیزانی قسەوقسەلۆکێکی وا لە عائیشە و خێزانە بەڕێزەکەی ناوەشێتەوە، کەچی زۆر بەشێوەیەکی نامۆ هانی پێغەمبەری دا بۆ تەڵاق دانی عائیشە، بێ ئەوەی موراعاتی هەستی عائیشە و باوکی کە حەزرەتی ئەبوبەکر بوو، و هەتا هەستی پێغەمبەریش بکات کە زۆر عائیشەی خۆش دەویست، هەمووی بە قسە وبوهتانی چەند ناحەز و ساویلکەیەك بەو هەموو حیکمەتەیەوە کە باسی دەکەن، باوەڕی کردبوو! بۆیە ئەگەر ڕیوایەتەکان ڕاست بن، بە ڕیوایاتی شیعە و بوخاریشدا، دەسەلمێت کە تێڕوانینی حەزرەتی عەلی بەرامبەر ئافرەت هیچ

کاریگەریەکی ئیسلامی قووڵی بەسەردا نەبووە و گۆڕانکاریەکی ئەوتۆی تێدا نەبووە لەوەی لەناو عەرەبدا باو بووە دەربارەی ئافرەت.

من ناڵێم هەموو ئەو قسانەشی کە لە خوارەوە باسیان دەکەین، هەمووی هی حەزرەتی عەلی بن، بەڵام بێگومان بەشێکی هی ئەون. بەڵکو پێموایە هەر لە بەرایی ئیسلامدا ئەوانەی بایەخیان بە حەدیس دا و وەک مەرجەعیەتێکی هاوتای قورئان دایانمەزراند، خەڵکانێکی زۆر لە ژێر کاریگەری داب ونەریتی عەرەب و کاریگەری فەرهەنگی جیهانی باوی حەزارەتی یونانی و هیندی و ئایینە ئاسمانیەکانی کە ئەوانیش لە ژێر کاریگەری وتاری فەلسەفی یۆنانی بوون، هاتن سەدەها دەقیان دروست کرد لە دژی ئافرەت بۆ شەرعیەتدان بەو بیروباوەڕە باوەی کە لە جیهانی ئەو کاتە هەبوون و باو بوون لە دژی ئافرەت. ئەو حالەتە لە هەردوو لای سونی و شیعی شان بە شانی یەك بوون، ئەگەر سونە وشیعە هەتا لە تێروانینیان بۆ خوا و پێغەمبەریش چون یەك نەبن، ئەوە لە تێڕوانی نێگەتیڤیان بۆ ئافرەت یەکسانن وبە موو جیاوازیان نییە، تەنها لە چەند وردەکاری فیقهی نەبێت!

لێرەدا ئەو وتانەی حەزرەتی عەلی باس دەکەین کە لە نهج البلاغة دا هاتووە دەربارەی ئافرەت:

١ -لە وتارێکیدا لە سەرکۆنەکردنی شوێن کەوتوانی لەبەر بە گوێ نەکردنی دەڵێت:

(یا أشباه الرجال ولا رجال ، حلوم الأطفال وعقول ربّات الحجال ) . [ئەی نیمچە پیاوانی نا پیاوان، خاوەن خەونی منداڵان و عەقڵی ئافرەتانی ناو کەژاوەکان]  ص ٧٠ الشريف الرضي (الجامع) ، نهج البلاغة ، تعليق وفهرسة د. صبحي صالح، الطبعة الاولى بيروت ١٩٦٧. هەموو نمونەکان لە دواییدا لەو سەرچاوەیەوە وەردەگیرێت، تەنها ئاماژە بە ژمارەی لاپەرە دەکەین.

الحجال: کەژاوەیەک بوو ئافرەتان لە ماڵەوە بە پەردە دەیان کرد و دەیان رازاندەوە. ربات الحجال مەبستی خاوەن کەژاوەکانە کە ئافرەتن.

وەك دەبینیت چۆن سەرکۆنەی پیاوەکانی دەکات بە سووکترین سیفات کە نیمچە پیاوانن، خاوەن خەونی منداڵان و عەقڵی ئافرەتانن!

٢ -لە وتارێکیدا کە لە پاش شەڕی الجمل داویەتی، ئەگەر ڕاست بێت لە دژی سەرکردایەتی لایەنی دژ بوو کە ئافرەتێك [حەزرەتی عائیشە] سەرکردایەتی دەکرد، و دەڵێت : ( معاشر الناس ! إنّ النساء نواقص الإيمان ، ونواقص الحظوظ ، ونواقص العقول ، فأمّا نقصان إيمانهنّ فقعودهنّ عن الصلاة والصيام في أيام حيضهنّ ، وأمّا نقصان عقولهن فشهادة امرأتين كشهادة رجل الواحد ، وأمّا نقصان حظوظهنّ فمواريثهنّ على الأنصاف من مواريث الرجال فاتقوا شرار النساء وكونوا من خيارهن على حذر، ولا تطيعوهن في المعروف حتى لا يطمعن في المنكر) .ص ١٠٥-١٠٦

[خەڵکینە، ئافرەتان باوەڕ نوقسانن و بەش نوقسان و عەقڵ نوقسانن، نەقسی باوەڕیان لەبەر ئەوەیە نوێژ ناکەن و بەڕۆژوو نابن لە ڕۆژانی حەیزدا. عەقڵ نوقسانیشیان شایەدی دوو ئافرەت بە یەك شایەدی پیاوە. نوقسان بەشیشیان دەبینن میراتیان نیوەی میراتی پیاوانە، بۆیە خۆتان بپارێزن لە ئافرەتی خراپ و لەگەڵ باشەکانیشیان بە ئاگاداریەوە مامەڵە بکەن، لە کاری چاکیش بە گوێیان مەکەن، تا تەماعی لە خراپە نەکەن!] لەوە دەچێت زۆر پڕ بوو بێت لەاوەی ئافرەتێك، کە لە توراسی عەرەبی نرخی قونکە پیازێکی نییە، چۆن لەگەڵی بچێتە ئەو جەنگە خوێناویەوە، بۆیە لە سنووری شەرع و عەقڵیش دەردەچێت کاتێ دەڵێت: " بۆیە خۆتان بپارێزن لە ئافرەتی خراپ و لەگەڵ باشەکانیشیان بە ئاگاداریەوە مامەڵە بکەن، لە کاری چاکیش بە گوێیان مەکەن، تا تەماعی لە خراپە نەکەن"!

بێگومان دەیەها ڕیوایاتی لەو جۆرە لە لای سونەش هەیە، کە تیایدا نەقس دەدەنە پاڵ ئافرەت چونکە نوێژ و ڕۆژوو ناکات لە کاتی حەیزدا، نازانن هەر قورئان و ئیسلام داوای لە ئافرەت کردوە لە کاتی حەیزدا ئەو عیبادەتانە نەکات، دەنا دەیکرد، کەوابوو بۆ دەبێتە نەقس؟! بۆ نەقسەکانیتریش هەر هەمان شت دەڵیین، کە هیچ شتی خۆکردە نین، بەڵکو خواکردەن!

٣ -لە وتارێکیدا بەرەهایی تاوانباری ئافرەت دەکات کە تەنها خەمێکیان لەو دنیایە هەبێت، خەمی خۆشی وجوانی ژیانە و فەسادی گێڕانە! ( ان البهائم همها بطونها، وان السباع همها العدوان على غيرها، وان النساء همهن زينة الحياة الدنيا و الفساد فيها) ص ٢١٥

[ئاژەڵان خەمیان پڕکردنی زگیانە، درندەی ئاژەلان خەمیان هەڵمەتکردنە سەر ئەوانیترە، ئافرەتانیش خەمیان خۆشی وجوانی ژیانە و فەسادی گێڕانە تیایدا!] ئەوە وتاری هەموو شارستانی ولایەن و دینێکە کە هەڵوێستی نێگەتیڤیان لە ئافرەت وەرگرتووە لە گریکەکانەوە بگرە تا هیندۆسەکان و بودایيەکان و مەسیحی و جولەکەکانیش، بەداخەوە ئیسلامیشی هاتە سەر.

## وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان[٧٣]

## ٣-٣

[ئاژەڵان خەمیان پڕکردنی زگیانە، درندەی ئاژەلان خەمیان هەلمەتکردنە سەر ئەوانیترە، ئافرەتانیش خەمیان خۆشی وجوانی ژیانە و فەسادی گێڕانە تیایدا!] ئەوە وتاری هەموو شارستانی ولایەن و دینێکە کە هەڵوێستی نێگەتیڤیان لە ئافرەت وەرگرتووە لە گریکەکانەوە بگرە تا هیندۆسەکان و بوداییەکان و مەسیحی و جولەکەکانیش، بەداخەوە ئیسلامیشی هاتە سەر!

٤ -لە وتاریکیدا کە ڕاشکاوانە ئاماژە بە حەزرەتی عائیشە دەکات و دەڵێت: (واما فلانه فادركها رأى النساء وضغن غلا فى صدرها كمرجل القين، ولودعيت لتنال من غيرى ما أتت الىَ لم تفعل، و لها بعد حرمتها الاولى والحساب على الله تعالى.) ص ٢١٨

[فولانە ئافرەت، ڕای ئافرەتانی کەوتە سەر و قینێکیش لە دڵیدا نێڵەی دەدا وەك کورەی ئاسنگەر، ئەگەر بانگ کرابا بۆ زیان گەیاندن بە کەسێکی تر، ئەوەی نەدەکرد، ڕیزی بەرایشی هێشتا هەر هەیە و حیسابیشی لەسەر خوایە]

مەبەستی لە فولانە عائیشەیە وەک ابن ابی الحدید معتزلی لە شەرحی نهج البلاغة دا دەڵێن " و فلانه كنايه عن ام المؤمنين عايشه ابوها ابوبكر. شرح نهج البلاغه ٩/١٩٠

لەو دەقەش سەرکۆنەی عائیشە دەکات بەوەی بێ عەقڵی ژنان یان کەم عەقڵی ونوقسانی لە خەیاڵیداوە! دەکرێت هەڵوێستی عائیشە لە عەلی لەبەر خودی عەلی و کۆنە قینی بێت لیی کاتێ هەرزانی کرد لای پێغەمبەر [د.خ] وگووتی تەڵاقی دە، بەڵام باوەڕ ناکەم هەڵوێستی حەزرەتی عەلی لە

---

(٧٣) ستاندەر، ٢٠١٥/٠٥/١٩ .

ئافرەت لەبەر عائیشە بوو بێت، بەڵکو لە بنچینەدا حەزرەتی عەلی وەك هەر تاکێکی تری ئەو کۆمەڵگا عەرەبیە لە ژێر کاریگەری داب ونەریت و بیروبۆچوونی باو بووە دەربارەی ئافرەت، تورەیەکەشی لەبەر ئەوە بووە کە هیچ پیاوێك لەو کۆمەڵگەیە چاوەڕوانی ژنێکی جەنگاوەری وەك عائیشەی نەکردوە کە پەروەردەی مالی پێغەمبەرایەتیش بێت!

٥- لە راسپاردەیەکی بۆ سوپاکەی بەر لەشەڕی صفین دەڵێت: (ولا تهیجوا النساء بأذى، وان شتمن اعراضكم، وسبن امراءكم، فانهن ضعيفات القوى والانفس و العقول..) ص ٣٧٣

لەو دەقەش دەڵێت: [ئافرەتان ئازار مەدەن، هەتا جوێنیان بە عەرزتان دا، و جوێنیان بە سەرکردەکانیشتان گووت، چونکە زەعیفەن لە ڕووی هیز و دەروون و عەقڵدا]

خۆی ئەوە فەزیڵەتە لە هەر کۆمەڵگایەك کە بە نەرمی هەڵسوکەوت بکەیت لەگەڵ ئافرەت، هەتا ئەگەر ئەوانیش هەڵچوون بە ڕووتدا، بەڵام نەك لەبەرئەوەی ناقیسی هێز وعەقڵ ودەروونن، بەڵکو دەتوانیت بڵییت هەست ناسکترن، یان لەبەر پایەی دایکایەتی و ئافرەت بوون، ڕێزێکی تایبەتیان هەبێت لە کۆمەڵ! وەك دەبینین حەزرەتی عەلی هیچ جیاوازیەکی نەبوە لە هەڵوێستی لە ئافرەت لەگەڵ هەر تاکێکی کۆمەڵگای عەرەبی ئەو کاتە، بەوپەڕی لاوازی و عەقڵ نوقسانیەوە دەیڕوانیە ئافرەت.

٦ -لە دەقیکیتردا کە ئەویش لە پاش شەڕی صفین وتراوە، و تورەییەکی زۆری پێوە دیارە، دەڵێت: (و إيّاك و مشاورة النّساء فإنّ رأيهنّ إلى أفن و عزمهنّ إلى وهن . و اكفف عليهنّ من أبصارهنّ بحجابك إيّاهنّ فإنّ شدّة الحجاب أبقى عليهنّ ، و ليس خروجهنّ بأشدّ من إدخالك من لا يوثق به عليهنّ ، و إن استطعت أن لا يعرفن غيرك فافعل . و لا تملّك المرأة من أمرها ما جاوز نفسها فإنّ المرأة ريحانة و ليست بقهرمانة ، و لا تعد بكرامتها نفسها ، و لا تطمعها في أن تشفع بغيرها . و إيّاك و التّغاير في غير موضع غيرة ، فإنّ ذلك يدعو الصّحيحة إلى السّقم و البريئة إلى الرّيب . و .... ) ص ٤٠٥

[ئاگادار بە نەکەی پروڕا بە ئافرەتان بکەیت، چونکە رایان نوقسانە،و عەزیمەتیان لاوازە، مەهێڵە بەرچاوان کەون، بیانشارەوە بە حیجاب کردنیان، چونکە تووندی لە حیجابکردنیان باشترە بۆ مانەوەیان! دەرچوونیشیان لە مالەوە خراپتر نییە لە هێنانە ماڵەوەی کەسێکی نا متمانەدار، ئەگەر توانێت نەهێڵی کەس بناسن باشترە، ئافرەت لە خۆی زیاتر کاروباری کەسیتری بەدەست نییە، چونکە ژن رێحانە نەك سەردار و کاری خەڵکیتر هەڵسوڕێنێت. لە کەرامەت و ڕێزی خۆی زیاتر تێنەپەڕێت، فێری ئەوەی مەکە کەسانێك بکاتە تکاکاری خۆی، ئاگاداربە غیرەش نەکەی لە کاتی ناپێویستدا، چونکە ئەوە کەسی ساغ بەرەو خراپی دەبات وبێ تاوان دەکاتە گومانلێکراو....]

دەقەکە خۆی دەدوێت و دەیەوێت بە توندترین شێوە مامەڵەی ئافرەت بکرێت، حیجابێکی توندی بەسەر سەپێنرێت، هەردەم ژێردەست بێت، نەك خاوەن هیچ شتێکی تر.

لە بەشی حیکمەتەکانی ئیمامی عەلی  لە نهج البلاغة دا هاتوە

دەڵێت: المرأة عقرب حلوة اللسبة. [ئافرەت دوپشکێکە پێوەدانی شیرینە] وەك دیارە ئافرەت بە دوپسکیکی ترسناك دەشوبهێنێت کە تەنانەت پێوەدانیشی بۆ خەڵك وا تەسویر کراوە کە شیرینە. نازانم حەزرەتی عەلی کە هێندە زانا بووە بە قورئان گوێی لەو ئایەتە نەبووە کە دەڵێت [والمؤمنون و المؤمنات بعضهم اولیاء بعض] یان [هن لباس لکم وانتم لباس لهن] سەرەرای فەرموودەی زۆر پۆزەتیڤی پێغەمبەر [د.خ] دەربارەی ئافرەت.

لەوەدەچێت حەزرەتی عەلی قاموسێکی پێچەوانەی بۆ سیفەتەکانی ئافرەت وپیاو هەبێت، لای ئەو هەر سیفەتێکی سروشتی پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ بێت، بۆ ئافرەت خراپە، وبۆ پیاو زۆر باشە! بۆ نمونە هەر لەو بەشە دەربارەی غیرەی ژنان وپیاوان دەڵێت: (غیرة المرأة کفر و غیرة الرجل ایمان) وەک دەبینیت هەتا یەکێ لە سەرەکیترین تایبەتمەندی ئافرەتان کە غیرە کردنە، و زانراوە کە ئافرەت زیاتریش لە پیاو غیرە دەکات، حەزرەتی عەلی

ئەو غیرەکردنە بە کوفر دەزانێت بۆ ئافرەت، کەچی هەمان ئەو غیرەیە کە جاروبار دەبێتە غیرەیەکی نەخۆشانە لای پیاو ئافرەتی پێوە ئەشکەنجەی دەروونی و جەستەیی دەدات، بە ئیمانی دەزانێت بۆ پیاو! هەر لەو سیفەتەش پێی وانیە، بەڵکو لە حیکمەتێکیتردا دەلیت:

"خیار خصال النساء شرار خصال الرجال، الزهو والجبن والبخل ،فاذا كانت المراة مزهوة لم تمكن من نفسها واذا كانت بخيلة حفظت مالها ومال بعلها واذا كانت جبانة فرقت من كل شيء يعرض لها ". ٥٠٩-٥١٠

[باشترین سیفاتی ئافرەتان، خراپترین سیفاتی پیاوانە، لوتبەرزی وبەخۆنازین، و ترسنۆکی و ڕەزیلی، ئەگەر ئافرەت لووتبەرز وبەخۆناز بوو خۆی ناداتە دەست، ئەگەر ڕەزیل بوو پارەوپولی خۆیی و مێردی دەپارێزێت، ئەگەریش ترسنۆك بوو لە هەموو شتێك دەترسێت کە تووشی دێت] بۆ دەبێت ئەو ڕەزیلی و ترسنۆکیە ئەوپەڕی عەیبوعار بێت بۆ پیاو کەچی چاکترین سیفاتی ئافرەت بێت؟!

سەیر لەوەدایە وتەیەکی زۆر ناودار هەیە لەسەر ئافرەت، من تا ساتی ئەو نووسینەش نەمزانیبوو کە وتەیەکی حەزرەتی عەلی یە بەپێی نهج البلاغة، کە دەلیت (المرأة شر كلها و شر ما فيها انه لابد منها(.

[ئافرەت هەمووی شەڕ و خراپەیە، خراپترین خراپیەکانی کە چارەمان نییە بێ ئەوان، یان خراپەیەکی پێویستە!] ئەو وتەیە سێبەرەکانی لەناو فەرهەنگی یۆنانی و بودایی و جولەکایەتی و مەسیحیەتیش دەدۆزیتەوە، هەتا بۆتە پەندیش لە زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزی Women are necessary evils :

ئەو نمونانەی هێنامان هەمووی لە نهج البلاغة دا هاتووە، بیروڕای نێگەتیڤیتریشی هەن لە سەرچاوەکانیتری شیعە

"كل امرئ تدبره امرأة فهو ملعون" [هەر کەسێك ئافرەت بەڕێوەی ببات مەلعونە [!

"عقول النساء في جمالهن " [عەقڵی ئافرەتان لە جوانیاندایە] و " النساء بذر الشر "[ئافرەتان تۆ وبنچینەی خراپەکارین[

"ان في خلافهن بركة" [لە پێچەوانەکردنیان بەرەکەت هەیە]

الصدوق ، من لا يحضره الفقيه، ج٣، ص٤٦٨ .

ئەوە کۆی ڕاکانی حەزرەتی عەلی یە دەربارەی ئافرەت کە وەك دەبینین زۆر نێگەتیڤن و وەك عەقاد لە عبقرية علي دا دەڵێت:

"بە گشتی، دەکرێت بوترێت کە بیروڕاکانی ئیمام [عەلی] دەربارەی ئافرەت بریتیە لە پوختەی هەموو حیکمەتە کۆن و دێرینەکان لە بارەی ئافرەت گووتراوە.

ئافرەت خراپە و شەڕێکی ناچارین بە کۆی بیروڕای بەراییەکان، چ حەکیمەکانی هیند بێت یان یۆنان یان ئەو حەکیمانەی تەماشای ئافرەتیان دەکرد بە چاوی دین لە بەنی ئیسڕائیل یان باوکانی کەنیسەی مەسیحی و ئیمامەکانی ئیسلام.!" ص ٢١٠ عبقرية علي

ببینە عەقاد چەند بلیمەتانە عەلی و [أئمة الاسلام] یش دەخاتە بەر کۆی بیروڕای دێرینەکان، لە حەکیمەکانی هیند و یۆنان و هەموو حەکیمە ئاینیەکانی بەنی ئیسڕائیل و باوکانی کەنیسەی مەسیحی کە لە ڕوانگەی دینەوە ئافرەتیان وەك شەڕێکی [لا بد منه] پێویست دەبینی.

## ئەرستۆ وەك دامەزرێنەری فەلسەفەی چەوسانەوە و نزمیتی ئافرەتان(٧٤)

بیرپوراکانی ئەرستۆ زۆر قوول چۆتە ناو فەرهەنگی ئایینی جولەکەو مەسیحی و هەتا ئیسلامیش بە شیعی و سونیەوە. ئەو بیروڕایانەی بە دەگمەن نەبێت فەیلەسوف و زانای ئایینی و شاعیرو ئەدیبێک لە دەستیان ڕزگاریان نەبووە، بەڵکو ئەو تیۆرە باڵادەست بوو لە فیکری خۆرئاواییش بۆ ماوەیەکی زۆر، تا ئێستاش لەسەر ئاستی گەلێری بەردەوامە. من خۆم کاتێ بیروڕاکانی زانایانی حەدیس و تەفسیرو فیقە دەخوێنمەوە هەست بە کاریگەری فەلسەفەی ئەرستۆ دەکەم بەسەر زانا ئیسلامیەکان کە لەڕێی بڵاوبونوەوەی ئەو بیروباوەڕانە لە نێو عەرەبی پێش ئیسلام و دوایش لە ڕێی وەرگێڕان و سەرچاوەکانی ئەهلی کیتابەکان دزەیان کردە ناو کایەکانی فیکری ئیسلامی.

هەمووومان دەزانین کە لە فەرمودە جۆرێك هەیە بەناوی ئیسرائیلیات کە بریتین لەو حەدیسانەی زانایانی جولەکە پاش موسڵمان بوونیان بەرگی ئیسلامیان بەبەر کرد، هەندێکیان ئاشکرا کران، بەڵام زۆریشیان دزەیان کردە ناو حەدیسەکان بێ ئەوەی کەس هەستیان پێ بکات. بە هەمان شێوە کاریگەر مەسیحیەتیش هەر هەبوو تا ڕادەیەك بەسەر حەدیس لە ڕێگای سەحابەکانی کە لە پێشوودا مەسیحی بوون .

گرنگترین تێروانینی ئەرستۆ دەربارەی ئافرەت ئەوانەن:

- سروشت بەرپرسیارە لە بەهرەدارکردنی نێر [پیاو] بە پێویستیەکانی حاکمێتی و فەرمانڕەوایەتی، پێدانی پێویستیەکانی مەحکوم و بەرفەرمانیەتی بە مێ [ئافرەت]. واتە پەیوەندی ژن و مێرد وەك پەیوەندی حاکم و مەحکومە. ئەوەش قەدەرو چارەنووسە و، حالەتێکی سروشتییە، وەك پەیوەندی [کۆیلەدار بە کۆیلە]، ئافرەتان بە سروشت نزمترن لە پیاو،

(٧٤) ستاندەر، ٢٠١٥/٠٥/٢٢ .

ئەرکیان خزمەتکردنی پیاوانە، بۆیە ئاساییە کە پیاوە حوکمیان بکات، ئەو هەموو ئەرک و بارودۆخ و پێگە و پایانەش بە سروشتە نەك بە داب و نەریت.

ئەرستۆ دەڵێت:"پێکهاتەی جەستەیی بڕیار دەدات کە سەرۆکایەتی و باڵادەستی بۆ پیاوە، گوێرایەڵیش بۆ ئافرەت و کۆیلەیە".

- ئەرک و فەرمانی یەکەمینی مێ مناڵ بوونە، بۆ پاراستنی تۆرەمەو نەوەکان دروستکراوە، ئەوەش هۆی سەرەکی بوونییتی. مێ بوونەوەرێکە بە تایبەتمەندی نزمێتی و نێگەتیڤی، لەکاتێکدا نێر تایبەتمەندی بەرزێتی و پۆزەتیڤی هەیە، دەبێت مێ ملکەچی حوکم و فەرمانی پیاو بێت کە سروشت بەهرەداری کردوە بۆ ئەو ئەرکە. پیاو لەسەریەتی بیربکاتەوەو بڕیاربدات و بەڵگە بهێنێتەوە، بەڵام مێ تەنها دەفرێکە [وعاء] بۆ ئەوە.

- جیاوازییەکی بایۆلۆژی هەیە لە نێوان نێرو مێ، وادەکات کە بڕی گەرمایی لە خوێنی پیاو زیاتر بکات لە خوێنی ئافرەت، ئەو زیادەیەش پەیوەندی هەیە بە زیادی هێزی دەروونی پیاوەکە، لە ئەنجامدا پیاو لەسەر ئافرەت زاڵە لە ڕووی هێزی بلیمەتیە دەروونییەکان.

- ئافرەت لە پیاو کەمترە لە ڕووی عەقڵ و زیرەکیدا، لە بواری بەها و ڕەوشتیشەوە، ڕەوشتی تایبەت بەخۆیەوە هەیە، کە جیاوازی لە ڕەوشت و بەهای پیاو، وەك ئەنجام زاڵبوونی پیاو بەسەر ئافرەت بابەتێکی زۆر ئاساییە.

- مرۆڤ لایەنی عەقڵی و نا عەقڵی تێدایە، لە پیاودا لایەنی عەقڵی زاڵە، بەڵام لای ئافرەت لایەنی نا عەقلانی زاڵە، ئەوەش بڕیاری سروشتە.

- ژنی چاك دەبێت دەست بە خەرجیەکانی ماڵدا بگرێت، هەڵەخەرجی نەکات لە بایەخدان بەشتی جوانکاری و ڕازاندنەوە، پێویستە هەموو داواکاریەکانی پیاو جێبەجێ بکات وەك یاساگەلێك خودا سەپاندبێتی. [ ارسطو والمرأة، امام عبدالفتاح ]

ئەو بیرروباوەڕانە دەتوانم سەدان نمونەی بۆ بهێنمەوە لە ئایینی جولەکەو قسەکانی باوکانی مەسیحیەت، بەڵکو دزەی کردۆتە ناو ئینجیلەکانیش. هەمان ئەو بیروڕایانە لە هەموو تەفسیرەکانی قورئان بەدیدەکرێت هەتا لە تەفسیرە نوێکانیش، هەروەها لە حەدیس و فیقهو هەموو زانستەکانی پەیوەست بە ئایین. لەسەر ئاستی خەڵکیش هێندەی ئەو بیروڕایانە لەسەر مینبەرەکان و لە بەرنامە دینیەکان بگوترێتەوە، زۆر خراپ بەناو خەڵکی ئاساییش بڵاوبۆتەوە، بۆیە سەرەڕای ئەوەی ئەرستۆ مەزنترین فەیلەسوفی مێژووە، بەڵام بەڕای من دامەزرێنەری فەلسەفەی چەوساندنەوەی ئافرەتیشە، چونکە کەس بەرلەو بەو شێوەیە سیستماتیکە عەقڵیە بیناغەی چەوساندنەوەو بە نزم سەیر کردنی ئافرەتی دانەناوە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەرستۆ دوو جار ژنی هێناوە، لە هەردوو جاریشدا زۆر بەختەوەر بووە لە ژیانی خێزانی، وەسیەتیشی کردوە لە تەك ژنی یەکەمی بنێژرێت، کچەکانی زۆر خۆش ویستوە.

# ناوەڕۆك

## ١- پیرۆسترۆیکای سەلەفییەت



## ٢- نا بۆ بە سعودی کردنی ئافرەتانمان



# تەوەری سێیەم: حیجاب

## ١- حیجاب یەکەمینی یەکەمەکانە



## ٢- وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعیەکان

## نووسەر لە چەند دێرێك:
## محەممەد هەریری



★ محەمەد یوسف لە ساڵی ١٩٦٦ لە هەولێر دایکبووە. لە بواری نوسیندا بە "محەمەد هەریری" ناودێر کراوە. کۆلیژی ئادابی بەشی ئینگلیزی لەزانکوی سەلاحەدین تەواو کردوەو، لە ساڵی ٢٠٠٦ لە وڵاتی بەریتانیا ماستەری لە لە وەرگێڕانی زمانی ئینگلیزی بەدەست هێناوە.

★ لە کۆتایی هەشتاکانەوە دەنوسێت لەسەر بابەتی سیاسی و دینی و فیکری و کۆمەڵایەتی.

★ لەساڵی ١٩٩٥ کۆچی هەندەرانی کردوەو لە بەریتانیا نیشتەجێ بووە. سەرنوسەری روژنامەیەکی کوردی و گوڤارێکی عەرەبی بووە، بە کوردی و عەرەبی و جاروبار ئینگلیزیش دەنووسێت.

بە بەردەوامە لەنوسین لە رۆژنامەو ماڵپەرە کوردی و عەرەبیەکان، وەك نوسەرێکی کوردی سەربەخۆ خاوەن رای تایبەتی خۆیەتی لەسەر زۆربەی ئەو کێشانەی لە گۆڕەپانی کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا روو دەدات.

★ سەرەکیترین بواری نووسینی دەربارەی توندڕەوی دینییە لە کوردستان و جیهانی ئیسلامیدا بە گشتی، لەو بوارەدا سەدان وتاری بڵاوکراوەی هەیە. توندڕەوی دینی بە تایبەتی سەلەفیزم بە هەموو فۆرمەکانیەوە. بەڕای نووسەر خوێندنەوەیەك و فکرێکی نامۆیە بە سروشتی دینداری کوردی، ڕاستە لە کۆنەوە کەمێك چەمکەکانی لە ڕێگای مەزهەبی شافیعیەوە هاتۆتە ناو کورد، بەڵام وەك ئەو لێشاوە سەلەفیەتە نەبووە کە جێگای مەترسی

جیدی بێت لەسەر ڕووحیەتی دینداری کوردی. نووسەر پێی وایە دەبێت کورد ڕزگاری بێت لە هەموو فۆرمە ئیسلامە نامۆکانی عەرەبی و غەیری عەرەبی، خاوەن دیدو خوێندنەوەو فۆرمی تایبەتی خۆی بێت.

★ هەروەها لە بواری ڕەخنەی سیاسیش دەنووسێت، بە تایبەتی لەسەر ئەزموونی دەسەڵاتی کوردی. نوسەر خەبات لە پێناو بەرقەرابوونی دیموکراتیەت و مافەکانی مرۆڤ لە کوردستانی باشووردا دەکات، کە پێی وایە هەنگاوێك لە پێش بەشەکانی تری کوردستانە ودەبێت خەباتیشی جیاواز بێت لە بەشەکانیتر. لە کاتێکدا بەشەکانیتر هێشتا لە قۆناغی خەباتی ڕزگاریخوازیدان، کوردستانی باشوور تا رادەیەکی زۆر ئەو قۆناغەی تێپەڕاندوە.

## بەرهەمەکانی:

١- داعش کێیە و مەشروعیەتی لە کام سەرچاوە وەردەگرێت.
٢- ئەدیب و گزیری پۆلیس کێشەی ئەدەب وسیاسەت لە وڵاتە سۆشیالیستەکـان ... وەرگێران.
٣- خوێندنەوەیەك لە کتێبی ئەو (حەسەن بەنا) یەی کە کەس نایناسێت.
٤-ئافرەت لە نێوان سەرەڕۆیی فێمینیزم و توندڕەوی ئاینیدا.

hariri٦٦@yahoo.com

توندرەوی ئاینی و سەرەرۆیی فێمنیستی • محمد هەریری

چیرۆکی توندڕەوەکان لەگەڵ ئافرەتدا زۆر سەیرە، جاروبار پێکەنین هێنەرە، جاروباریش خەم وپێکەنین بەیەکەوە کۆدەکاتەوە. دژایەتی ئەو توندڕەوانە بەناوی ئیسلام بۆ ڕەگەزی مێ شورەییەکە و گەورەترین خیانەتە بە ئیسلام دەیکەن وەك شێخ محەمەدی غەزالی دەفەرموێت.
نەیاری بە ئافرەت ڕەگی هێندە قوڵە لە ناو سەرچاوەکانی ئیسلامدا وەك حەدیس ومەسایلی فیقە وتەفسیر، دەگاتە ڕادەی سوکایەتی وابزانم زۆرمان خوارد لەو نوسینانەی کە سەرتاسەری گوڵباران کردنی هەڵوێستەکانی ئیسلامە بەرامبەر ئافرەت، کەچی لە واقیعدا وێنەکە زۆر دوورە لەو هیوایە سەوز وپەمەییانەی هەندێك لە نوسەران لەسەر کاغەز دەینەخشێنن!
ڕاستە لە کوردستان ورۆژهەلات بە گشتی ئافرەت جەور وستەمێکی زۆری لێدەکرێت، کەس ناتوانێت نکولی لێبکات، ولەم بوارەدا دەیان نوسین وهەوڵم هەبوە بۆ بەرچاو رونکردنەوەی دەوروبەرم، لابردنی ئەو ستەمانە، بەڵام فێمنستەکان لە ژێر کاریگەری فێمینزمی خۆرئاوایی بۆ ڕوبەڕوو بوونەوەی ئەو جەور وستەمانە بە هەمان بیر و ئامرازی ئەوان، و لەبەر نە شارەزاییان لە دواندنی کۆمەڵگای کوردی سەرکەوتوو نەبوون. ئەو دۆزە گرنگە پێویستی بە ئافرەتانێك هەیە پەنجە بخەنە سەر زامە هەقیقیەکان، نەك لە یەکەم وشەدا بڵێن دەبێت ئافرەت ئازاد بێت لە بەکارهێنانی جەستەی، چۆنی بەکار دەهێنێت هەقی خۆیەتی!! بۆ چما لە کلتوری ئێمە ودەوروبەرمان ولەو ولاتانەی ئێمە، پیاویش خاوەنی ڕەهای لاشەی خۆیەتی تا ئافرەت خاوەنی بێت؟!

ستاندەر STANDARD
دەزگای راگەیاندنی ستاندەر 2015
www.skurd.net info@skurd.net